# له پشت پەردەکانی شۆڕشەوە

## دانپێدانانەکانی جەعفەری شەفیعزادە

فەرماندەی پێشووی یەکەی تایبەتی شۆڕشی ئیسلامی ئێران و پاسەوانی تایبەتی ئایەتولاّ خومەینی لە نوفل لۆشاتۆ و تەهران

وەرگێڕانی: ئاکام حمە امین محمود

# له پشت پەردەکانی شۆڕشەوە


- نووسینی: جەعفەری شەفیعزادە
- وەرگێڕانی: ئاکام حمە امین محمود
- بەرگ: ئیبراهیم ساڵح
- چاپخانە: تاران
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٥٥٧)ی ساڵی ٢٠٢٠ ی کتێبخانە گشتیەکانی سلێمانی پێدراوە
- نۆبەو ساڵی چاپ: یەکەم – ٢٠٢٠
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە




## پێشەکی

لەسەروبەندی شۆڕشی گەلانی ئێران ، لە مانگی شوبات ی ساڵی ١٩٧٩ز ئایەتوڵا خومەینی ڕابەری شۆڕشی ئیسلامی ئێران ، دوای چوارده ساڵ دورخستنەوەی لە نیشتیمانەکەی گەڕایەوە ئێران ، لە تەهرانی پایتەخت، لەلایەن نزیك بە سێ ملیۆن کەس پێشوازی لێکرا ، کاتی گەڕانەوەکەی لە ڕۆژمێری سەرەکی ئێران، بە دەستپێکی دەیەی فەجر ناسێنرا .

سەرەتا بڕیار بوو خومەینی لە ٦ ی بەهەمەن بگەڕێتەوە بۆ ئێران ، بەڵام دکتۆر شاهپوری بەختیار سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی ڕژێمی شاهنشاهی داخستنی فڕۆکەخانەکانی ڕاگەیاند ، ئەمەش بووە هۆی فراوانتر بوونی ناڕەزایەکان ، خومەینی لە پاریس بەیاننامەیەکی بۆ خۆپیشاندەران بڵاوکردوە و گووتی : (( هەرکە فڕۆکەخانەکان کرانەوە بە یەکەمین فڕین دەگەڕێمەوە بۆ ئێران )) دواتر خەڵکی بانگهێشت کرد بۆ بەردەوامی دان بە خۆپیشاندان و مانگرت ، دوای سێ ڕۆژ شاهپوری بەختیار لە ژێر گوشاری خۆپیشاندەراندا ناچار بە کردنەوەی فڕۆکەخانەکان کرا .

لە بەرواری ١٢ بەهمەنی ساڵی ١٩٧٩ ئەبو الحسن بنی صدر فڕۆکەیەکی کۆمپانیای ئێر فرانسی بەکرێ گرت و صادق قطب زادە و ئیراهیم یەزدی لەم سەفەرەدا هاوڕێ یەتی خومەینیان کرد . کاژێر ٣٠ : ٢٧ : ٠٩ خولەکی سەر لەبەیانی ڕۆژی ١٢ ی بەهەمەن فڕۆکەکەی ئێرفرانس لە فڕۆکەخانەی مهرئابادی تەهران نیشتەوە .

ئایەتوڵا خومەینی لەگەڵ چەند سیاسەتمەدارێکی شۆڕشگێڕ و هەندێ بەرپرسی ئەمریکی و کۆمەڵێك لە پارتیزانی ڕاهێنراو و بنەماڵەکەی و

چەند ڕۆژنامەنوسێك گەڕایەوە بۆ ئێران، ئەو کەسانەی هاوڕێیەتیان دەکرد ئەمانە بوو .

١- ئەبو الحسن بنی صدر
٢- صادق قطب زادە
٣- ئیبراهیم یەزدی
٤- حەسەن ئیبراهیم حەبیبی
٥- حەسەن لاهوتی
٦- ئەحمەد غضنفرپور
٧- تەقی ئیبتکار
٨- محسن سازگارا
٩- محەمەد منتظری کوڕی حسێنعلی منتظری
١٠- مرتضی مطهری
١١- خانم دوریان مەکگرەی
١٢- ژیرارد فابین باتاوش (Gerard Jean Fabian- Bataouche) پاسەوانی خومەینی لە نوفل لوشاتۆ

ئەم سەفەرە بە فڕۆکەی بۆینگ ٧٤٧ ی کۆمپانیای ئێرفرانس ئەنجام درا فڕۆکەوانی یەکەم ناوی ( ژان موءی) و یاریدەدەری فڕۆکەوان ( باتاوش ) بوو .

دواتر ئیمام خومەینی لە گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا لە بەشی حەفدەیەم وتارێکی بۆ نزیکەی دوو ملیۆن خۆپیشاندەری ناڕازی خوێندەوە گوتی :

(( من دەبێت پێتان ڕاگەینم ، محەمەد ڕەزا پەهلەوی خائین و پیس ڕۆشت و هەڵهات ، هەموو شتێکی ئێمەی بە بادا ولأتەکەی ئێمەی کاولکرد ، گۆڕستانەکانی ئێمەی ئاوا کرد ، مەملەکەتەکەی ئێمەی لەڕووی ئابورییەوە داڕماندوە و لەناوی بردووە ، ئەگەر ئێمە بمانەوێت ئەم بارە ئابوریە بگەڕێنینەوە بۆ دۆخی سەرەتا، ساڵانێکی دور و درێژ دەخایەنێت . نە دەوڵەت بەتەنها دەتوانێت ئەم کارە بکات نە تاکەکانی کۆمەڵگا بەتەنها دەتوانن ، دەبێت هەمووان هیمەت بکەین ، هەتا خەڵك دەست نەدەنە دەستی یەکتر ناتوانرێت ئەم دۆخە نالەبارە ئابووریە ڕاست بکەینەوە ، من دەوڵەت دادەمەزرێنم ، من ئەکێشم بەناو دەمی ئەم دەوڵەتەدا ، من دەوڵەت دادەمەزرێنم ، من بە پشتیوانی ئەم میللەتە دەوڵەت دادەمەزرێنم ، بە پشتگیری ئەم میللەتە کە ئێمەیان قەبوڵە.

ئەم بەڕێز بەختیارە کە نە خۆی خۆی قەبوڵە و نە دۆستەکانی قەبوڵیانە نە میللەتیش قەبوڵیەتی و نە سوپا ، تەنها ئەمریکا پشتیوانی دەکات و ناردویەتی ، فەرمانی بە سوپا کردوە کە پشتیوانی لێبکەن بەریتانیاش پشتیوانی لێدەکات و گوتویەتی دەبێت پشتگیری بکەن.

هەتا ئێمە هەین ناهێڵن ئەمانە دەستەڵات پەیدابکەن . ئێمە ڕێگا نادەین ئەو زوڵم و ستەمەی پێشوو دوبارە ببێتەوە، ئێمە ڕێگا نادەین محەمەد ڕەزا بگەڕێتەوە ، ئەوان دەیانەوێت بگەڕێتەوە، بێداربن خەریکی پلانگێڕانن ، وە دەبێت ئامۆژگاریەکی سوپا بکەم و سوپاسێکی یەك بەیەکی ئەندامانی سوپا بکەم ، بەڵام ئەو ئامۆژگاریەی من دەمەوێت بیکەم ئەوەیە ئێمە دەمانەوێت ئێوە سەربەخۆبن ، ئێمە خەریکین ڕەنج ئەکێشین و خوێن دەبەخشین، ئێمە گەنجانمان فیداکردووە ، ئێمە ئابڕو حەیامان هەیە.

ڕیش سپیەکانمان زیندانی کراون و ئازار دراون دەمانەوێت سوپاکەمان سەربەخۆبێت. بەڕێز ژەنراڵ تۆ ناتەوێت؟ بەڕێز عەمید ئێوە ناتانەوێت سەربەخۆبن؟ دەتانەوێت کۆیلەبن ؟ من ئامۆژگاری ئێوە دەکەم وەرنە باوەشی میللەتەوە ئەوەی میللەت دەیڵێت ئێوەش بیڵێن، ئێمە دەبێت سەربەخۆ بین، میللەت دەڵێت دەبێت سوپا سەربەخۆبێت.

نابێت لە ژێر فەرمانی ڕاوێژکارە ئەمریکی و بیانەیەکاندا بن ، سوپاسی ئەو یەکانەی سوپا دەکەم کە پەیوەندیان بە میللەتەوە کردوە و ئابڕووی خۆیان و وولاتەکەیان و میللەتەکەیان پاراستووە . پلەدارەکان ، فڕۆکەوانەکان و ئەفسەرەکانی هێزی ئاسمانی ئەمانە هەموویان شایەنی سوپاس و پێداهەڵگوتنن ، بەوانەش کە پەیوەندیان نەکردووە دەڵێم وەرنە ناومان ئیسلام لە کوفر باشترە بۆ ئێوە ، بۆ ئێوە میللەت باشترە لە بێگانە ، ئێمە ئەم مەبەستانە لەبەر ئێوە دەڵێین ئێوەش بۆ خۆتان ئەنجامی بدەن ، واز لەو ڕێگایە بهێنن وابیر نەکەنەوە ئەگەر واز لەو ڕێگایە بهێنن ئێمە دێین و لە سێدارەتان دەدەین ئەمە ئەو شتانەیە کە ئێوە یان کەسانی تر هەڵیانبەستووە ))

سەرئەنجام لە ٢٢ بەهەمەنی ساڵی ١٩٧٩ ئەنجومەنی باڵای سوپا لەڕێگەی ڕۆژنامەی کیهان بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە .

دەقی بەیاننامەکەی سوپا ((بەئاگادار بوون لە گۆڕانکاریەکانی ئەم داویانەی وولات ئەنجومەنی باڵای سوپا لە کاژێر ٣٠ : ١٠ خولەکی سەرلە بەیانی ڕۆژی یەکشەمەی ٢٢ بەهەمەنی ساڵی ١٩٧٩ بۆ ڕێگرتن لە خوێن ڕشتن و ئاژاوە و پشێوی بڕیاری دا بێلایەنی خۆی لە کێشە و ململانێ سیاسیەکان

ڕابگەیەنێت، وە فەرمانەکە نێردراوە بۆ هەموو یەکەکانی سوپا . سوپای ئێران پشتیوانی میللەتی بەشەرەف و نەجیب و نشتیمان پەرەستی ئێران بووە و دەبێت. بەتەواوی تواناو هێزیەوە پشتیوانی لە خواستەکانی میللەتی شەریفی ئێران دەکات )).

| سەرۆك وەزیران: ئەندازیار مەهدی بازرگان | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| وەزیرەکان | | | | | |
| ڕ | وەزیر | وەزارەت خانە | ڕ | وەزیر | وەزارەت خانە |
| ١ | شکوهی و ڕەجایی | پەروەردەو فێرکردن | ١٠ | یوسف طاهری | ڕێگاوبان |
| ٢ | محمد حسن ئیسلامی | پۆستە | ١١ | محمود ئەحمەد زادە | پیشەسازی و کانزاکان |
| ٣ | ئەردەلان + بنی صدر | دارایی | ١٢ | عەلی شەریعەتمەداری | خوێندنی باڵا |
| ٤ | سنجابی + یەزدی | کاروباری دەرەوە | ١٣ | داریوش فروهەر | کار |
| ٥ | ڕەزا صدر | بازرگانی | ١٤ | حاج سەید جواد و صباغیان | وەزیری دەوڵەت |
| ٦ | کاظم سامی | تەندروستی | ١٥ | مستەفا کتیرایی | نیشتەجێکردن |
| ٧ | ناصر میناچی | کشتوکاڵ | ١٦ | علی ئەکبەر معین فەر | نەوت |
| ٨ | د. علی محمد ئەیزدی | ڕێنمایی | ١٧ | عەباس تاج کاشانی | وزە |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٩ | مبشیر و حاج سەید جواد | داد | ١٨ | مەدەنی و ریاحی و چەمران | بەرگری |

## جێگرەکانی سەرۆك وەزیران

| ڕ | جێگر | کاروبار | ڕ | جێگر | کاروبار |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | یەدولا سەحابی | وەزیر و ڕاوێژکار | ٣ | عەباس سەمیمی | کاروباری ژینگە |
| ٢ | عزت الله سەحابی | پلاندانان و بوجە | ٤ | حسێن شاحسێنی | وەرزش و لاوان |

دوای یەك ساڵ لە ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی ڕژێمی کۆماری لە وولاتدا ڕاگەیەنراو هەڵبژاردنی سەرۆککۆمار بە بەشداری زیاترلە ( ١٤,١٤٦,٦٢٢ ) دەنگدەر لەناوەوە و دەرەوەی وولات لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨٠ بە دەست لەکارکێشانەوەی حکومەتە کاتیەکەی مەهدی بازرگان ئەنجام درا .

نزیکەی ١٢٤ کەس خۆیان بۆ سەرۆکایەتی کۆمار هەڵبژارد ، بەلآم زۆرێك لەو کاندیدانە چەند ڕۆژێك پێش هەڵبژاردن کشانەوە و لە کۆتایدا ٩٤ کەس بۆ ململانێ مانەوە ، دوو کەس لە کاندیدەکان دور خرانەوە ئەوانیش ؛ مسعود ڕەجەوی ، کاریگەرترین و ناودارترین کاندید سەربە پارتی مجاهدینی خلق بە پێداگیری خومەینی لە هەڵبژاردنەکان دورخرایەوە، تەنها لەبەر ئەوەی دەنگی بە دەستوری وولات نەداوە .

ئەوی تریان جلالەدین فارسی پاڵێوراوی پارتی جمهوری ئیسلامی، لەبەرئەو دەنگۆیانەی بڵاو بوویەوە کە ئەم کەسە بەڕەچەڵەك ئێرانی نییە ، چونکە باوکی خەڵکی شاری هیراتی ئەفغانستانە کۆچی کردووە بۆ ئێران لە خۆ کاندیدکرن دورخرایەوە.

سەرەڕای ئەو هەموو کاندیدە تەنها هەشت کاندید لە کێبەرکێ ی تونددا بوون ، بەڵام لە کۆتایدا ئەبو الحسن بنی صدر پلەی یەکەمی گرت و بووبە یەکەمین سەرۆککۆماری مێژووی ئێران دوای ڕژێمی پاشایەتی .

ڕێژەی دەنگەکانی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار بەم شێوەیە بوو .

| ڕ | ناوی کاندید | لایەنی سیاسی | ژمارەی دەنگ | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئەبو الحسن بنی صدر | جامعەی روحانیت مبارز | ١٠ ، ٧٠٩ ، ٣٣٠ | ٧٦.٥ ٪ |
| ٢ | سەید ئەحمەد مەدەنی | جەبهەی میللی | ٢ ، ٢٢٤ ، ٥٥٤ | ١٥.٩ ٪ |
| ٣ | حەسەن حەبیبی | جمهوری اسلامی و نهضت ئازادی | ٦٧٤ ، ٨٥٩ | ٤.٨ ٪ |
| ٤ | داریوش فروهەر | پارتی میللەت | ١٣٣ ، ٤٧٨ | ٠,٩ ٪ |
| ٥ | صادق طباطبایی | بێ لایەن | ١١٤ ، ٧٧٦ | ٠,٨ ٪ |
| ٦ | کاظم سامی | جاما (جنبش انقلابی مردم ایران ) | ٨٩ ، ٢٢٠ | ٠,٦ ٪ |
| ٧ | صادقی قطب زادە | پان ایرانیست | ٤٨ ، ٥٤٧ | ٠,٣ ٪ |
| ٨ | محەممەد موکری | بێ لایەن | ٢٩٩ | |
| ٩ | ئەوانی تر | | ٢١١٠ | |

دوابـەدوای هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی کۆمـار، هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی بـە دووخول ئەنجام درا.

لەم هەڵبژاردنەدا سێ پارتی سەرەکی لە ململانێدابوون وەك ؛

- پارتی جمهوری ئیسلامی ، بە ڕابەرایەتی ئایەتوڵا محەمەد بەهەشتی .

- پارتی نهضت ی ئازادی ئێران ، بە ڕابەرایەتی ئەندازیار مەهدی بازرگان .

- پارتی مجاهدین ی خلق ی ئێران ، بە ڕابەرایەتی مەسعود ڕەجەوی .

بەپێ ی ئامارە فەرمیەکان ڕێژەی بەشداریکردنی دەنگدەر ٥٢,١٤٪ نزیکـەی ٣٩١ ، ٨٥٧ ،٢٠ کەس مافی دەنگدانیان هەبوو ، بـەڵام تـەنها ٩٦٩ ،٨٥٧ ،١٠ کـەس بەشـداری دەنگـدانیان کـرد ، ٤٢٨ پـاڵیورا کێبـەڕکێیان دەکـرد بـۆ بەدەسـت هێنانی ٢٧٠ کورسی پەرلەمان.

لەم هەڵبژاردنەدا لە خولی یەکەم پارتەکـەی بەهەشـتی بـراوەی یەکـەم بـوو. ڕێژەی کورسیەکانیش بەم شێوەیە بوو ؛

- پارتی جمهوری ئیسلامی ؛ ٣٦,٣٢ ٪ ی دەنگەکان واتە ٨٥ کورسی

- نوسینگەی هەماهـەنگی و هاوکـاری کردنـی خـەڵکی لەگـەڵ سـەرۆککۆمار ؛ ئەبو الحسن بنی صدر؛ ١، ١٤٪ ی دەنگەکان واتە ٣٣ کورسی

- پارتی نهضت ی ئازادی ؛ ٥٤ ، ٨ ٪ ی دەنگەکان واتە ٢٠ کورسی

بەهۆی ساختە کاریەوە دەنگی نزیکەی ٣٦ کورسی پوچەڵکرانەوە

لەبەر ئەوەی دەستوری وولآت تازە دادەنـرا ، گروپێـك لـە وەزارەتـی دەوڵەت بە سەرۆكایەتی هاشمی صباغیان سـەرگەرمی ڕێكخسـتن و هەمواركردنـەوەی یاسای هەڵبژاردن بوون یاساكە لە شورای شـۆڕش دەنگـی لەسـەر درا و لـە ١٨ بەهمـەنی سـاڵی ١٩٨٠ بلآوكرایـەوە ، دواتـر دوابـەداوی چـەند نارەزاییـەك و تـرس لـە دواكـەوتنی هەڵبژاردنـەكان، بەنـدی هەڵبـژاردنی بازنـەیی لادرا و بەندێكی تر كە ڕای زۆرینەی لەسەر بوو جێگەی گرتـەوە وە لـە ئاكامـدا بـۆ خولی دووەمـی هەڵبژاردنـەكان دەنگـەكان بـەم شـێوەیە گۆڕانكـاری بەسـەردا هات .

— هاوپەیمانێتی فراوان :- پێكهاتبوو لە ( جامعە روحانیت مبارز ، پارتی جمهوری ئیسلامی ، ڕێكخراوی مجاهیدینی شورشی ئیسلامی ، ئەنجومەنی ئیسلامی مامۆستایان ، نهضتی ئافرەتانی مسولمان ، ڕێكخراوی فەجری ئیسلامی ، یەكێتی ئەنجومەنەكانی ئیسلامی شاری رەیی و بنیاد الهادی ) : ٣١ ٪ دەنگەكان

— گروپی هاوناو : - پارتی نهضت ئازادی : ٧ ٪ ی دەنگەكان

— نویسنگەی هەماهەنگی و هاوكاری كردنی خەڵكی لەگەڵ سەرۆككۆمار : ئەبو الحسن بنی صدر ١٢ ٪ ی دەنگەكان .

— جبهەی میللی ئێران: ٣ ٪ ی دەنگەكان .

— پارتی تودە : ٤ ٪ ی دەنگەكان

ـ شورای ناوەندی كاندیدەكانی شۆڕش و پێشكەوتن خواز { مجاهیدین ی خەلق } بەڕابەرایەتی مسعود ڕەجەوی، لەشاری تەهران نزیكەی ٥٣٠ هەزار

دەنگی بەدەست هێنان و ٢٩ کاندیدی تری مجاهیدین لەشارەکانی دیکە گەیشتنە قۆناغی دووەم ، بەلاّم هیچ یەکێکیان لەم دەورەیەدا دەنگی پێویستیان نەهێناو بە بێ نوێنەر مانەوە

ــ سەربەخۆکان : ٤٣ ٪ نزیکەی دوو لەسەر سێ ی ئەم کاندیدانە نزیک بوون لە فراکسیۆنە مەزهەبیەکان .

وەرگێڕ

## پێشەكی

بۆیەكەمجار لە ڕۆژەكانی سەرەتایی شۆڕش جەعفەری شەفیعزادەم لە تەهران بینی وەك ؛ هەموو هاوكارەكانی زۆر بەهێز و بە گوڕ بوو ، لەگەڵ ژێر دەستەكانی خۆی بەبێ مۆڵەتی دادگا هاتبوون بۆ دەستگیر كردنی من و دەست بەسەرداگرتنی موڵك وماڵەكەم.

سەركەتووبوو لە دەستگیركردن و خستنە زیندانم و دەست بەسەرداگرتنی موڵك و ماڵەكەم، ئەو ماڵ و موڵكەی بەرهەمی تەمەنێك ماندووبوون و هەوڵ و كۆششی خۆم و خێزانەكەم بوو هەمووی بەناوی دەستكەوتەوە بەتالآن بردرا.

لە ڕاستیدا ئاوارەیی ئێستایی من و خێزانەكەم و هەموو ئەو بەلآو ناڕەحەتیانەی لەم سالآنەی دوایدا بەسەرماندا هات، بەرهەمی ئەو دەست بەسەرداگرتنەو ماڵ زەوتكردنەی ئەو بوو. دوای ئەوەی بە كەفالەت و زەمانەتێكی زۆر قورس لەزیندان ئازاد كرام ، سەرەتا خۆم و دواتر ئەندامانی خێزانەكەم بۆ دەرەوەی وولآت هەڵهاتین و خۆمان گەیاندە هەندەران ، سالآنێكی زۆری خایاند هەتا توانیمان بە هەل و مەرجی سەختی ئاوارەی و غەریبی ڕابێین ، بەلآم هیوای تۆڵەسەندنەوە لە تەواوی ئەو كەسانەی كەبونە هۆكاری ڕۆژانی سەختی ئاوارەی و چارە ڕەشی خۆم و بنەماڵەكەم ، ناچاری كردین دان بە خۆدا بگرین لە گەڵ ناخۆشیەكانی غەریبی و دوركەوتنەوە لە وولآت هەڵبكەین.

پێنج ساڵ لەمەوپێش ، بۆ بەئەنجام گەیاندنی كارێك بە شەمەندەفەرە لە لاهای هۆڵەنداوە بەرەو ڤیەننا بەرێكەوتم ، لە وێستگەی دۆسلفدۆری

ئەڵمانیا گەشتیاریك سواری هەمان فارگۆن بوو کەمن سەرنشینی بووم ، ناسینەوەی کارێکی هێندە گران نەبوو بۆم ئەو بەرێزە جەعفەری شەفیعزادە بوو.

لەماوەی ئەو هەموو ساڵانەی کە لەبارەی ئەوەوە بیرم دەکردەوە ئەو کەسەی بووە هۆکاری سەرەکی دەربەدەریەکانی من، ئێستا بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو هاتووەتە بەردەستم ، دوای ئەوەی دڵنیا بووم خۆی بەتەنهایە بڕیارمدا تەلەفۆن بۆ پۆلیس بکەم سکاڵای خۆمی لەسەر تۆمار بکەم .

شەفیع زادە بە چاو سورکردنەوە و هەڕەشە ناچاری کردم لە جێگای خۆم دابنیشم سەرەتا نکوڵی لە ناسنی من دەکرد ، دواتر پێکەوە کەوتینە قسە و نێوانی دۆسلفدۆر هەتا کۆڵن پێکەوە بە گفتوگۆ تێمانپەڕاند ، قسەکانی بە جۆرێك بوو منی لە بڕیارەکەم پاشگەز کردەوە ، لەو ماوە درێژەدا

لەبارەی خۆیەوە دوا و هەستم کرد گێڕانەوە و باسەکانی بۆ مێژوو بایەخدارترە وەك لە تۆڵە سەندنەوەکەی من.

دواتر ئەو لە میونیخ دابەزی ، هەفتەیەك دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونەکەم و بۆ چەند ڕۆژێك شەفیع زادە میوانی من بوو ، ڕێگایدا یادەوەریەکانی تۆمار بکەم و بڵاویان بکەمەوە.

لەماوەی سێ مانگدا چوار جار سەردانی کردم ، هەموو جارێك بۆ چەندین کاژێر لەبارەی یادەوەریەکانی یەوە دەدوا ، شیمانەی ئەوەی دەکرد کە ژیانی لە مەترسیدابێت ، بۆیە زۆر بە خۆپارێزی و نهێنیەوە هاتووچۆی دەکردم ،

ئەو تەنانەت ئەرکی لەچاپدان و بڵاوکردنەوەی یادەوەریەکانی خستە ئەستۆی خۆی ، بڕیار وابوو سێ مانگی تر دوای گەڕانەوەی لە کەنەداوە بۆ ئەوروپا دیداری ئەمجارەمان کۆتا دیدار بێت و کۆتایی بە یادەوەریەکانی بهێنێت ، بەڵام ئیتر لەوکاتەوە هەتا ئێستا نەگەڕاوەتەوە و هەواڵکیش نیە لەبارەیەوە.

ژیانی من بەرەو کۆتایی دەڕوات ، ئەم یادەوەریانە بۆ ئێران و مێژووی ئێران بایەخێکی زۆر گرنگیان هەیە.

لەم سۆنگەیەوە لەدوای ساڵانێك دانبەخۆداگرتن بڕیارمدا دەست بکەم بە بڵاوکردنەوەی ، هیوادارم لە دوای مردنم شەفیعزادە شوێن یادەوەریەکانی بکەوێت و درێژەی پێبدات و چاپ و بڵاویان بکاتەوە

ئەم یادەوەریانە نە ڕستەیەکی بۆ زیاد کراوە و نە ڕستەیەکیشی لێکەم کراوەتەوە تەنها و تەنها کاری من ڕێخستن و نوسینەوەی بووە.

ڕێکخەر

******************************

- هەموو ئەو ڕوداوانەی کورە قەصابێکی ئاسایی بۆ سەربازێکی بێ بەزەیی و پیاو کوژ گۆڕی لە نیوەڕۆیەکی گەرمی هاوینی ساڵی ١٩٧٦ وە دەستیپێکرد.

من ئەو کاتە لە قەدریجان کە لادێ یەکی بچوکە لە نزیك نەجەف ئاباد ی دەوروبەری ئەسفەهان لە دوکانی باوکم سەرگەرمی کارکردن بووم.

ناوی باوکم ( جەواد ) ە ، خەڵکی دێ ئەویان بە { کەربەلای جەواد } بانگ دەرکرد ، دوو ساڵ لەمەو بەر لە قەدریجان کۆچی دوای کرد ، لەبەرئەوەی هێشتا من سەرباز و پاسەوانی سەید مەهدی هاشمیم[1] بە فەرمانی ئیمام جومعەی ئەسفەهان کە مەلایەکی ستەمکارە و بە ئایەتولاّ طاهیری ناوبانگی دەرکردوە ئەوەی بەناوی << شەهید >> ەوە لە نەجەف ئاباد بەخاك سپارد ، ڕەنگە هیچ کەس بە ئەندازەی باوکم بەوە دڵگران نەبێت کە بەو ناوەوە بە خاکیان سپاردووە.

سەرەڕای ئەوەی باوکم خەڵکی لادێ بوو ، بەلاّم کوێرە خوێندەواریەکی هەبوو ، پابەند بوو بە ئەرکە ئاینیەکانەوە و بەردەوام نوێژ و ڕۆژوی خۆی بەجێ دەهێنا .

---

[1] کوڕی ئایەتولاّ سەید محەمەد هاشمی لە دایك بووی ساڵی ١٩٤٥ ز قەدریجان. یەکێك بووە لە بنیادنەرانی سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی ئێران، بەهۆی درکاندنی نهێنیەکەوە بۆ ڕۆژنامەی الشراع ی لوبنانی کە بە ڕووداوی مك فالرین ناسراوە دەستگیرکرا و دوای دادگایی کردنی و هەڵدانەوەی دۆسیە کۆنەکانی لە ساڵی ١٩٨٨ لەسێدارەدرا . وەرگێر

لە تەمەنی منداڵیمدا هەمیشە پێدەگووتم: ((جەعفەر خۆت بە دووربگرە لە سەگی هار و دیواری ڕووخا و ژنی سەڵیتە و مەلا )) ، چەندین جا گوێم لەم پەندە بووە ، بەلأم ووشەی مەلا باوکم بۆ ئەم پەندەی زیاد کرد بوو. بەهەر حاڵ خەریك بوو دەمگوت هەموو ئەم ڕوداوانە لە دوای نیوەڕۆیەکی گەرمی هاوینی ساڵی ١٩٧٦ وە دەستی پێکرد .

لەو زەمەنەدا قەصابخانە بچوکەکەی ئێمە لە قەدریجان بازاڕێکی گەرمی هەبوو ، خەڵکی حەزیان لە گۆشتی بەستوو نەبوو ، ئەو بەشە گۆشتە گەرم و تازەیەی سەندیکای گۆشت فرۆشانی ئەسفەهان بۆ قەصابخانەکەمانی دابین دەکرد هێندە کەم بوو بەشی خەڵکەکەی نەدەکرد ، مەلاکانیش گوتبویان گۆشتی بەستوو حەرامە ، چونکە بەپێ ی شەریعەتی ئیسلامی سەرنابڕدرێن

ئەمەش بووبوە هۆکاری ئەوەی خەڵکی (قەدریجان ، دەریچە پیاز ، نەجەف ئاباد) تەواوی شارەکانی دەوروبەر کە زۆر بە توندی مەزهەبی بوون، کڕیاری گۆشتی بەستوو نەبن .

هەندێجار باوکم هەل بۆ دەرەخسا دەچوو بۆ فریدەنی ئەسفەهان یان سەدی شا عەباس، چەند مەڕێکی دەکڕی و دەیهێنایەوە بۆ قەدریجان ، خۆمان مەڕەکانمان سەردەبڕی و بەنرخێکی گرانتر دەمانفرۆشتەوە، نازانم چ حەلأل زادەیەك بوو داستانی گۆشفرۆشتنە ڕێکە پێنەدراوەکەی ئێمەی بە ئەسفەهان ڕاگەیاندبوو ، ڕۆژێك ئەندازیار گوڵزار سەرۆکی سەندیکای گۆشتفرۆشانی ئەسفەهان کە خۆی خەڵکی یەزد بوو، هاوڕێ لەگەڵ درەخشەندە وابزانم جێگری بوو هاتن بۆ قەدریجان ، لەو کاتەدا من

سەرگەرمی سەربڕینی مەڕی پێنجەم بوو ئێمەیان دەستگیرکرد، ئەو زەمەنە من نەمدەزانی سەربڕینی بە شێوازی تەندروستی چی یە ، بشم زانیایە بۆم گرنگ نەبوو.

بەهەر حاڵ ئێمەیان برد بۆ ئەسفەهان و ڕادەستی دادگا یان کردین ، دادگاش دوای هەفتەیەك ئێمەیان بە چوار مانگ زیندانی سزادا ، لەوکاتەدا تەمەنم تەنها ١٩ ساڵ بوو

هەڵکردن لەگەڵ هەل و مەرجی زیندان کارێکی ئاسان نەبوو بۆم ، بەهەر شێوەیەك بێت ٤ مانگ لەزیندان مامەوە و دواتر بە دڵێکی پڕکینە لە دەوڵەت و کاربەدەستانی ڕژێمی شا لەزیندان ئازاد کرام ، ئەوکات ئیتر ترسم لە زیندان شکا و ڕێگاکەیم پەیداگردبوو.

بە باوکمم گووت تۆ تەنها لە دوکان بمێنەوەو حەقت بەسەر کارەکانی ترەوە نەبێت ، هەندێك پارەم قەرزکرد و ئۆتۆمبێلێکی بچوکی باربەری مازدام کڕی و دوای نیوەڕوان بەڕێدەکەوتم بۆ خۆراسگان لەنزیکی ئەسفەهان و چەند سەرمەڕێکم دەکڕی و دەمەو خۆرئاوابوون لە بیابان سەرم دەبڕین و گۆشتەکەیم دەهێنایەوە بۆ قەدریجان ، لەبەر ئەوەی کڕیارەکانی خۆمانم دەناسی دەمبردە بەردەم دەرگای ماڵەکانیان و لەوێ پێم دەدان ، هەندێکی تریان لە کاتێکی دیاریکراودا دەهاتن و بەشەکانی خۆیانیان دەبرد .

یەکێك لە کڕیارە باش و هەمیشەیەکانمان سەید مەهدی هاشمی بوو ، ئەم سەید مەهدی هاشمیە یەکێك بوو لە باشترین کەسایەتییەکانی قەدریجان ، دواتر بەناوی پلان داڕێژەری کوشتنی ئایەتوڵا شەمس ئابادی دەستگیرکرا و دووجار سزای لە سێدارەدانی بەسەردا سەپێندرا ، لە دوایدا بەهۆی

هەڵگیرسانی شۆڕشەوە لە ٢٢ بەهمەن[٢] لەزیندان ئازاد کراو جبە و عەبای مەلایەتی پۆشیەوە و بوو بە بەڕێوەبەری نوسنیگەی ئایەتولاّ منتظری ، ئەڵبەتە بە پێداگری براکەی سەید هادی کە زاوایی ئایەتولاّ منتظریە ، کاروباری پەیوەندی دار بە تیرۆرستە نێودەوڵەتیەکان و ڕێکخراوە ئازادی بەخشەکانی بەڕێوە دەبرد ، بەلاّم لەو ڕۆژانەدا چاکەت و پانتۆڵی لەبەر دەکرد .

هێشتا ڕووداوی کوشتنی ئایەتولاّ شەمس ئابادی ڕوینەدابوو ، سەید مەهدی هاشمی شەوانی هەینی و ڕۆژانی ماتەمینی عاشورا بە جل و بەرگی تایبەتەوە لە قەدریجان دەچووە سەر مینبەر و نوسینگەیەکی هاوسەرگیری جوان و خنجیلانەشی هەبوو .

لەو ڕۆژە گەرمەی هاوینی ١٩٧٦ کە هەموو ڕوداوەکان لەو دەمەوە دەستی پێکرد ، سەید مەهدی هاشمی هاتە دوکانەکەمان ، لەوکاتەدا نیازی ڕۆشتنم هەبوو بەرەو خۆراسگان بۆ کڕینی چەند سەر مەڕێك بانگی کردم و گوتی؛ کاك جەعفەر دەزانی من چەندین ساڵە مشتەری باوکتم و هەمیشە و ئێستاشی لەگەڵدابێت لە شێوازی کارکردنی باوك و کوڕ ڕازیم، بۆ ماوەی دوو هەفتە هەندێك میوانی زۆر بەڕێز لە زانایانی ئاینی دێنە لام، هەندێکیان لە ئایەتولاّکانی مەرجەعیەتی تەقلیدن و سۆزیان پێ

---

[٢] مانگێکی ئێرانیە و بەرامبەرە بە مانگی ڕێبەندان ، دەکەوێتە نێوانی ٢١ کانونی دووەم بۆ ١٩ شوبات .
وەرگێڕ

بەخشیوین دوو سبەی سەردانی ئەصفەهان دەکەن ، خۆ دەزانیت باغی حاجی ترابی دەرچەیی لەکوێ یە ؟

گوتم : بەڵێ !

گوتی: ئەم دوو هەفتەیە ، لەوێ پشوو دەدەن . با ئەم (بیست هەزار تومان)ەت پێبێت ، ئێستا بۆتی ڕوندەکەمەوە.

یەکەم: نابێت هیچ کەس زانیاری لەبارەی ئەم میوانداریەوە هەبێت و ئاگادار بێت .

دووەم : ئەم دوو هەفتەیە ، دەمەوێت شەو ڕۆژ لەوێ بیت.

سێ یەم: ئەم پارەیەش بۆ ئەوەیە بچیت پازدە بۆ شازدە مەڕی چاك و دابەستە بکڕیت و شەو بیان بەیت بۆ باغەکە حاجی تراب دەرچەیی . لەم دوو هەفتەیەدا کاری تۆ بۆ میوانەکان سەربڕین و کەباب و سەروپێ دروستکردنە . بلێ بزانم ئامادەیت یان نا ؟

من سەید مەهدی هاشمیم زۆر خۆشدەویست . وابیرم دەکردەوە ، مرۆڤێکی خوێندەوار و تێگەیشتووە. هەموو خەڵکی گوندیش وەها لێی تێگەشتبوون . لەوەگەڕێن من هەتا ئەوکاتە هەرگیز بیست هەزار تومان پارەم بە کاش ، پێکەوە نەدیبوو . هەر ئەوە بوبە هۆکار ڕاستەوخۆ بڵێم ئێوە ئەمر بکەن ، ئێوە ئەگەر فەرمانی کوشتنی کەسێك بدەن ناڵیم نا ! ئێمە نۆکەرتین بەڕێز هاشمی ، دوای ئەوەی سەید مەهدی هاشمی ، بینی کە من ڕازیم ، هەندێك لەبارەی شێوازی کارکردنی ئەو چەند ڕۆژە دوا و گوتی : بەدڵنیایەوە دەبێت

هەتا سبەی دەمەو خۆرئاوا بوون مەڕەکان لە باغەکەی حاجی تراب بن ، خۆشم دەبێت بە دایك و باوکم بڵێم بۆ دوو هەفتەیەك دەچم بۆ مەشهەد !

سەید مەهدی ڕۆشت و بەجێی هێشتم ، منیش لە خۆشی بوون بە خاوەنی بیست هەزار تومانی کاش، دەست و پێ ی خۆم ونکردبوو .

بەجێگای خۆراسگان ڕۆشتم بۆ فریدەنی ئەصفەهان و ١٨ مەڕی جوان و دابەستەم بە ٨٤٠٠ تومان کڕی و بەیانی پێش خۆرهەلاَتن ، خۆم گەیاندە باغەکەی حاجی تراب لە دەرچە پیاز ، سەید ئەبو الفضل، باغەوانەکەی حاج ترابم دەناسی. دەرگای لێکردمەوە و لە گۆشەیەکی باغەکەدا مەرەکانمان بەستەوە. لە فریدەن هەندێ عەلەفم لەگەڵ خۆم هێنا بوو ئەویشمان کردە کادێنێکی کۆنەوە .

سەید ئەبو الفضل ماتۆڕێکی پێ بوو، داوام لێ کرد سبەی کاژێر ١٠ ی بەیانی لە تەنیشت مەیدانی ٦ ی بهمەن لە نەجەف ئاباد، چاوەڕێم بکات و لەگەڵ خۆیدا بمگەیەنێتە باغ ، کاژێر ٧ ی بەیانی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە ، لەوەی کە دوێنێ شەوە نەهاتبوومەوە بۆ ماڵ باوکم زۆر لێم دلگرانبوو . پێمگووت کارێکم بۆ هاتە پێشەوە و ناچار بووم شەو لە ئەصفەهان بمێنمەوە ، ئێستاش دەبێت بگەڕێمەوە بۆ ئەصفەهان ، دەمەوێت تکتی مەشهەد ببڕم بچم بۆ زیارەتی ئیمام ڕەضا .

باوکم هەرگیز لەم کارە شیتانانەی من سەری نەدەسوڕما . منیش داودی مێردی خوشکم بانگ کرد و سویچی ئۆیۆمبێلەکەم پێدا ، هەتا لە کاتی ئامادە نەبوونی من کاری دوکانەکەمان وەپاش نەکەوێت دواتر دووهەزار تومانم بە باوکمدا هەتا دڵنیایی بکەوەوە کە پارەی پێویستم پێ یە بۆ

سەفەرەکەی مەشهەد ، لەگەڵ داود بەڕێکەوتم کاژێر ٩:٣٠ خولەکی سەر لەبەیانی گەیشتینە نەجەف ئاباد .

گوتم بە داود بگەڕێوە هەرچی پێداگیری کرد هەتا بمگەیەنێتە ئەصفەهان ڕازی نەبووم . کاژێر ١٠ ی سەر لەبەیانی خۆم گەیاندە مەیدانی ٦ ی بەهمەن کاتێك بینیم سەید مەهدی و علی ئەکبەری پەروەرش لە ئۆتۆمبێلێکی سپیدا چاوەڕێم دەکەن زۆر سەرم سوڕما ، لەم دوایانەدا بەڕێز پەروەرش بوو بە وەزیری پەروەردە و فێرکردنی ڕژێمەکەی خومەینی. ئەوکات مامۆستای ئامادەیی پیشەسازی ئەصفەهان بوو ، هەردوکیان لەپێشەوە دانیشت بوون هەرکە چاویان بەمن کەوت ، پەروەرش دەرگاکەی کردوە لە دواوە دانیشت . منیش چومە پشت سوکان و بەرەو باغەکەی حاجی تراب بەڕێکەوتین.

پێویستی بە ناساندن نەدەکرد ، چونکە بەڕێز پەروەرش یەکێك بوو ، لە گوێکرە هەمیشەیەکانی مینبەری سەید مەهدی هاشمی . بە درێژایی ڕێگاکە لەبارەی چۆنیەتی پێشوازی کردن لە میوانەکانەوە دەدواین و سەرئەنجام گەیشتینە جێگای مەبەست ، باغەکەی حاجی تراب دەکەوێتە نێوان دەرچە پیاز و فلاوەرجان . لەسەرجادەیەکە لەم دوایانەدا قیر کرا .

ئەو ڕۆژە هەتا خۆر ئاوا بوون ، من کوڕەکانی سەید ئەبو الفضل سەرگەرمی کارکردن بووین . هەرکە خۆر ئاوا بوو ، پەروەرش ڕۆشت و هەتا کاژێر ١٢ ی شەو ، زیاتر لە ٦ جار دەڕۆشت و دەگەڕایەوە هەرجارێك دەهاتەوە برێك بەتانی و دۆشەك و قاپ و قاچاخی لەگەڵ خۆی دەهێنا.

نیو کاژێر لە نیوە شەو لای دا بوو سەید عبداللە هات . سەید عبداللە لە چێشخانە و کەبابی سلطانی ئەصفەهان چێشت لێنەر بوو بەڕاستی چێشتەکانی بەلەزەت بوو. دەمێك بوو من ئەوم دەناسی ، چونکە ئەویش خەڵکی قەدریجان بوو.

کاژێری ٢ ی نیوەشەو ، سەید مەهدی پێیگوتین بڕۆن بخەون لە سبەینێ وە کارەکانمان دەست پێدەکات . جێگە نوستنەکەی من و سەید عبداللە کە تەمەنی نزیکەی ٥٠ ساڵ دەبوو ، ژوورێکی بچوك و ڕووبەڕووی ماتۆڕێکی ئاو دێران بوو ،

کەمێکیش لە خانە باغەکەوە دوور بوو ، کاتێك ویستم بخەوم سەید عبداللە گوتی : قوربانیان بم . حەزرەتی ڕەضا ئێمەی نەویست و هەر نەویست ، ئەمجار ئێمەی ویست بەجێگای مەشهەد سەرمان لە دەرچە پیازەوە دەرهێنا ! . زۆر پێکەنین ، بەڵام دواتر گوتی : کێشە نیە سەید مەهدیش لە ئەولیاکانە و خزمەتکردنی زانایانی ئاینی ، هیچی کەمتر نیە لە زیارەتی ئیمام ڕەضا.

بێخەوی دوێنێ شەوە و کاری قورسی ئەمڕۆ هۆکاربوون بۆ ئەوەی زوو خەوم لێبکەوێت . کاژێر ٧ ی بەیانی لەخەو هەستام ، سەید عبداللە زۆر زوتر لەمن خەبەری بوو بوویەوە . کاتێك بۆ دەموچاو شتن چومە دەرەوە ، لەتەنیشت حەوزێکی بچوك کە یەکەمجار ئاوی ماتۆڕەکە دەچووە ئەوێ ، سێ چوار مەلای مێزەر بەسەرم بینی، وادیار بوو دوێنێ شەو یان لەوانەیە ئەم بەیانیە گەیشتبنە جێ

هەموویان گەنج بوون . لەوانەیە پیرترینیان ٢٨ بۆ ٢٩ ساڵ بوبێت ، سەرگەرمی پێکەنین و گاڵتەوگەپ بوون . هەتا ئەو کاتە مەلای گاڵتەچی و خۆش ڕووم نەدیبوو ، سلاوٶمکرد و وەڵامیان دامەوە ، دواتر سەید مەهدی هاشمی هات و پێ ی گوتم یەکێك لەمەڕەکان سەربېڕم و دەستبکەین بە دروستکردنی کەباب ، بە ئەندازەی سی کەس و هەندێ لە گۆشتەکە بدەم بە سەید عبدالله هەتا بۆ ناو شلە و هەندێ خواردەمەنی تر بەکاری بهێنێت.

ئێمە لە گۆشەیەکی باغەکەوە خەریکی کار بووین ، بەڵام سات بە سات ژمارەی مەلاکان کە تاو ئەکاتە من ئەوانم نەدیبوو ، زیاتر دەبوو . سێ بۆ چوار کەسیان مەلا نەبوون ئەوانیشم نەدەناسی. تەواوی دەمەو بەیانی ئەو ڕۆژە هەتا نزیکی نیوەڕۆ بەسەر بڕینی مەڕ و ئامادەکاری دروستکردنی کەبابەوە تێ پەڕاند . هەتا نزیکی نانخواردنی نیوەڕۆ کاتێك سفرە ڕاخرا و ئامادەکاری کرا من چووم و کۆتا بەشی کەبابەکەم بۆ بردن ، بۆ یەکەمجار هەموو میوانەکانم لە تەنیشت یەکەوە بینی .

سەید مەهدی هاشمی و پەروەرش ، لە بەردەم دەرگای ژوورەکەدا دانیشتبوون، ئەوانی تر ١٥ کەس دەبوون، ١١ کەسیان مەلا و ٤ کەسیان ئاسایی بوون . لەسەر سفرەکە سەرقاڵی نانخواردن و گاڵتە و گەپ بوون. مەلایەکی مێزەر ڕەش لە سەروی سفرەکەوە دانیشت بوو ، لە هەموویان بالآبەرزتر و پێگەیشتوو تر و ڕێك پۆشتر بوو. دیار بوو ، کە ڕابەرایەتی هەموو یان دەکات ، ئەوکات من ئەوم نەدەناسی ، بەڵام ئێستا هەموو دونیا ئەو دەناسن ئەو ئایەتولاَ دکتۆر محمدی بەهەشتی بوو !.

جگە لە ئایەتولاّ بەهەشتی ، لە دوایدا ئەوانی ترم ناسی و لەگەڵیان بوومە هاوکار ، ئەوانیش ئەم کەسانە بوون : ( محمد منتظری ، جەواد باهونەر ، شێخ صادق خالخالی ، فضل الله محلاتی ، طاهری ، خادمی ، یوسفی صانعی ، صدوقی یەزدی ، دەستغەیب شیرازی ، عەلی مشکینی ) ئەمانە مێزەر بەسەر بوون و ئەوانەشی مەلا نەبوون ئەمانە بوون ( دکتۆر صەلاّواتی ، دکتۆر میناچی ، غلاّمعباس تەوەسولی ، محمد هاشمی ڕەفسەنجانی ).

سەید مەهدی داوای لێکردم ئەوانی تریش بانگ بکەم بۆ ئەوەی هەموومان پێکەوە نان بخۆین ، هەتا من سەید عبدالله و سەید ئەبو الفضل و کوڕەکانیم بانگ کرد بۆ نانخواردن ، میوانەکان زۆربەیان خەریك بوو دەستیان هەڵدەگرت ، جگە لە چەند کەسانێك یەکێك لەوانە شێخ صادق خالخالی بوو ئەوانی تر خەریکی حەڵوا خواردن بوون .

لەناو ئەو هەموو مەلایەدا ئایەتولاّ خادمی کە من ڕێزێکی زۆرم هەبوو بۆی ، زاری کردەوە و دەستی بە قسەکردن کرد و لەبارەی ئیسلامەوە دواو و گوتی : بەڵی ! ئیسلام ئەمەیە لە ئیسلامدا شا و گەدا جیاوازیەکیان نیە . بەپێ ی یاسای خودا هەمووان یەکسانن ، براکان هەموویان پێکەوە دادەنیشن دەستیان لەناو یەك سفرە دەبێت .

ئەم بەرنامەی نان خواردنە ، پانزە ڕۆژ بە هەمان شێوە بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە دووبارە دەبوویەوە، تەنها شتێك کە جیاواز بوو جۆری خواردنەکان و ژمارەی میوانەکان بوو . کە هەندێ جار زیادیان دەکرد و هەندێ جار کەمیان دەکرد.

لەنێوان ئەو سێ ژەمە نانخواردنانەدا ، ئەو بەڕێزانە سەرقاڵی کۆبونەوە و گفتوگۆ بوون ، ئەویش لە ژوورێکی داخراو، بێ ئەوەی کەس مافی چونە ژوورەوەی هەبێت . دوو ڕۆژی سەرەتا زۆر سەختگیریان دەکرد ، بەڵام دواتر ئەم چاودێریە توندانە وردە وردە کەم بونەوە و هەتا ئەوەی یەکەمین شەوی هەینی هات، ئەو شەوە سێ کەس لەو بەڕێزانە ڕۆشتن . ئەوانیش ؛ بەهەشتی و دەستغەیب شیرازی و خادمی بوون . ئەوانی تر مانەوە و من بۆ یەکەمین جار لە تەمەنمدا شاهیدی مجلیسی ئەوان بووم کە هەتا ئەو کات لە خەونیشدا باوەڕم بەشتی وەها نەدەکرد .

لە کاژێر ٩ شەو ، دوای نانخواردنی ئێوارە دەستیان دەکر بە تریاك کێشان، هەموو ڕۆژێ دوای نانی نیوەڕۆ و ئێوارە کردبویان بە پیشە ، هەروەها هەستم بە بۆنی مەشروب دەکرد ! ، بەڵام هەرچی چاوم دەگێڕا بۆ بتڵی مەشروب هیچم نەدەبینی . ئەوەشم بیر چوو بڵێم دوو ڕۆژی سەرەتا بە فەرمانی سەید مەهدی هاشمی لەدوای نانی نیوەڕۆ و ئێوارە ، من لە پشت دەرگای چونە ژوورە وە پاسەوانیم دەدا هەتا ئەوانی تر وەك ؛ سەید عبداللە و سەید ئەبو الفضل یا هەرکەسێکی تر خۆی نەکات بە ژووردا . لەو شەوانەدا بابەتی مەشروب خواردنەوەی ئەو بەڕێزانە زۆر بۆم گرنگ نەبوو ، چونکە منیش وەك ئەوان نوێژم دەکرد ، ڕۆژووم دەگرت و دەچووم بۆ زیارەت و ڕۆژانی تاسوعا و عاشورا بە زنجیر لەخۆمم دەدا و شەوانی هەینیش بە کەمێك عەرەق لێوم تەڕ دەکرد .

عەرەق بخۆرەوە و مینبەر بسوتێنە ، بەڵام ئازاری خەڵك مەدە ئەمە سەرەکیترین دەستوری دینی من بوو ، بەگرفتم نەدەزانی بەڕێزانی زانایانی ئاینیش هاوشێوەی من بۆ سارێژکردنی برینەکانیان بخۆنەوە، ئەوەی بەلای

منەوە گرنگ بوو دۆزینەوە و پەیداکردنی سەرچاوەی ئەو مەشروباتانە بوو نەك خواردنەوەی.

لە کاژێر ۱۱ ی شەو ، دەنگە دەنگ بەرز بویەوە و بۆڵە بۆڵ دەستی پێکرد . محمدی منتظری و صانعی دەستیانکرد بە پرسیارکردن لە پەروەرش دەیانگووت ، دەی بۆچی نەهاتن؟ ڕۆژ بویەوە ! دەی کەی دێن ؟! پەروەرشیش پێ ی دەگوتن ، کەمێك دان بەخوتاندا بگرن پەلەمەکەن هەتا کاژێر ۱۲ بۆ ۱ ی شەو ناتوانن بێن ! شەوی هەینیە . شەوی هەینیش نان و بازاڕی ئەوانە !.

من لای خۆمەوە وەها بیرم دەکردەوە لەوانەیە ئەم بەڕێزانە لە چاوەڕوانی هاتنەوەی ئایەتولاّ بەهەشتی و خادمی و دەستغەیب دا بن ، بەلاّم کاتێك کاژێر ۳۰: ۱۲ شەو میوانەکان گەیشتن هێندەی نەمابوو بەو تەمەنە گەنجەمەوە جەڵتەی دڵ لێم بدات !.

میوانە تازەکان ، دوو ژنی بێ حیجابی لە ماکیاژ هەڵکیشا بوون . لەگەڵ چوار پیاو جانتای کەمانچە و تار و سەنتور و زەڕبیان پێ بوو ، هاتنە ژورەوە و ڕوخساریان هێندە ئاشنا بوو هیچ گومان لەوە نەبوو تەنانەت سەید ئەبو الفضل باغەوانیش دەیان ناسێت .

کەشی ژوورەکە کەم کەم خەریك بوو ساردەبوویەوە ، بەهاتنی میوانە تازە لەڕێ گەیشتوەکان کەشەکە گۆڕاو و هاواری ئافەرین و تبارك الله ی مەلاکانیش گەرم و گوڕیەکی تازەی بە میوانیەکە بەخشی ، ڕەفتاری تازە هاتووەکان بەجۆرێك بوو بەئاسانی دەتوانرا هەستی پێبکەیت جگەلە علی ئەکبەری پەروەرش کەسی تر ناناسن .

با ئەوەش بڵێم لە یەکەم ڕۆژی سەرەتا و ڕۆژانی دواتر ، میوانەکانی سەید مەهدی هاشمی هەتا کاتێك لەناو باغ بونایە ، بە بیجامە و شەرواڵ و کراسی ئاسایی  هەندێکیان یەخە دار و هەندێکیان بێ یەخە بوون دەسوڕانەوە جبە و عەبا تەنها لە کاتی چوونەدەرەوە لەبەریان دەکرد ، بەو جۆرە شکل و شێوەی ئەوان زیاتر لە حاجیەکانی ناو بازاڕ دەچوو هەتا زانایی ئاینی ! لەیەك دوانێکیان بگەڕێین ئەوانی تر زۆر مەلایانە قسەیان نەدەکرد ، لە یەکەم بینینی سەرەتاوە مەلا بونیان دیار بوو

من هەموو میوانە تازەکانم دەناسی . ئەوان هونەرمەندان و ئەندامانی دەستەی ئۆرکێسترای یانەی شەوانەی ژێر زەمینی هۆتێل عالی قاپوی ئەصفەهان بوون .

ئەم هۆتێل عالی قاپوە دەکەوێتە شەقامی چوار باغ ، هۆتێلێکی زۆر چاك بوو . ژێر زەمینێکی هەبوو کە چێشتخانەی ئوتێلەکە بوو ، شەوانیش لەوێ بەرنامەی ساز و ئاواز و سەما بەڕێوە دەچوو . ئەم موعینی گۆرانیبێژەش هەرلێرەوە دەستی بە گۆرانی گوتن کرد. ئەو دوو ژنەی ئەو شەوە هاتبوونە باغەکەوە لە هونەرمەند و سەماکارەکانی ئەوێ بوون، ناوی یەکێکیان ئیلهام و ئەوی تریان نەرگس بوو ، نەرگس کەمێك قەڵەو بوو هەر لەسەرەتاوە سەرنجی مەلاکانی بۆلای خۆی ڕاکێشا ، پێم گوتن ساتی هاتنە ژوورەوەی ئیلهام و نەرگس سەماکارانی شۆخ و شەنگی هۆتێل عالی قاپوو میوانیەکە ڕەنگ و ڕوویەکی تری بەخۆیەوە بینی.

پێداگریە یەك لەدوای یەکەکانی باهونەر و محمد منتظری لەو دوو سەماکارە ، بۆئەوەی لە نزیك مەقەڵیەکەوە دابنیشن و تریاك بکێشن بێ

سوود بوو ، تەنانەت لێویشیان لە مەشروب نەدا ، من بە دونیایەك سەرسوڕمانیەوە لەبەر خۆمەوە دەمگووت سەیری کاری دونیا بەکوێ گەیشتووە، سەماکاران و گۆرانبێژانی شارەکەمان خۆیان لە تریاك و مەشروب و فسق و فجور بە دوور دەگرن و بە جێگای ئەوان زانایانی ئاینیمان بە کۆمەڵ دانیشتوون و دڵیان بە منکرات گرێداوە !.

خالخالی تریاکی نەدەکێشا ، بەڵام تەواو مەست بووبوو. یەك دووجار هەوڵیدا دەست بۆ لەش و قاچی سەماکارەکان ببات، ئەوانیش بەرپەرچیان دەدایەوە ، لەناو ئاواز لێدەرەکاندا پیاوێکی نابینایی تێدابوو ئێستا ناوەکەیم بیر نەماوە ، بەڵام دڵنیام خەڵکی ئەصفەهان ئەو باش دەناسن منیش چەند ساڵ لەمەوبەر ئەوم باش دەناسی ، کاتێك مەجلیسەکە گەیشتبووە لوتکەی عەیش و نۆش بەهێواشی چرپاندی بەگوێمدا و گووتی : ئەمانەی لێرە دانیشتوون یەك دووانێکیان شێخ و مێزەر بەسەرنین ؟! ویستم بڵێم بۆچی نا زۆربەیان ! ، بەڵام نازانم بۆچی وامنەگووت لەوانەیە لەبەر ئەو متمانەیە بوبێ کە سەید مەهدی هاشمی بەمن هەیبوو . دڵم نەهات سنوری ئەو متمانەیە بشکێنم ، هەر ئەوە بووە هۆکار بڵێم نەخێر ، ڕاستەوخۆ گوتم بۆچی ئەو پرسیارە دەکەیت ؟

ئەویش گووتی : شێوازی قسەکرنەکانیان وەك مەلاکانە.

کاژێر ٢ ی نیوەشەو ، کاتێك سەمای عەرەبی و هیندی دەستی پێکرد . سەماکارەکان جل و بەرگی تایبەت بەو سەمایەیان لەبەرکرد و لەش و لاریان دیدەنی تر بوو ، سەمایان دەست پێکرد و خاڵخاڵیشی بە وورگە زلەکەی و هەیکەلە پێکەنیناویەکەیەوە لەجێگای خۆی هەستاو لە سەمای

عەرەبی و هیندیدا لاسای ئیلهام و نەرگسی دەکردەوە . شێخ یوسفی صانعیش فلوتەکەی لە دەستی یەکێك لە ئاواز لێدەرەکان وەرگرت دەستیکرد بە ژەنین ، وەها ئاوازی لێدەدا دەتگووت چەندین ساڵە میوزیك ژەنە.

ئەو شەوە لێدە و بکوتە هەتا کاژێر ٥ ی بەیانی بەردەوام بوو. لە ئاکامدا کاتێك هونەرمەندە ماندوو مەلولەکان گەڕانەوە بۆ شار ، زانایانی ئاینیش ماندوو تر لەوان هەریەکەو لە گۆشەیەکی ژورەکەدا خەویان لێکەوت . تازە دونیای هۆشیاری من و پرسیار و وەڵامەکانم دەستی پێکرد.

خۆم خەریك کرد بە کۆکردنەوەی قاپ و پەرداخە کەوتووەکانی ژوورەکە ، بەڵام بۆ ساتێکیش لە دونیای پرسیار و ووەڵامەکانم غافڵ نەبووم .

ئەو شەوە سەید مەهدی هاشمی لێوی لە مەشروب نەداو یەك پێکی نەخواردەوە ، لەو کاتەدا بەستەیەك پارەی پێدام و زۆر سوپاسی ماندوو بونەکانی کردم و گوتی : با ئەو بیست هەزار تومانەت پێبێت بەڕاستی زۆر ماندووم کردیت ، من قەرزداری تۆم ئێستا ئەتوانم ڕێك و ڕاست پێت بڵێم هەتا کۆتایی تەمەن تۆ لەگەڵ مندایت ، انشاالله ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پارەدارتر و دەوڵەمەند تر دەبیت .

بەڕوخسار وەڵامی هەموو پرسیارەکانم وەرگرتەوە . بیست هەزار تومان پارەیەکی کەم نەبوو ، بۆمن بەسەرمایە ئەژمار دەکرا . بە قسەی سەید مەهدی خەریك بوو دەوڵەمەند دەبووم و ئەو شتەی کە هەمیشە بیرم لێ دەکردەوە .

له هه‌مووی گرنگتر ئه‌وه بوو سه‌ید مه‌هدی هاشمی بڕوا و متمانه‌یی ته‌واوی پێم هه‌بوو ، هێشتا هه‌فته‌یه‌ك تێنه‌په‌ڕ یبوو من بووم به خاوه‌نی بیست هه‌زار تومان ، كێ ده‌یتوانی ئه‌و هه‌مووه یارمه‌تی من بدات ؟ به‌من چی خالخالی باش سه‌ما ده‌كات یا صانعی باش فلوت ده‌ژه‌نێت ، یا ئه‌وانی تر مه‌شروب ده‌خۆنه‌وه ؟! خۆ حساب و كتابی به‌هه‌شت و جه‌هه‌نه‌می ئه‌وان له ده‌ستی مندا نییه ، یان له‌وانه‌شه ڕێگه‌یان پێدرابێت ، كاتێك له‌و خه‌یالآنه‌دا بووم سه‌ید عبدالله ی چێشت لێنه‌ر له خه‌و هه‌ستاو من خه‌وم لێكه‌وت .
كاژێر ۲ ی داوی نیوه‌ڕۆ كاتی نانخواردن خه‌به‌رم بوویه‌وه و دیتم هه‌موو مه‌لاكان شاد و سه‌ره‌حاڵن و سه‌رگه‌رمی گفتوگۆن ، به‌هه‌شتی و دستغه‌یب و خادمیش گه‌ڕابوونه‌وه . واگومانم برد نایانه‌وێت باسی ناهه‌نگه‌كه‌ی دوێنێ شه‌و بكه‌ن ، هه‌وڵده‌ده‌ن ئه‌وه‌ی ڕوویدا بوو له‌و سێ به‌ڕێزه بشارنه‌وه ، به‌لآم به پێچه‌وانه‌ی گومانه‌كه‌ی من زۆر بێشه‌رمانه‌و به ڕووقایمیه‌وه باسی بابه‌ته‌كه‌ی دوێنێ شه‌ویان ده‌كرد . به‌تایبه‌تی ئه‌و بارودۆخه‌ی كه هه‌ریه‌كه له‌وان تێ ی كه‌وت بوو، به‌گاڵته‌و پێكه‌نینه‌وه ده‌یانگێڕایه‌وه و به‌داخ بوون بۆ ئه‌و سێ كه‌سه‌ی تریان كه له‌وێ نه‌بوون .

شه‌وی هه‌ینی دواتر ، هه‌مان به‌زمی عه‌یش و نۆش دوباره بوویه‌وه و له كۆتاییدا دوای شانزه ڕۆژ بێ ئه‌وه‌ی من و سه‌ید ئه‌بو الفضل و سه‌ید عبدالله بزانین ، جگه له خۆشگوزه‌رانی و ڕابواردنه كانیان چی تر له كۆبونه‌وه‌كانیان گوزه‌راوه و باسی چیان كردووه و چ بڕیارێكیان داوه. میوانداریه به شكۆ و گه‌وره‌كه‌ی باغی حاجی ترابی ده‌رچه‌یی به گوته‌كانی سه‌ید مه‌هد هاشمی كۆتایی پێهات و چ باش بوو كه به كۆتاهات .

مەلاکان هەریەك چوو بەلای کاری خۆیەوە و بلاوەیان لێکرد ، من و سەید عبدالله پێکەوە لە زیارەتی مەشهەد گەڕاینەوە و چووینەوە بۆ ماڵە کانمان ، تەنها جیاوازیەك کە ئێستا هەمە ئەوە بوو ، ئەو جەعفەری شفیعزادەی شانزە ڕۆژ لەمەوبەر ئێستا گەیشتۆتە نان و نیعمەتی خۆیی و ئەو بەخشیشە چەورەی لە سەید مەهدی هاشمی و ئایەتولاّ بەهەشتی وەریگرتبوو نزیکەیی هەشتاو پێنج هەزار تومان پارەی کاش بوو، هەتا بیست ڕۆژ لەوە و پێش خەونم بە وەها پارەیەکەوە نەدیبوو .

بۆیە ئەمانەم لەسەرەتاوە گێڕایەوە و هەندێ لە دەورانی ژیانم شیکردەوە بۆ ئەوە باسمکرد کە کاتێك دەڵێم هەموو شتێك لە نیوەڕۆیەکی گەرمی ساڵی ۱۹۷٦ وە دەستی پێکرد هەتا باش بزانن بۆچی ؟ وادەڵێم .

کاتێك سەید مەهدی هاشمی خودا حافیزی لێکردم ، پێی گوتم ڕۆژی چوار شەممەی داهاتوو کاژێر ۸ ی بەیانی لە مەیدانی عالی قاپوی ئەصفەهان ئامادەبم ، هەتا هاوڕێ لەگەڵ ئەو بۆ دەرهێنانی پاسپۆرت بچین بۆ شارەوانی ، ئەو تەنانەت پێ ی نەگوتم بۆچی دەیەوێت پاسپۆرتم بۆ دەربکات ؟ ڕاستت دەوێت لەدوای میوانداریەکەی باغی حاجی تراب ئیتر بۆم گرنگ نەبوو خەریکی چیم ، بەلاّم سەید مەهدی هەموو شتێکی دەزانی .

ئەو پارەیەی وەرم دەگرت وەلاّمی هەموو پرسیارەکانم بوو ، کاتێك گەیشتمە ماڵەوە دایك و باوکم زۆر خۆشحاڵ بوون و دەستیان دەهێنا بەسەر کوڕە لە زیارەت گەڕاوەکەیان . هێندەی نەمابوو خۆشم باوەڕبکەم لە زیارەتی مەشهەد گەڕاوەمەتەوە .

پێش ئەوەی باسی دیاری مەشهەدم لەگەڵدا بکەن ، بەهەریەکەیان کاغەزێکی سەوزی هەزار تومان یم پێدان و بەبیانووی ئەوەی لە مەشهەدم خەوم بینی وە و پێم گوتراوە ئەم پارانە بسوم بە چوارچێوەی قەبرەکەی ئیمام رەضا ، چونکە دەبێتە مایەی خێر و بەرەکەت و تەبەڕوك ، بەکورتی سەر و ژێری بابەتەکەم کرد و خۆم لە دیاری لادا.

کاتێك تیشکی ڕازی بوونم لە چاوەکانی دایك و باوکمدا دیت ، لەبەرخۆمەوە گوتم بەڕاستی پارە چارەسەری هەموو کێشە و گرفتەکانە ئەویش پارەی بەلاش ، بەلأم ئەمڕۆ ... ئەمڕۆ لە هەموو جێگایەکی ئەم دونیایە لە ژێر مەترسی کوشتندام لەلایەن حیزبولأیەکانی ڕژێم ، ئامادەم هەموو ماڵ و دارایم کە خۆی دەدات لە ملیۆنان دۆلار ببەخشم هەتا بۆ تەنها ساتێك بۆ دونیای بێ کێشە و نیگەرانی هەمان دەورانی قەصابی بگەڕێمەوە ، بەلأم درێغ و حەیف و سەد حەیف...

پەیوەندی نێوان من سەید مەهدی هاشمی ڕۆژ بە ڕۆژ بەتین تر دەبوو ، ئێستا ئیتر هەمووان دەزانن کە من وازم لە دوکانە قەصابیەکەی باوکم هێناوە ، زیاتر وەك ؛ شۆفێری سەید مەهدی هاشمی دەردەکەوم. ئەو جگە لەو جۆرە میوانداری و کۆبونەوانە و ئامۆژگاری و ووتاردان کارێکی تری نەبوو.

بە دروستی نەمدەزانی ئەو هەموو پارەیە لەکوێ ؟ و بە چ ڕێگایەك بەدەستی دێنێت ! بۆشم گرنگ نەبوو ، چونکە ئەو پارەیەکی زۆر و زەبەندی بە من دەدا لەوانەیە بە ڕێژەیەکی زۆر ئەو خۆش ویستن و ئەو پەیوەندیە بەتینەی نێوانمان زیاتر لەبەر پارەکانی بوبێت.

بەهەرحاڵ ، دوای ئەوەی پاسپۆرتەکەم وەرگرتەوە لە کۆتاییەکانی مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ بەڕێز هاشمی چوین بۆ تەهران ، بە بنەماڵەکەمم گوت لەژێر کاریگەری ڕێنمایەکانی سەید مەهدی هاشمی دەمەوێت بچم بۆ نەجەف و ببم بە خوێندکاری ئاینی . پارەیەکی زۆرم بۆ بەجێ هێشتن ، چەند ڕۆژێك لە تەهران ماینەوە ، دواتر لەگەڵ غولامعباس تەوەسولی کە دوای شۆڕش بوو بە سەرۆکی زانکۆی ئەصفەهان بە فڕۆکەی ئێر فرانس بەرەو پاریس بەڕکەوتین ، ئەمە یەکەمین سەفەری من بوو بۆ دەرەوەی وولات . تەنها سەفەریش بوو بەفڕۆکە کردبێتم هەر ئەمە بوو بە هۆکار کە دکتۆر تەوەسولی ناچار بێت ئاداب و ڕسومەکانی ناو فڕۆکەم فێربکات.

کاتێك گەیشتمە پاریس ، لە خۆشیدا پێیەکانم ئەرزی نەدەگرت ، من لەکوێ و پاریس لەکوێ ؟ ئایا ئەگەر سەید مەهدی هاشمی نەبووایە من دەمتوانی بچم بۆ پاریس ؟ بێگومان نەخێر ! .

پاریس نامۆ بوو بۆم ، بەلام لەزەتم لێ دەبینی . لەزەتێك کە زۆری نەخایاند دوای ئەوەی نامەیەکی داخراویان دا بە دەستمەوە ، تەوەسولی هاوڕێتی کردم هەتا فڕۆکەخانەی ئورلی پاریس. پێ ی گوتم چەند ڕۆژێك لەم شارە جوانە دەمێنمەوە و دواتر بەرەو سوریا بەڕێ دەکرێم . بۆ جێگایەك کە بڕیار بوو ، بەهۆی وەلی نیعمەتەکانم سەید مەهدی هاشمی ژیانێکی تازە تیایدا دەست پێ بکەم.

دوای دابەزینم لە فڕۆکەخانەی دیمەشق لەلایەن چەند کەسێکی سەربازیەوە پێشوازی کرام ، بێ یەك و دوو بە ئۆتۆمبێلێك بەرەو

جێگایەکی نادیار بەڕکەوتین. دەمزانی بۆ بینینی خولێکی سەربازی هاتومەتە ئێرە ، ئەوشم دەزانی دەبێ چاو گوێ بکەمەوە و شێوازی کارکردن بە چەك و تەقەمەنی و بەکارهێنانی چەقۆ و کەرەستەی تەقینەوە و چالاکی جۆراوجۆر لەمانەوە فێربم ، ئەمانە ئەو کارانە بوو دەبوو لەبەر خاتری سەید مەهدی هاشمی فێری ببم.

یەك دوو ڕۆژ لە خانوویەکی نزیك دیمەشق نیشتەجێ بووم ، دواتر لەگەڵ چەند کەسێکی ئێرانی و پاکستانی گوازراینەوە بۆ سەربازگەیەکی پارتیزانی

دەورانێکی سەخت بوو ، سەخت و لەزەت بەخش . منێك هەمیشە جنێوم بە ڕژێمی شا دەدا کە بۆچی گەنجەکان ڕاپێچی سەربازی دەکات . لە کۆتایدا بەخشرام لە خزمەتی سەربازی و لە ژێر باری سەربازی ڕزگارم بوو ، بەلاّم ئێستا وام لێهاتووە خۆشم ناچارم چوار مانگی تەواو لەسەربازگەیەکدا خولی پارتیزانی ببینم، ئەویش نەك لەناو ولاّتی خۆمدا و لەبەر خاتری ولاّتەکەم ، بەڵکو لە سوریا و بۆ ئەو ئامانجانەی سەید مەهدی هاشمی هەیبوو.

جگە لەمن سی و دوو ئێرانی تر لەو سەربازگەیەدا بوون . زۆربەیان یان خوێندکاری زانکۆ بوون یان خوێندنیان تەواو کردبوو ، لەم نێوەندەشدا خوێندەواریەکەی من هەتا شەشەمی سەرەتایی بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا باشترین پارتیزانی ناویان بوو ئەمە بەگووتەی ڕاهێنەرە سوریەکان.

ماوەیەك لە دەستپێکی کاری من لەسەربازگەکە تێ نەپەڕیی بوو ، ڕۆژێك فەرماندەی سەربازگەکە ڕائیدێکی سوری بوو بەناوی (حامد محمد سودانی )

داوی کرد بچم بۆ نوسینگەکەی ئێرانیەکیش لەوێ بوو کاری وەرگێڕی دەکرد و ڕێکخەری پەیوەندی ئەندامە ئێرانیەکانی ناو سەربازگەکە بوو لەگەڵ سەید مەهدی هاشمی ، بەمنی گووت ئایەتۆڵا شەمس ئابادی لە ئەصفەهان کوژراوە و لەم نێوەندەدا سەید مەهدی هاشمی و هەندێ لە خزم و کەسەکانی تۆ کە نازناوی شەفیعزادەیان هەیە دەستگیرکراون و خراونەتە زیندانەوە ، کاتێك گوێم لەم هەواڵە بوو تاسام و بەخێرایی دەستم بە پرسیارکردن کرد . هەتا زیاتر بزانم لەبارەی ئەو ڕوداوەوە ، پیانگووتم بەیانیەکی زوو لە کەنار جادەی دەرچە، تەرمی ئایەتولا شەمس ئابادیان بە کوژاوی دۆزیوەتەوە .

دواتر کوڕە پورەکەم (محمد حسێن جەعفەر زادە ی خوێندکاری زانکۆی ئەسفەهان ، هەروەها یەکێك لە کەسە نزیکەکانم بەناوی ( ئەسەدولا شەفیعزادە ) و چەند کەسێکی تریان دەستبەسەر کردوەو . لەئەنجامی لێکۆڵنەوە و دانپێدانانەکانی ئەوان سەید مەهدی هاشمی یان دەستیگر کردووە و ئێستا لەزینداندان .

فەرماندەی سەربازگەکە هەوڵیدا تێمبگەیەنێت ساواك[٢] کارەکەی ئەنجامداوە و ئایەتولا شەمس ئابادی کوشتووە ، بەڵام من لەهەموو بابەتەکاندا بووم خۆم شەفیعزادەکانم بە سەید مەهدی ناساندبوو، دەمزانی

٢- (سازمان اطلاعات و امنیت کشور) ناسراو بە ساواك دەزگایەکی سیخوڕی و هەوالگری ڕژێمی شای ئێران بوو. لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٥ ز دامەزرێنرا یەکەمین سەرۆکەکەی لیوا تەیموری بەختیار بوو، ئەم دەزگایە زیاتر لە ٨٠٠٠ ئەندامی هەبوو، پێگەی سەرەکی دەزگاکەش لە سلطنت ئابادی تەهران بوو . وەرگێڕ.

کارەکە لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە و بڕیاری لێدراوە چۆن چۆنی کۆبونەوەکانی باغەکەی حاجی ترابی دەرچەیی بەم ئاکامە گەیشتووە.

ئەوان وابیریان دەکردەوە ناڕەحەتی و غەمەکانی من بۆ دەستگیرکرانی کەسە نزیکەکانم و سەید مەهدی هاشمی یە . لە کاتێکدا وا نەبوو ، تەنها نیگەرانی من زیاتر لەبەر ئەوە بوو بە پێ ی بڕیارەکانی پێشوو دەبوو من لەهەر جێگایەك بوومایە خێرا خۆم بگەیاندایەتە قەدریجان .

ئەو بەرنامە چڕوپڕەی دانرا بوو بۆ ڕزگار کردن و هەڵهاتنی ئەوان لە زیندان بەئەنجام بگەیەنم . لەم پلان و بەرنامەیەدا جگە لەمن و سەید مەهدی هاشمی و ئایەتولا بەهەشتی و محمدی منتظری و باپیرەی کەسی تر ئاگادار نەبوو .

کاتێك بە فەرماندەی سەربازگەکە ( رائد حامد محمد سودانی ) م گووت نیازی گەڕانەوەم هەیە بۆ ئێران زۆر بە توندی بەرپەرچی دامەوە و دژم وەستایەوە و بەڕاشکاوی پێ گووتم بەهیچ شێوەیەك ناتوانی بگەڕێیتەوە و مۆڵەتی وەها کارێکت پێنادەم ، بەپێ ی بەرنامە تۆ دەبێت دەوارنی فێرکاری و ڕاهێنانەکانت بەکۆتا بێت . لەدوای بەشداریکردن لەچەند چالاکیەکی پارتیزانی کە ئازایەتی و چاونەترسی تۆ لەویدا دەردەکەوێت دەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئێران.

لە دوایی ئەو دانیشتنە دووجار هەوڵمدا لە سەربازگە هەڵبێم ، بەڵام لەهەردوو جارەکەدا شکستم هێنا و دەستگیریان کردم ، بۆ هەرجارێك پانزە ڕۆژ خرامە زیندانی تاکەکەسی یەوە ، بەهەرحاڵ دەورەکەم بەکۆتا گەیشت و ڕۆژێك رائد حامد محمد سودانی بانگی کردم و گووتی: لەگەڵ ئەوەی تۆ

خوێندەواریەکی وەهات نییە ، بەلاّم باشترین پارتیزانی ئەم سەربازگەیەیت، هەرلەبەر ئەم هۆکارە سبەی شەو ئاکامی ئەو ماندوبوون و زانیاریانەی بەتۆمان داوە دەبێت بچێتە قۆناغی تاقیکردنەوە ئامادەیت یان نا ؟

من وابیرم دەکردەوە ئەوی فێری بووم دەبێ لە سەر وەرەقە بە شێوەی پرسیار و وەلاّم تاقی کردنەوە بکەم، بۆیە گوتم بەڵێ ئامادەم ، بەلاّم کاتێك چەند خولەکێك دواتر بەڕێز ڕازی وەرگێڕی سەربازگە باسەکەی بۆ کردم بە فارسی زۆری نەمابوو توشی جەڵتەی دڵ ببم . دەبوو من سبەی شەو لەگەڵ دەستەیەکی بکوژی نەیارانی سیاسی، نۆ ئەفسەر و پلەداری سوری ڕەمی بکەم ، واتە دەستم بەخوێنی کەسانێك کە دوژمنی تایبەتی من نەبوون سور ببێت ، جگە لە بەڵێ گووتن چارەیەکی ترم نەبوو .

هەرلەو نیومڕۆ گەرمی هاوین سەید مەهدی هاشمی بە پێدانی بیست هەزار تومان من و ئایندەی منی کڕی ، دەبوو بمزانیایە لەم دونیایی پڕ چاوچنۆکی و هەوەس و ئارەزووەدا ، برا بۆ تەنها سەد تومان برای خۆیی دەکوژێت ، ئەم بەخشیشە هەزار و بیست هەزار و سی هەزار تومانیە ناتوانرێت بەبێ ئامانج و بەبێ بەرنامە و بێ مەترسی بەمن بدرێت.

من هەوڵدەدەم بەڕاستگۆیانە ئەم یادەوریانە بگێڕمەوە، هەتا ببم بە پەند و ئامۆژگاری بۆ کەسانی تر هەوڵنادەم خۆم وەك پاڵەوان نیشان بدەم ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیەکان هەرچەند تاڵ و جەرگ بڕبێت هەر دەبێت باسیان بکەم.

ئەو شەوە لە ژوورەکەی رائد حامد هاتمە دەرەوە ، هەتا بەیانی سەرگەرمی ڕاهینان و نیشانە شکاندن بووین ، تەنها بۆ ساتێکیش لە فکر و خەیاڵ

غافڵ نەدەبووم ، دەبوو سبەی لەگەڵ دەستەیەك لە بكوژی نەیارانی سیاسی بە ئامادە بوونی ( رفعت ئەسەد ) برای حافظ ئەسەد منیش دەست بۆ چەك بەرم و نیشانە لە دڵی مرۆڤێك بگرم و بیانكوژم كە نایناسم و تەنانەت بۆ یەكجاریش ئەم بینیون

ئەویش لەسەر تەنها گومانێك كە بەرپرسانی سەربازگەكە هەیان بوو ، گوایە ئەمانە دوژمنی گەلی سوریان ئەمە لە دیدگای منەوە زۆر قورس دەهاتە پێش چاو .

جارجارێك لەدڵی خۆمدا دەمگووت ، بەڵام خۆ من نەهاتووم بۆ ئەم سەربازگەیە هەتا فێری موسیقا و گۆرانی ببم ، كاتێك لەژێر كاریگەری قسەكانی سەید مەهدی هاشمی بۆ بینینی ئەم دەورە پارتیزانەیە ڕازی بووم ، دەبوو بەم زانیایە و قبوڵم بكردایە ئەو وانانەی فێربم دەبێت بكوژم هەتا نەكوژرێم ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ كوشتنێك لەوە ئاسانتر نەبوو كە خۆم لەژێر فشار و ترس دا نەبم .

نیشانە لە كەسانێك بگرم دەست و قاچیان بەسترا بێتەوە گیانیان لێ بستێنم ، سەرۆك ئەسەد دڵی وای دەخواست نەیارانی بكوژێت ، یان بە گووتەی ڕۆژنامەكان لەسێدارەیان بدات ، بەمن چی من تەنها فەرمان بەسەردا كراوێكم و زامنی بەهەشت و جەهەنەمی ئەوان نیم .

تەنها فشارێك لەسەر پیتكەی تفەنگەكە بەسە هەرئەوەندە ، مەگەر ئەم فیشەك تەقاندنە چ جیاوازیەكی هەیە لەگەڵ ئەوانی تر بەم خەیاڵانەوە شەوم ڕۆژ كردەوە . بەیانی لە دوایی چەند ڕاهێنانێكی سەرەتایی من و هەشت كەسی تر ، چوار ئێرانی و دوو پاكستانی و دوو ئینگلیز ئاگادار

کراینەوە ، بە ئامادە بوونی رفعت ئەسەد دەبێت بۆ ڕاهێنانی کۆتایی لەمەیدانی ڕەمی ئامادەبین ، دەزانم بە ناوهێنانی ئینگلیز سەرتان سوڕماوە دەبێت ئەمەش لێرەدا بڵێم لەم سەربازگەیەدا نەك تەنها ئینگلیز بەڵکو فەرەنسی و ئەڵمانی و تەنانەت چەند سپی پێستێکی ئەمریکی دەبینران ئەوان زیاتر پەیوەندیان بەو گروپانەوە هەبوو کە دژی حکومەتەکانیان خەریکی شەڕبوون .

چەندین ڕێکخراوی نێودەوڵەتی دواتر بە درێژی بۆتان باس دەکەم بەوەرگرتنی پارەیەکی زۆر لە وولآتان یان لە ڕیکخراوە ئازادی خوازەکان سەرپەرشتی ئەم سەربازگە و دەیانی تری وەك ئەم سەربازگەیە دەکرد ، یەکێك لەو کەسە ناسراوانەی لەم سەربازگەیەدا لەگەڵ من دەورەی پارتیزانی بینیوە ( بۆبی ساندەرز)[4] ی ئیرلەندی بوو لەم دوایانەدا بەهۆی مانگرتن لە خواردن لە زینداندا گیانی لە دەستدا.

کاژێر ۱ ی دوای نیوەڕۆ ڕەفعت ئەسەد لەگەڵ چەند کەسێکی سەربازی سوپای سوریا گەیشتنە مەیدانی ڕەمی ، ئەفسەر ( محمد ڕافض ) فەرماندەی دەستەی ڕەمی، ئاگاداری کردینەوە بۆ ڕاهێنانی کۆتایی ئامادەبین ، نۆ داری لە سێدارەدان لەناو مەیدانەکەدا جێگیر کرابوون ، بەهەر یەکێك لە دارەکان

---

٤- لەدایك بووی ساڵی ١٩٥٤ ز شاری بلفاست ناوەندی ئیرلەندای باکور ، سەر بە ئاینی مەسیحی کاتۆلیکی، لەتەمەنی ١٦ ساڵ بووە بە ئەندامی یەکێتی کرێکارانی ئیرلەندا. دواتر لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا بووە بە ئەندامی سوپای ئازادی خوازی ئیرلەندا، داوای چوونەدەرەوەی بریتانیای دەکرد لە خاکی ئیرلەندای باکور، لەساڵ ١٩٧٧ بە تۆمەتی هەڵگرتنی چەکی بێ مۆڵەت دەستگیرکرا حوکمی ١٤ ساڵ زیندانی بۆ بڕایەوە، لە ٥ ی ئایاری ساڵی ١٩٨١ پاش ٦٦ رۆژ مانگرتن لە خۆراك لەتەمەنی ٢٧ ساڵیدا گیانی لەدەستدا وەرگێڕ.

بۆكەڵەيەكى جل و بەرگ پەمەيى بەسترابوونەوە ، نێوانى ئێمە و بوكەڵەكان تەنها ١٥ مەتر بوو لەسەر جل و بەرگى بوكەڵەكان دروست لەوجێگايەى كە دڵى لەژێر دايە بە نيشانەى ( × ) ديارى كرا بوو ، دەبوو ئێمە نيشانەمان لە جێگا دياريكراوە بگرتايە .

ئەو رۆژە چەكە كلاشينكۆفەكانيان لێوەرگرتين و چەكێكى نيمچە ئۆتۆماتيكى ئەمريكيان پێداين بە (M ١) ناسراوە هەموو بابەتەكانى فێركردن و راهێنان لەم سەربازگەيەدا بە جۆرێك بوو هەتا زۆر بەتوندى ئێمە بخەنە ژێر فشارەوە بۆ وێنە ؛ بە ئێمەيان دەگووت ، لەبەر ئەوەى ئەم نۆ كەسە سيخوڕى ئەمريكان گوناهە بەچەكى ڕوسى بكوژرێن ، دەبێت بەچەك و فيشەكى ئەمريكى لەناوببرێن.

بە دەستورى ئەفسەر محمد رافض لەسەر ئەژنۆ دانيشتين و بە فەرمانى بيتەقێنن بەرەو ڕووى بوكەڵەكان دەستمان بەتەقەكردن كرد و لەبەر نێوان كەمى ئێمەو ئامانجەكە نيشانە گرتنەكە زۆر بەووردى كارى خۆى كرد . دواى چەند ساتێكى كەم بينيمان خوێن لە مەيدانى ڕەمى دەچۆڕێت ، دواتر زانيم ئەم كارە تەنها لەبەرئەوە بووە هەتا ترسمان لە خوێن ڕشتن نەمێنێت و هيچ پارتزانێكيش نەچێتە ژێركاريگەرى كارە ڕاستەكەوە .

لەم دواييانەدا من لە ئێران لە چوارچێوەى ئەو ڕاهێنانانەى كە بە پارتيزانەكانم دەكرد، ئەم كارانەم دوبارە دەكردەوە كيسەيەكى نايلۆنم پڕدەكرد لە خوێنى ئاژەڵ و لە ژێر جل و بەرگى بوكەڵەكان دروست لەلاى چەپ دامدەنا ، هەتا هەموو شتێك وەك ڕاهێنانێكى ئاسايى بێتە پێش چاو، ئێمە دەمانتوانى شلە مەنيەكى ڕەنگاو ڕەنگيش دابنێين ، بەلام پيان گوت

بووین دەبێت ترستان لە خوێن و خوێن ڕشتن بڕەوێتەوە ، هەرلەبەر ئەم هۆکارە بوو هەمیشە دووپات دەکرایەوە دەبێت بەدڵنیاییەوە سود لە خوێنی ئاژەڵ وەربگیرێت بۆ ڕاهێنانەکان .

چەند خولەکێك دواتر ڕەفعت ئەسەد تەوقەی لەگەڵ هەمووماندا کرد و پەسنی لێهاتووی و کارامەیەکانی کردین ، ئیتر زانیمان پیاو کوژانی نوێ کارەکەیان سەرکەوتوو بووە و نیشانەگرتن و تەقەکردنەکە زۆر بەدروستی ئەنجامدراوە.

جیاوازیەکی زۆر لە نێوان مرۆڤێك کە خاوەنی دڵێکی پڕ لە عەشق و هەزاران هیوا و ئارەزووە لەگەڵ بۆکەڵەیەکی بەدار بەستراودا هەیە . کە لەبری دڵ کیسەیەك خوێنی مانگا یان گامێش دابنرێت و گوللە بەرەو ڕووی بتەقێنی ، لەگەڵ ڕاستەیەکانی شەڕڤانی نیشانەگرتنی لە دڵی مرۆڤێکی تاوانبار یان بێ تاوان بەواتایی لە ناوچوونی دێت ، بوکەڵەیەکی بێ گیان تەنها نیشانەیەکی سەرلێشێواندنە ، بەڵام مرۆڤ ... مرۆڤێك خاوەنی سەدان هیوا و ئارەزووە و بەدەیان کەس لە چاوەڕوانی هاتنەوەیدان ، ئەویش هیوای بە دەیان کەسە ئەگەرچی تاوانباریش بێت دیسانەوە کوشتن و لەناوبردنی کارێکی سادە و ئاسان نییە.

پێم گووتبوون پێش ئەوەی ببمە هاوکاری سەید مەهدی هاشمی کاری من و باوکم قەصابی بوو ، هەندێجار ئێمە لە ڕۆژێکدا دە بۆ پانزە مەڕمان سەردەبڕی ، بەڵام ئەمە زۆر جیاوازە لەگەڵ مرۆڤ کوشتن ڕاستە من ئاشنا بووم بە خوێن و سەربڕین و قوربانی ، بەڵام مرۆڤ کوژ نەبووم دواتر لە سەرەتاکانی شۆڕش دیسان چەندین جار بەفەرمانی سەید مەهدی هاشمی

دهستم به خوێنی زۆرێك مرۆڤ ، مرۆڤی باش سوور بوو ، بەلام هەتا ئەو سپێدە دەمەی ساڵی ١٩٧٧ لە یەکێك لەسەربازگە فێرکاریەکانی دەوروبەری دیمەشق بە ناونیشانی ئەندامی دەستەی ڕەمی ئامادەیی ڕووبەڕووبونەوەی قوربانیەکانی خۆم بووم ، هێشتا دەستم بە خوێنی هیچ مرۆڤێك سور نەبوو بوو .

چەند کاژێرێك لەوەو پێش هەمووومان تەنانەت ئینگلیزەکانیش جل و بەرگی سەربازی سوریا بەهەمووو نیشانەوە لۆگۆکانیەوە پۆشیبوو ، لەناو زیلێکی ڕوسی لەچاوەڕوانیدا بووین . کاژێر ٦ ی بەیانی دونیا خەریك بوو ڕوناك دەبوویەوە لە زیلەکە دابەزین و بەرەو مەیدانی ڕەمی ڕۆشتین ، قوربانیەکان دەست و قاچ و چاویان بە داری ڕەمیەوە بەسترا بویەوە . بەڕواڵەت هەموو مەراسیمەکانی پێش لە سێدارەدان ئەنجامدرابوون ، ئێمە لە بەرامبەر قوربانیەکانی خۆمان وەستاین و بە فەرمانی سەربازی لەسەر ئەژنۆ دانیشتین . بە دەنگی بیتەقێنن دەستمان بەتەقەکرد و بەو ئاسانیە پێنج لاشە بەربوونەوە سەر زەوی و چوار لاشەکەی تر بەداری ڕەمیەکەوە مانەوە .

ئەفسەر محمد عابد رافض منی بۆ تەقاندنی گولەی کۆتایی ڕاسپارد و دیسان دەمانچەیەکی کۆڵتی ئەمریکی قورسی پێدام ، لە کۆی هەر نۆ کەسەکە دوانزە گوللەم تەقاند ، ئەویش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە سەر مێشکیان ، جگە لە دوانیا کەهەر بە یەکەمین گولله گیانیان دەرچوو بوو ، لەو کاتەدا هیچ هەستێکی تایبەتم نەبوو نە نارەحەت بووم نەپەشیمان ، لەم دوایانەدا کاتێك خۆمان لە ئێرانی خومەینیدا ئەم کارانەمان دەکرد ئینجا زانیم هۆکاری هەڵبژاردنی من لە دەستەی ڕەمی و ڕاسپاردنم بۆ

تەقاندنی گوللەی کۆتایی چی بووە ؟ لەڕواڵەتدا کەسانێکیان هەڵدەبژارد هیچ هەست و سۆزێکیان نەبێت و پیاو کوشتن و خوێن ڕشتن ئاسانترین کاربێت بەلایەوە .

من یەکێك بووم لەو کەسانەی لە کوشتن و خوێن ڕشتن نەدەترسام ، بەرپرس و ڕاهێنەرانی سوری لە ناو زیاتر لە چوارسەد کەسی ئەو فێرگە سەربازیە کە بۆ بینینی خولی پارتیزانی هاتبوون منیان بەخاوەنی ئەو سیفەتانەوە ناو دەبرد.

لەدوای کۆتایی هاتنی مەراسیمەکە ، ڕاهێنەران و بەرپرسەکانی فێرگە سەربازیەکە دەست خۆشی و پیرۆزبایان لێکردن ، لەبەرئەوەی باش ئەرکەکەمان ئەنجام داوە . نازانم لەوانەیە خۆشحاڵی سەربازە سوریەکان لەبەر ئەوە بوبێت کە نەفامتر لە ئێمە لەم دونیایەدا بوونی نەبێت ، چونکە بەجێگای ئەوان دەکوژین هەتا دەستی ئەوان بە خوێنی هاونیشتیمانیەکانی خۆیان سور نەبێت.

بەهەرحاڵ ڕووداوی گوللەبارانکردنی نۆ ئەفسەری سوری و پژاندنی مێشکیان ، یەکەمین ئەزموونی مرۆڤ کوشتنی من بوو . ئەزمونێك لەم دوایانەدا چەندین جار دووبارە بوویەوە ، بەڵام جیاوازتر لە ئەزموونی یەکەمم ، نیشانەگرتنەکانی ئەمجارە زیاتر دڵ و مێشکی هاونیشتیمانیەکانمی بە ئامانج دەگرت.

دوای تەواو بونی دەورەکەم ڕائد حامد محمد سودانی و زۆرێك لە ڕاهێنەرەکانی تر هەوڵی زۆریاندا لەوێ بمێنمەوە و لە یەکێك لە یەکە پاتیزانیەکان کە هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی ئیسرائیل سەرگەرمی

کارکردن بم ، بەلاّم من خۆمم لیّ دەدزینەوە و هەمیشە دلّم وای دەخواست هەرچی زوترە بگەڕێمەوە بۆ ئێران و دایك و باوکم ببینم و پلانی ڕفاندنی سەید مەهدی هاشمی و شەفیعزادەکان لەزیندان بەئەنجام بگەیەنم. هەروەها ئەو بەڵێنەی سەید مەهدی دابووی کەمانگانە سی هەزار تومان بخاتە سەر ئەژمارە بانکییەکەم لەدوای دەستگیرکردنی ئیتر هەواڵێك لە بەڵێنەکەی هەیە یا نا؟ ئەو ڕۆژەی فڕۆکەخانەی دیمەشقم بەرەو پاریس بەجێهێشت ، ئیتر ئەو جەعفەری شەفیعزادە قەدریجانەیە قەصابەی جاران نەبووم ، ئێستا ترسم لە زیندان و بریندار‌بوون و تەقینەوە و وێرانکاری نەماوە .

تەنانەت گیان کێشانی مرۆڤی بێتوانیش دلگرانم ناکات، کاتێك لەناو دەرونی فڕۆکە سوریەکە دانیشتم و فڕۆکەکە هەتا قولاّیی ئاسمان فڕی هەستم دەکرد سەربازێکم ، ئەفسەرێکم ، تەنانەت ژەنراڵێکم، ئەمانە لە فێرگە بگویّ مانیاندا خوێندبوو ، بەلاّم لەم دوایانەی شەڕی بێهودەی عێراق و ئێران تێگەیشتم هەرچی ئەوانی پێمان گوترا بوو تەواو پێچەوانەیە ، سەربازەکان پیاو کوژ نین زانیم هیچ سەربازێکی بەشەرەف حەز بە شەڕ ناکات ، سەربازەکان ئاشتیان خۆش دەوێت ، بۆیە هونەرەکانی سەربازی فێردەبن هەتا ئاشتی و ئارامی بهێنە کایەوە .

زانیم کوشتن ، وێرانکردن ، تیرۆرکردن و ئەشکەنجەدان کاری تیرۆرستەکانە و بەهەڵە پۆشاکی سەربازی لەبەر دەکەن ، منی بەردەستی قەصابێك تەنانەت نەمتوانی بوو بچمە ئامادەیی نەك تەنها سەرباز نەبوو بەڵکو شێت و خراپەکار و بیّ هەست بووم کە ئەوانی تر لەبەر خاتری بەرژەوەندیەکانیان یاریم پێدەکەن.

له ڕوداوەکانی ئەم دوایانەی سەرەتای شۆڕشی ئێران تێگەیشتم لەبەر خاتری پارە باوەڕم ، خۆم ، شەرەف و ئیمانم ، بنەماڵەکەم ، نیشتیمانەکەم ، هەموو ئەو شتانەی هەمبوون کردە قوربانی چاوچنۆکی و ئامانج و ئارەزووی مەلا بێ ئابڕووەکان ، بەهەرحاڵ ئەو نیوەڕۆ گەرمەی بە فڕۆکەی سوری دیمەشقەم بەرەو پاریس جێهێشت ، سەراپا لەناو لەخۆبایی بوندا نغرۆ بووببوم هەزاران پلان و نەخشەم هەبوو خەیاڵم دەکرد هەر بە گەیشتنمەو بۆ ئەسفەهان هەموو بەرنامە و پلانەکانم جێ بەجێ دەکەم و لەم ڕێگایەوە نەك تەنها سەید مەهدی هاشمی و کەسە نزیکەکانم لەزیندان ڕزگار دەکەم ، بەڵکو بەبڕینی بانکەکان و بە ترساندنی ئەو سامان دارانەی لە ئەسفەهان دەمناسین خۆم وئەوانی تر دەڵەمەند دەکەم.

کاتێك لە فڕۆکەخانەی ئۆرلی پاریس دابەزیم بۆ وەرگرتنەوەی جانتاکانم خەریك بوو نهۆمی یەکەمی بینای فڕۆکە خانەکەم جێ دەهێشت ، لەتەنیشت غولام عباس تەوەسولی سێ کەسی ترم بینی چاوەڕێ ی منیان دەکرد ، ئەوانم هەرگیز نەدیبوو ، بەڵام ئەوان ئەمڕۆ خاوەن ناوبانگێکی نێودەوڵەتی گەورەن . (صادقی قطب زادە ، ئەبوالحسن بنی صدر ، حەسەن ئیبراهیم حەبیبی) تازە ناسراوەکانی من بوون.

کاتێك بە ئۆتۆمبێلێکی پژۆ کە صادقی قطب زادە لێدەخوڕی و بەرەو شاری پاریس کەوتبوینەڕێ تەوەسولی بۆی باسکردم ناردنی من بۆ فێرگە سەربازیەکەی دیمەشق بە هەوڵ و کۆشش و هاوکاری قطب زادە بووە.

هاوڕێ لەگەڵ ئەوان ڕۆشتین بۆ نوسینگەکە قطب زادە ، لە پاریس شەقامی ١٧ کلیشی ، داوی تێپەڕبوونی ماوەیەك ئینجا زانیم ئەم نوسینگەیە

لەناوچەیەکی نەخوازراوی پاریسە بەناوی پیگال ، قطب زادە پلەی بۆیەکی بەرواڵەت موسڵمان بوو ، ئەم نوسینگەیەشی بۆ پەیوەندیە سێکسیەکانی لەگەڵ سۆزانیەکانی پاریس و بلاو کردنەوەی ئەو تریاکانەی لە ئێرانەوە سەید مەهدی هاشمی بۆی دەنارد و لە دۆسلفدۆر لەلایەن صادق طباطبایی بەدەستی دەگەیشت بەکار دەهێنا ، دواتر ڕوداوەکانی پەیوەندی دار بەم بابەتەوە بەوردی بۆتان باس دەکەم.

هەرجۆرێك بێت ، پێش ئەوەی بچینە ناو نوسینگەکەی قطب زادە زەنگی تەلەفۆن لێی دا ، تەنانەت پێش ئەو چا یەش بخۆێن کە حەبیبی لێ ی نابوو ، قطب زادە تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و لەدوای هەواڵپرسینێکی تەواو تەلەفۆنەکەی دایە دەستی من و گوتی قسەبکە ، تەلەفۆنەکەم لێ وەرگرتوو بەسەر سوڕمان و بڕوانەکردنەوە دەنگی داودی مێری خوشکمم بیست ، هەر ئەوکەسەی لەجێگای من لەگەڵ باوکم کاری قەصابخانەکە بەڕێوە دەبات ، زۆر خۆشحاڵ بووم ، داود گوتی : لەگەڵ دایك و باوکم بۆ زیارەت چونەتە مەشهەد و ئێستا لە تەهرانن و شەو بەرەو ئەصفەهان بەڕێدەکەون .

دواتر قسەم لەگەڵ دایك و باوکم کرد و باوکم گووتی : بەڕێز پەروەرش هەموو مانگێك دێت بۆماڵمان و لەلایەن تۆ وە دەهەزار تومان مان پێدەدات چی لەو پارانە بکەین ؟ لە باوکمم پرسی هیچ پەیامێکی ترتان پێنادات ؟

باوکم گوتی بۆچی ، گوتویەتی ئەگەر تۆ تەلەفۆنت کرد پێت بڵێم ئەمانەتیەکە گەیشتۆتە دووسەد هەزار تومان ، بەبیستی ئەم هەواڵە هێندە خۆشحاڵ بووم خەریك بوو باڵم دەگرت ، چوار مانگ لە دیمەشق بووم . ئێستا جیا لەوەی مانگی دە هەزاریان بە باوکم داوە ، خۆشم دوو سەد هەزار

پارەی کاش لە ئەژمارە بانکیەکەم دایە ، بە باوکمم گوت ئەو پارەیە خاوەنەکەی تۆ دایکمن خۆتان سەربەستن هەرجۆریك دەتانەوێت خەرجی بکەن .

باوکیشم گاڵتەی لێ پژا بوو لە خۆشحاڵیدا پێ دەکەنی ، دایکیشم لەوەی کوڕەکەی خەریکە دەوڵەمەند دەبێت شوکر و سوپاسی زەوی و ئاسمانی دەکرد . بەتایبەتی تر لەوە خۆشحاڵ بوو پارەی سەفەرەکەیان بۆ مەشهەد ئایەتولا طاهری بۆی دابین کردون . دایکم پێ ی گووتم ئایەتۆلا طاهری حەزیکرد پێت بڵێم خەوی بینیوە و حەزرەتی ئیمام ڕەضا هاتوەتە خەوی و پێ ی گوتوە لەبەر خاتری ئەو خزمەتانەی جەعفەر بە ئیسلامی دەکات دەبێت دایك و باوکی بچن بۆ زیارەت .

لەیەکەمین کاژێرەکانی چونە ناو پاریس ئەمانەی پێم گوتران هەموویان هەواڵی باش و دڵخۆشکەربوون ، دیسان لەگەڵ داود قسەمکردوو پێمگووت مانگی هەزار تومان لە باوکم وەرگرێت دوبارە باوکم تەلەفۆنەکەی گرتەوە دەست ، گووتی : مەسەلەکەی بەڕێز هاشمی دەزانی؟ گووتم بەڵێ!

گووتی: ئەگەر دەتوانی ماوەیەکی تر لەوێ بمێنەوە هەتا ئەم بابەتە بەلایەکدا دەکەوێت هەرچی درەنگتر بگەڕێیتەوە باشترە.

کاژێرێك دواتر ، لەگەڵ قطب زادە و بنی صدر و حبیبی دەستمان بەگفتو گۆ کرد . دواتر بۆم ڕوون بویەوە کە بۆچی دایك و باوکم تەلەفۆنیان بۆ کردووم ، ئەوان وابیریان دەکردەوە دەمەوێت بەپەلە بگەڕێمەوە بۆ ئێران لەبەرئەوە کە نەدەبوو بگەڕێمەوە دوایان لە پەروەرش کردبوو دروست ئەو ڕۆژەی من لە دیمەشق دەگەڕێمەوە گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی ڕێکبخات و

ئەوانیش لەوێ بن ئامۆژگاریم بکەن بۆ نەگەڕانەوەم ، ڕاستت دەوێت بابەتەکانی تر بۆم گرنگ نەبوو تەنها ئەوە بەلامەوە گرنگ بوو پارەکان بەڕێك و پێکی خرابێتە سەر ئەژمارە بانکیەکەم و باوك و دایکم و نزیکەکانم خۆشحاڵ و سەرەحاڵ ببینم.

پاریسیش جێگایەك نەبوو مرۆڤ خراپی لێ بگوزەرێت ، دانیشتنی ئەو ئێوارەیەم لەگەڵ تەوەسولی و قطب زادە و بنی صدر و حەبیبیی هەتا کاژێر ۱ ی شەو درێژەی کێشا ، بڕیاربوو تەوەسولی بەیانیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئێران ، لەو ماوەیەی من لە دیمەشق بووم ئەو سێ جار چوو بووە تەهران و گەڕابویەوە. ئەو شەوە خاوەن ماڵە پاریسیەکە میوانداریەکی باشی لێ کردین.

پێ یان دەگووتم هەرئەوەندەی پێ بخەیتە خاکی ئێران بەتۆمەتی بەشداریکردنی لە کوشتنی ئایەتولاَ شەمس ئابادی دەستگیر دەکرێیت ، باشترە ماوەیەك لەپاریس بیت نزیکەی پانزە بۆ بیست ڕۆژی تر هاوڕێ لەگەڵ قطب زادە سەفەرێك بۆ لیبیا دەکەیت.

بۆمن جیاوازی نەبوو لەکوێ بم ، ئێستا سوارچاکی سەرمەستم لە قەصابی ڕزگارم بووە و لەگەڵ مرۆڤە گەورە و گرنگەکان خەریکی کارم ، تەنها پرسیارێك کردم ئەوە بوو من لێرە یان لە لیبیا پارەم نیە و دەبێت لە ئێرانەوە پارە بهێنم .

قطب زادە پێکەنی و ئاماژەیەکی بە حەبیبیی داو دواتر حەبیبی گووتی : بەیانی لەگەڵ بەڕێز سەلامەتیان دەچیت بۆ بانك و ئەژمارێکی بانیکت بۆ

دەکاتەوە ، هەتا لێرمیت لەبارەی پارەوە هیچ کەموکوڕی و کێشەیەکت بۆ نایەتە پێش ، لە لیبیاش دەبیتە میوانی ژەنراڵ قەزافی .

ئێستا هەموو شتەکان بۆ من وەك گاڵتەی لێهاتووە ، بەڵام ئەگەر ئێوە بۆ تەنها جارێك خۆتان بخەنە جێگای من لەوانەیە دوچاری هەمان بارودۆخ بن کە من تێ ی کەوتووم .

شاگردی قەصابێکی قەدریجان لەناکاو بووە بەو مرۆڤەی سەفەر بۆ پاریس و سوریا و لیبیا دەکات ، کەسێك لە جەندرمەیەکی ئاسایی قەدریجان دەترسا ، بەهەزار شێوە دەستی بەسنگیەوە دەگرت و کڕنوشی بۆ دەبردن ئێستا لەپڕ سەفەر دەکات بۆ لیبیا دەبێتە میوانی سەرۆك کۆماری ئەو وولاّتە ، ئەم گۆڕانکاریە گەورانە هەموو کەسێك دووچاری لە خۆبایبوون دەکات ، بەڵام لەوانەیە من زیاتر گیرۆدە بووبم.

ئەو شەوە ، شەوی گەیشتنم بە پاریس هەرلەوێ لە نوسنگە کەی قطب زادە پشووم دا . قطب زادە گوتی ، ئەم ژوورە ئیتر هی تۆیە هەتا ئەو ڕۆژەی لە پاریسیت ئێرە ماڵی تۆیە .

نوسینگەکەی سێ ژووری تێدا بوو دوو ژووریان مێز و کورسی و ئامێری تایپ ی لێ بوو ژووری سێ یەم ژورێکی نوستنی تەاوو بوو . کاژێر ٩ ی بەیانی کاتێك گوێم لە دەنگە دەنگ بوو لەخەو هەستام ، وا بیرم کردەوە درەنگ کەوتووم و تەواوی هاوڕێیانی دوێنێ شەو و فەرمانبەرانی نوسینگە کە هاتوونەتە سەرکار و سەرگەرمی کارکردنن .

هەر لەبەر ئەمە دەرگای ژورەکەم هەتا نیوە کردەوە ، کاتێك کچێکی بالآ بەرزی پرچ ئاڵتونی لە ژوورەکەی بەرامبەرم بینی سەرگەرمی ئامادەکردنی نانی بەیانی بوو تەواو سەرم سوڕما ، دەرگاکەم داخست و کەمێك خۆم رێك کرد و بیرم لەوە دەکردەوە چۆن چۆنی قسە لەگەڵ ئەم ئافرەتە فەرەنسی یە بکەم ، لەکاتێکدا من جگە لە زمانی فارسی ئەویش بە شێوەزاری نەجەف ئابادی ، لەگەڵ ئەو تۆزە عەرەبیەی لە سوریا فێر بووم هیچ زمانێکی تر نازانم، هەر لەبەر ئەمە بڕیارمدا هەر لە ژوورەوە بمێنمەوە هەتا قطب زادە یا هەرکەسێکی تر فارسی زمان دێتە ژورەوە.

لەسەر سیسەمەکە دانیشتم هەر بیرم لە کێشەی نەزانینی زمان دەکردەوە ، لەناکاو دەرگای ژورەکە کرایەوە و هەر ئەوکچە شۆخە پرچ ئاڵتونیە فەرەنسی یە بە زمانی فارسی سلآوی لێکرم ئەڵبەتە بە فارسیەکی رەوان منیش سلآوم لێکرد . گوتی ؛ نانی بەیانی ئامادەیە ، چومە ژورەکەی تر و لەگەڵ ئەو دەستم بە خواردنی نانی بەیانی کرد .

دواتر بۆم رون بویەوە شەش ساڵە کار بۆ قطب زادە دەکات و فارسیەکی باشیش دەزانێت . ناوی بئاتریس بوو ، زۆر هەوڵمدا و ڕاهێنانم کرد هەتا ناوەکەی فێر بووم .

کاژێر ١١ ی بەیانی قطب زادە و حەبیبی و سەلامەتیان هاتن و دوای کەمێك هەواڵ پرسین پێیان گوتم لەگەڵ سەلامەتیان بەشوێن کارەکانمدا برۆم ، بەر لە بەجێهێشتنی نوسینگەکەی قطب زادە سەلامەتیان لەبەرچاوی ئەوان پێنج هەزار فرەنکی فەرەنسی بەناوی پارەی گیرفان پێدام و گوتی؛ دوای

ئەوەی ئەژمارەکەمان بۆ کردیتەوە دە هەزار فرەك دەخەمە سەر حسابەکەت و هەتا دواتر بزانین چی دەبێت.

هەر لە ژێر ئەو بینایەدا لقێکی بانکی کارتی لیۆن ی لێبوو ، سەلامەتیان هەر لەوێ ئەژمارە بانکیەکەی بۆ کردمەوە و دواتر هەر لەو نزیکانە چووینە چەند دوکانێکی جل و بەرگ و دوو دەستە جلی پاریسی بۆ کڕیم ، لەگەڵ سەلامەتیان زۆر ئاسودە بووم چونکە ئەسفەهانی بوو . دەمانتوانی چەندین کاژێر پێکەوە دەربارەی ئەسفەهان و ئەو کەسانەی دەماننناسین قسە بکەین ، کاژێر ٣ ی دوای نیوەڕۆ سەلامەتیان هەتا نزیکی نوسینگەکەی قطب زادە هاوڕێیەتی کردم ودواتر ڕۆشت ، چونکە خۆی کاری هەبوو ، گوتی : سبەی بەیانیەکەی دێم بە دواتدا .

بۆ یەکەمجار لە پاریس خۆم بەتەنهایی بینی ، بیرم کردەوە تۆزێك بگەڕێم و پیاسە بکەم و بەم دەوروبەرە ئاشنابم ، کەمێك چومە سەرەوە خوارەوە دوکانەکانم بینی و دواتر لە ترسی ئەوەی نەوەك وون ببم گەڕامەوە ، کاژێر نزیکەی ٤ ی دوای نیوەڕۆ بوو ، چومە ناو بیناکەوە هەتا بە ئاسانسۆر خۆم بگەیەنمە نهۆمی چوارەم، بەو کلیلەی قطب زادە دوێنێ شەو پێیدا بووم دەرگاکەم کردەوە و ژورەوە کەسی لێ نەبوو لە کاتێکدا دەنگی گۆرانیەکی عەرەبی خاتوو فیروزەی گۆرانی بێژی مصری دەهات. منیش بەدەنگی بەرز دەمگوتەوە ، دەرگای ژووری نوستنەکەم کردەوە و ئەوەی کە بینیم زۆری نەمابوو دڵم ڕاوەستێنێت.

قطب زاده تەنها شۆرتێکی شینی لەپێدا بوو لەسەر سیسەمەکە ڕاکشابوو بناتریسیش ڕووت و قوت هیچی لەبەر دانەبوو خۆی چەماندبویەوە هەتا چەرخەکەی لە ئەرزەکە هەڵبگرێت بۆ ئەوی جگەرەکەی داگیرسێنێت.

شەرمەزار بووم و خەریك بوو دەگەڕامەوە قطب زادە گوتی : بۆ کوێ ؟ وەرە ژورەوە ! ئێرە ئەوروپایە....

لەکاتێکدا هێشتا لە سەرسوڕمانیدابووم بناتریس هەستایەوە و بێ ئەوەی شەرم بکات بەڕووتی بەرەولای من هات و چوار جار ماچی ڕوخساری کردم ، بە پێکەنینەوە گوتی: بۆچی شەرم دەکەیت ؟

لەوانەیە باوەڕنەکەن ، ئەوە یەکەمین جار بوو ئافرە ت بەڕووتی ببینم ، ئەوان ڕووت بوون و من شەرمم دەکرد . سەرم شۆڕکردبویەوە و قطب زادە و پاتریس بێ پچڕان پێدەکەنین دواتر قطب زادە بەفەرەنسی شتێکی پێ گووت و پاتریس لە ژوورەکە ڕۆشتە دەرەوە ، قطب زادەش خەریکی پۆشینی جل و بەرگەکانی بوو ، کاژێرێك دواتر هەموو شتێك ئاسایی بوویەوە و هەر نەتدەگووت هیچ ڕوویداوە پاتریسی جوان و شۆخ و شەنگ جل و بەرگی لەبەر کردبوویەوە و لەپشت مێزی کارکردنەکەیەوە دانیشت بوو .

من و قطب زادە لەگەڵ حەبیبی کە تازە لەڕێگاوە گەیشتبوو ، دەستمان بە گفتوگۆ کرد و زۆربەی قسەکان زیاتر لەبارەی فێرگە سەربازیەکەی دیمەشقەوە بوو ، ئەوان هەوڵیان دەدا قسە لەمن دەربهێنن و لەبارەی

فێرگەکەوە زانیاریان دەست بکەوێت، منبش بۆم گرنگ نەبوو هەرچیەکیان دەپرسی بەڕاستگۆییەوە وەڵامم دەدانەوە .

ئەم جۆرە گفتۆگۆیانە هەتا چەند و چەندین ڕۆژ بەردەوام بوو . لەو بیست ڕۆژەی سەرەتایی مانەوەم لەپاریس تەنها یەکجار لەگەڵ سەلامەتیان چومەدەرەوە ئەویش بۆ کردنەوەی ئەژماری بانکی و وێنەگرتن و جل و بەرگ کڕین بوو ، ئیتر زۆربەی کاتەکانم لەگەڵ قطب زادە لە عەیش و نۆشدا بەسەر دەبرد.

بە پێشنیاری قطب زادە پاتریس یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی پێناساندم ناوی پاتریسیا بوو . بۆئەوەی فێری فەرەنسیم بکات بەڵام هەر لەیەکەم دانیشتنی سەرەتاوە کاری ئێمە بە عەشقبازی و خەوتن پێکەوە دەستی پێکرد . ئەگەرچی لەکۆتاییدا فێری هەندێ ووشە و ڕستەی فەرەنسی بووم ، بەڵام زۆربەی کاتەکانمان لە نایت کلاَپ و بارەکانی پاریس و دەوروبەری بەسەر دەبرد .

هەندێ لە ڕۆژەکان من و قطب زادە جارجارێکیش لەگەڵ سەلامەتیان دەچووین بۆ فڕۆکەخانەکەی تری پاریس فرۆکەخانەی شارڵ دیگۆڵ لەو گەشتیارانەی لە لەندەن یان دوسلفدۆرەوە دەهاتن ، چەند بەستەیەکمان بەناوی ئەمانەتیەوە وەردەگرت ، نزیکەی پانزە بۆ بیست لولە تریاکی تێدا بوو مەوادە سڕکەرەکە کڕیاری تایبەتی هەبوو. یەکەمجار لەگەڵ قطب زادە یان سەلامەتیان ئەوانمان بە کڕیارەکان دەدا ، بەڵام دواتر خۆم بەتەنیا ئەو کارەم دەکرد.

یەكێك لە كرپارە بەردەوامەكانی ئێمە سەید جلال تەهرانی بوو . لەكۆتایەكانی دەستەلاتی شاهنشاهی كرا بە سەرۆكی شورای سەلطنت دواتر لەسەفەرێكیدا بۆ پاریس بەو پلانەی بۆیان دارشتبوو ناچار كرا نامەی دەست لەكار كێشانەوە پێشكەشی خومەینی بكات. هەركە كاتی هات لەبارەی بەسەرهاتەكەی ئەو و سنجابی دەدوێم .

قطب زادە خۆی تریاكی نەدەكێشا ، بەلاّم ئالودەی مەشروب و پەیوەندی سێكسی بووبوو ، بەتایبەتی لەگەڵ ژنە وێڵ گەردەكانی پاریس ، یەكێك لە بەرنامە بەردەوامەكانی قطب زادە و حەبیبی دواتر منیشیان بۆ زیاد بوو رۆشتن بۆ سینەما و بینینی فیلمی سێكسی ، لەسەرەتادا حەزم لێنەدەكرد ، بەلاّم وردە وردە منیش ئالودەی بینینی بووم .

ئەگەر رۆژێك لەنێوان كاژێر ٢ یان ٤ ی دوای نیوەرۆ نەچووباین بۆ سینەماكانی دەوروبەری پیگال تورە بوون و بێزاریمان پێوە دیاربوو . لەدوای هاتنە دەرەوە لە سینەما دیار بوو قطب زادە ئەوەی دیبووی و فێری بوو بوو لەگەڵ بائتریس ئەنجامی دەدا و منیش لەگەڵ پاتریسیا ، بەلاّم چونكە حەبیبی لەگەڵ كچێكی ئێرانی خۆشەویستییەك بوون نە بەئێمەی دەناساند و نە لەدوای هاتنە دەرەوە لە سینەما دەچوو بۆلای ، ئەو راستەوخۆ لەگەڵ ئێمە دەهاتەوە بۆ نوسینگە .

لەوەها بارودۆخێكدا كە گومانم وابوو لەهەموویان زیاتر خۆشم لێدەگوزەرا ، رۆژێك قطب زادە ئاگاداری كردمەوە بەزووی و بەبێ دواكەوتن بچین بۆ لەندەن و هەتا لەوێوە بەرەو لیبیا بەرێبكەوین.

ڕۆژێك بەیانیەکەی لەگەڵ قطب زادە بەرەو لەندەن چووین. لە فرۆکەخانەی هیث رو لەندەن سێ کاژێر لە چاوەڕوانیدا ماینەوە ، دواتر بە فڕۆکەیەکی لیبی بەرەو طرابلس بەڕێکەوتین. ئەو شتەی بۆ من زۆر نامۆ بوو ئەوە بوو خزمەتگوزارێکی فڕۆکەکە چرپاندی بەگوێ ی قطب زادە دا و لەجێگای خۆیدا هەستاو لەگەڵی ڕۆشت بۆ کابینەی فڕۆکەوانەکە ، ئەمە یەکەمینجار بوو من لەبەر قەدر و ڕێزی هاوسەفەرەکەم لە کورسی پێشەوەی فڕۆکە دابنیشم.

زۆر سەرم لەو میوانداریە چاوەڕواننەکراوە سوڕما ، پاش کەمێك قطب زادە گەڕایەوە و زیاتر لە جاران خۆشحاڵی پێوەدیار بوو ، کاتێك فڕۆکەکە لە طرابلس نیشتەوە هیچ هەواڵێك لە ڕۆشتن بۆ بەشی گومرگ و کۆنترۆڵی پاسپۆرت نەبوو . هەرکە لە فڕۆکەکە دابەزین چاومان بە ئۆتۆمبێلێکی مارسیدرس بنزێکی ڕەش کەوت لە نزیك پلەکانەکانی فڕۆکەکە وەستا بوو ، هەر بەو ئۆتۆمبێلە لەگەڵ قطب زادە و چەند کەسێکی سەربازی لیبیی و دووکەسی مەدەنی لە فڕۆکەخانەوە بەرەو جێگایەکی نادیار بەڕێکەوتن. سێ ئۆتۆمبێلی جیپ ی سەربازی و ئۆتۆمبێلێکی فریاکەوتن بە دوامان کەوتبوون .

ڕەفتاری لیبیەکان لەگەڵ قطب زادە لە ئاستی پێشوازیکردن لە سەرۆك کۆماری وولاتێکدا بوو ، ئەڵبەتە ئەمانە بە ئاگادار لەوەی لەم دوایانەدا فێربووم دەیلێم ، ئەگەرنا ئەو ڕۆژانە ئەو چالاکیانەی ئێمەی بەخۆیەوە سەرگەرم دەکرد ، زۆر جیاواز بوو لەو کایە دبلۆماسیانەی قطب زادە و ئەوانی تر خەریکی بوو .

لیبیا هەر لەسەرەتایی تێڕوانینی من هێندە نەچووو بە دڵمدا . وابیرم دەکردوە لیبیا وڵاتێکی زۆر ئاوەدانە ، بەڵام بە دیدی من ئەوەی لەوکاتەدا بینیم تەنها شارێکی بچووك بوو تازە لە لادێ دەرچووو بوو ئەوەی لەپاریس و دیمەشق لەبارەی ئەم وولاتەوە پێم گوترابوو زۆر جیاواز بوو.

ئێمەیان بردە هۆتێلێکی ئەمریکی ، ناوەوەی زۆر لە دەرەوەی جیاواز بوو . دەرەوەی هۆتێلەکە هەر لە لادێ دەچوو بەڵام ناوەوەی هۆتێلەکە شکۆ و جوانیەکی هەبوو تەنها لە هۆتێلەکانی پاریس لەگەڵ قطب زادە و پاتریسیا بینی بووم .ئەو چەند ساتەی چاوەڕێ بووین هەتا ژمارەی ژوورەکانمان دیاریدەکرێت هێندە ئەمریکم بینی گومان دەکەم پێگەی ئەمریکیەکان لە ئەسفەهان هێندە ئەمریکی لێبێت . چەند ساتێك بیرم کردەوە بۆ هەمووان درۆدەکەن مەلاکان لە دەستی فسق و فجور ئەناڵێن ، بەڵام خۆیشیان لە میوانیەکەی باغی حاجی ترابی دەرچەپی خەریکی ڕابواردنن خالخالی سەما دەکات ، صانعی فلوت لێدەدا و ئەوانی تریش نغرۆ بوون لە مەستی و مەی خواردنەوە ، قەزافیش بەیانی هەتا ئێوارە لەدەستی داگیرکەر هاوار دەکات کەچی وڵاتەکەشی لیوان لێوە لە یانکی[٥].

وەك جاران خەیاڵەکانم زۆر درێژەی نەکێشا ، قطب زادە بە گوتنی ڕستەی دەی با بڕۆین کۆتایی بە دونیای پرسیار و وەڵامەکانم هێنا ، ژوورەکەی من

---

[٥] یانکی = ناوێکی کورتکراوەیە بۆ سوکایەتی کردن بە ئەمرکیەکان بەکاردێت . وەرگێڕ

و قطب زادە لە تەنیشت یەك بوو ، ئەڵبەتە ژوورەکەی ئەو زۆر بەشکۆ بوو لە دوو بەش پێك دەهات ، لە بە شێکیان دەنوست و بەشەکەی تر هۆڵێکی گەورەی میوانداری بوو . ژورەکەی منیش شیاو ڕێك و پێك بوو ، بەڵام بەشی دووەمی نەبوو.

پێش ئەوەی جانتاکانمان بکەینەوە ، قطب زادە گوتی، دەچم بۆ بینینی عبدالسلام جلود پیاوی ژمارە دوو ی لیبیا، بەمنی گووت لەبارەی تۆوە خەیاڵم ناسودەیە ، چونکە عەرەبی دەزانیت هەرکاتێك بتەوێ دەتوانی بچیتە ڕیستۆرانتی هۆتێلەکە ، بەڵام زۆر قسە لەگەڵ کەس مەکە . ژەنراڵ قەزافی ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە زۆر قسە دەکەن و دەنگە دەنگ دەنێنەوە ، هەتا دەتوانی بخۆ و بخەوە بەیانیش زوو تر لە کاژێر پانزەی بەیانی هەڵمەستە ، چونکە لەوانەیە من شەو درەنگ بێمەوە و بمەوێت بخەوم .

قطب زادە دیسان هەندێکی تر ئامۆژگاری کردم و گوتی ئێرە نە پاریسە و نە دیمەشق دەبێت زۆر ئاگاداری خوت بیت .

ڕاستت دەوێت پایتەختەکەی ژەنراڵ قەزافی وەها دابووی بە ناو زەوقمدا جگە لە خەوتن هیچ بەرنامەیەکی ترم نەبوو .

کاتێك قطب زادە ڕۆشت لەسەر سیسەمەکە ڕاکشام و کەوتمە بیری پاتریسیا ، چونکە پانزە شەو لەسەر یەك پێکەوە بووین . سبەی کاژێر ٦ ی بەیانی لەخەو هەستام و قسەکەی قطب زادەم کەوتەوە یاد کە گوتبووی لەوانەیە شەو درەنگ بگەڕێمەوە لەجێگای ئەوەی بەشوێنیدا بڕۆم ، ڕۆشتم بۆ هۆڵی

نانخواردن هەتا بە تەنهایی یەکەمین نانی بەیانی لە لیبیا نۆشی گیان بکەم . هۆڵی نانخواردنەکە شەپۆلی دەدا لە ئەمریکی لەسەر مێزێك دانیشتم و داوای نانێکی تێر و تەسەلی بەیانیم کرد ، نانێك ئەگەر بڕیار بوایە خۆم پارەکەیم بدایە ئەوا لە قوڕگمدا گیری دەکرد و نەدەچووە خوارەوە ، بەڵام لەو ماوەیەدا ئەوە فێر بووم کاتێك بڕیار نیە خۆم پارەیەك بدەم دەبێت خۆم گەورە نیشان بدەم هەتا لەلای خانەخوێ گەورەتر و گرنگتر بێمە پێش چاو و وەك لۆردێك ڕەفتارم لەگەڵ بکرێت ئەمە قطب زادە فێری کردبووم .

سەرگەرمی خواردنی نانی بەیانی بووم بڵندگۆی هۆتێلەکە یەکەمجار بە عەرەبی و دواتر بە ئینگلیزی شتێکی گووت ، هیچی لێتێنەگەشتم تەنها ناوی خۆم نەبێت . نانەکەم بە تەواو نەکراوی جێهێشت و بەرەو شوێنی پێشوازی هۆتێلەکە ڕۆشتم بەسەر سوڕمانەوە قطب زادە و دوو ئەفسەری لیبیم بینی چاوەڕێی منیان دەکرد ، قطب زادە گوتی ، چەند ساتێك لەوە و پێش تەلەفۆنی بۆ ژوورەکەم کردووە و وەڵام نەدراوەتەوە و نیگەرانم بووە .

گووتم ، سودم لەکاتەکە وەرگرتووە و لەبەر ئەوەی زوو لەخەو هەستاوم وابیرم کردەوە هەتا تۆ هەڵدەستیت نانی بەیانی خۆم بخۆم ، قطب زادە پێکەنی و گوتی کەواتە هەمووومان پێکەوە دەیخۆین

بەمشێوەیە هەمووومان گەڕاینەوە سەر مێزی نانخواردن و ئەوانیش داوای نانی بەیانیان کرد.

قطب زاده دوای کەمێك گاڵتە و گەپ کەکاری هەمیشەیی بوو ، لەوکاتەدا بڕی هەزار دۆلاری پێدام و پێی گووتم ناچارە بۆ هەفتەیەك بچێت بۆ دیمەشق و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ لیبیا ، گووتم : منیش لەگەڵ تۆ دێم ؟ گووتی: نا لێرە ئیشیان بەتۆ هەیە کارێکی گرنگ هەیە دەبێت ئەنجامی بدەیت ، باش ئەنجامی بدەیت .

گوتم : پیرۆزە چ کارێکە هەتا بتوانم ئەنجامی بدەم ؟.

قطب زادە گووتی: منیش بەتەواوەتی نازانم ئەم دوو ئەفسەرە تۆ دەبەن بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش لەوێ لە بابەتەکە تێدەگەیت ، وابزانم کارەکە لەبارەی لێکۆڵینەوەیەکە .

بەپەلە گوتم لەمن ؟ پێکەنی و گووتی: نا تۆ دەبێت لێکۆڵینەوە لە ئێرانیەکی دەست بەسەر بکەیت بەڕێز دادوەر.

دواتر لەسەر پێکەنینەکانی بەردەوام بوو گوتی: لەڕاستیدا وەك وەرگێڕێك لەوێ ئامادەدەبیت ، بەڵام چونکە پارتیزانێکی کارامە و لێهاتوویت بەدڵنیایەوە بەهۆی تۆوە لێکۆڵینەوەکە بەرەو پێشتر دەچێت.

پرسیم کەواتە لەکوێ دەمێنمەوە هەر لێرە یان لە جێگایەکی تر ؟

قطب زادە قسەی لەگەڵ دوو ئەفسەرە لیبیەکەدا کرد و دواتر گووتی : هەرلێرە ، هەتا من دەگەڕێمەوە دواتر دەچینەوە بۆ پاریس ، تۆ هەر لەم ئوتێلە خۆشە دەمێنیتەوە ڕاست وەك کارمەندێك بەیانیان دێن بە دواتدا و دەتبەن بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش لە دوای کۆتا هاتنی کار دەتهێنەوە بۆ هۆتێلەکە .

گووتم بۆ من جیاوازیەکی نیە ، قطب زادە پێکەنی نەکا دڵت بۆ پاتریسیا تەنگ بووە بەم قسەیە منیشی هێنایە پێکەنین.

کاژێرێك دواتر قطب زادە بەرەو ژوورەکەی بەرێکەوت ، منیش لەگەڵ دوو ئەفسەرەکە بە جیپێکی سەربازی ئەمریکی ڕۆیشتین بۆ بەڕێوەبەرایەتی.

لەوێ لەگەڵ دوو ئێرانی خوێنکاری زانکۆ ئاشنا بووم ، بە ناوی ( چایچی و ئەحمەدی ) ئەو ڕۆژە هەتا نیوە شەو ئەحمەدی و چایچی سەرگەرمی فێرکردنی من بوون ، بۆئەوەی زیاتر لەو بابەتە تێبگەم کە بڕیارە ئەنجامی بدەم ، چەند یاسا و ڕێ و شوێنێك هەبوو دەبوو لەکاتی لێکۆڵینەوە ڕەچاویان بکەم ، چ کاتێك دەبێت توند و تیژ بم ، چ کاتێك هێمنانە ڕەفتار بکەم ، هەتا کوێ بەرەو پێشەوە بچم ، لەکوێشدا توشی گرفت بووم لێکۆڵنەوە بۆستێنم ، یان نیشانە و ئامازەکانمان بۆ لێکۆڵینەوەکە چۆن چۆنی بێت .

ژووری لێکۆڵینەوە هێشتا کەسی لێنەبوو ، دوو بەش بوو لەڕاستیدا بەشێکی نهێنی بوو ، جگە لە ئێمە و کارمەندانی تایبەت بە لێکۆڵینەوە کەسی تر ئەو ژوورەی نەدەدی ، ژووری سەرەکی لێکۆڵینەوە ئاسایی بوو . مێزێکی تەختە و چوار کورسی ، کاتێك لەناو ئەم ژوورە دا بوین بە ژوورێکی ئاسایی دەهاتە پێش چاو ، بەڵام کاتێك دەچووینە ژوورە نهێنیەکە لە دوولاوە دەتوانرا ژووری سەرەکی لێکۆڵینەوەکە ببینی ، بەجۆرێکی تر، کاتێك من سەرگەرمی لێکۆڵینەوە دەبووم ، نە من و نە ئەوکەسەی لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بوو نەماندەتوانی بزانین لەو ژوورە نهێنیەوە کێ چاودێریمان دەکات . دوولای ژوورەکە لە زەویەوە هەتا سەقف یەك پارچە ئاوێنە بوو ،

بەڵام کاتێك دەچوومە ژووره نهێنیەکه ئەم ئاوێنانه دەبوونه شوشەیەکی ڕوون و بەئاسانی دەتوانرا سەیری ژووری لێکۆڵینەوه بکەیت. ئامێری دەنگ تۆمارکردن و فیلم تۆمارکردن و وێنه گرتن له ژووره نهێنەیەکه جێگیر کرا بوو .

بڕیار وابوو ئەحمەدی و چایچی پرسیارەکانم پێبدەن و منیش بچومایه لەو کەسەم بکردایه که دەیان هێنا بۆ لێکۆڵینەوه ، ئەگەر وەڵامی بدایەتەوه که هیچ ، ئەگەر وەڵامی نەدایەتەوه ئەوا بەو شێوازانەی له فێرگه سەربازیەکەی دیمەشق فێری بووم دەبوو ئەوم ناچار به دانپێدانان بکرادیه.

کاتێك دانی پێدابنایه ، دەبوو کەمێك پشووی پێبدەم بگەڕامایەتەوه بۆ لای ئەحمەدی و چایچی هەتا وەڵامەکان هەڵبسەنگێنین و پرسیاری دواتر ئامادەبکەین .

لەتەواوی ئەوماوەیەی من سەرگەرمی لێکۆڵینەوه دەبووم ، ئەوان من و نێچیرەکەیان دەبینی و گوێ یان له قسەکانمان دەبوو . لەکوێشدا پێویستی بکردایه فیلمییان لێ تۆماردەکرین و وێنەیان دەگرت ، ئەڵبەته دەبوایه ئەو دوو ئەفسەره لیبیەش له تەنیش ئەوانەوه بونایه ، لەدوای ڕوونکردنەوەیەکی تەواو زیاد له ده جار دوباره کردنەوه نەوەك شتێکمان لەبیر بچێت و هەموو شتێك هەماهەنگ نەبێت .

پێیان گووتم لەم هەفتەیەدا لێکۆڵینەوه له دوو کەس دەکەین . لەڕۆژانی کۆتایشدا ئەو دوو کەسه ڕووبەڕووی یەکتر دەکەینەوه .

ئەو دوو کەسەی بڕیار بوو لێکوڵینەومیان لەگەڵدا بکرێت فڕۆکەوانی هێزی ئاسمانی ئێران بوون . بۆ بینینی خولێك نێردرابوون بۆ ئەمریکا لە لۆنگ ئایلەند نزیك نیۆرك لە بنکەیەکی سەربازی دەمانەوە ، لەلایەن پارتیزانەکانی لیبیا لە شەقامەکانی نیۆرك فڕێنرابوون و دوای بێهۆشکردنیان لە نیۆرکەوە هێنابوونیان بۆ طرابلس ، ئەگەر زانیاریەکانی چاپچی ڕاست بێت ئەو دوو فڕۆکەوانەیان لەناو صندوقێك لە نیۆرکەوە بۆ طرابلس گواستبویەوە ، هەموو شتێك بۆ من سەرمنج ڕاکێش بوو ، بەتایبەتی لەو بەیانیەی لێکۆڵینەوە دەستی پێکرد جارێکی تر سەرمنج ڕاکێشتر دەبوو بۆ ساتێك بیرم دەکردەوە لە دووکانێکی قەصابی قدریجان هەتا ژووری لێکۆڵینەوە ی مۆدێرن ڕێگایەکی زۆر دوریش نیە !.

کاتێك کارەکان و ڕاهێنانەکان تەواو بوون ، دەستێك جل و بەرگی سەربازی لیبی بە پلەی ئەفسەر بۆ هێنام مۆڵەتیان پێدام هەموو ڕۆژێك پێش چوونەژوورەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری لەبەریان بکەم ، ئاگاداریان کردبوومەوە لە دەرەوەی ئەم ناوچەیە مافی ئەوەم نیە سود لە جلە سەربازیەکانی سوپای قەزافی وەربگرم . بەمجۆرە ئەو ڕۆژە ماندووکەرە کۆتایی هات ، هێشتا نەگەشتبووە کاژێر ٩ ی شەو دووبارە لە تەنیشت دوو ئەفەسەرە لیبیەکەی ئەم بەیانیە کە قطب زادە پێی ناساندبووم بە جیپە ئەمریکیەکە هێنامیانەوە بۆ هۆتێل ، دوبارە هۆتێلەکە پڕبوو لە ئەمریکی دەگوترا بە پارەیەکی زۆر خەریکی سەرمایە گوزارین.

لەکاتی خوداحافیزی لەیەکێك لە ئەفسەرەکانم پرسی : من بە شارەکەی ئێوە ئاشنا نیم و خووم بەوەوە نەگرتووە شەو زوو بخەوم ، ئەگەر بمەوێت کەمێك بەناو شاردا بگەڕێم دەبێت چی بکەم ؟ هەروەها پارەی لیبیم پێ نیە نازانم دەتوانم پارەی ئەمریکی لێرە خەرج بکەم یا نا ؟

ئەفسەرە لیبیەکە ڕووی لەمن کردوو گووتی: ئەڵبەتە دەتوانی بەناو شاردا بگەڕێیت کارتێك لە هۆتێلەکە وەربگرە ، هەتا ئەگەر زۆر دورکەوتیتەوە نیشانی شۆفێریکی تەکسی بدەیت و بتهێنێتەوە بۆ هۆتێل ، بەلاّم من هەوڵدەدەم سبەی ئۆتۆمبێلێك و شۆفێرێکتان بۆ دابین بکەم ، لەبارەی دۆلارەوە باش بوو گووتت لە دەرەوە گۆڕینەوەی دۆلار کارێکی باش نییە، ئەگەر جگە لە بانك و گەشتیار بەدەستی کەسی ترەوە ببینرێت کێشەی بۆ دروست دەبێت ، لەبەرئەوە هەوڵبدە پارەکەتان لەبانك یان هۆتێل بگۆڕنەوە. ئەفسەرە لیبیەکە لەو کاتەدا بەتوندی دەستی گوشیم و گوتی: هاوڕێ ئەگەر بە گوێم دەکەیت ئەمشەو لە هۆتێلەکە بمێنەوە و مەچۆرە دەرەوە ، هەتا سبەی شەو . دواتر هەردوکیان ماڵئاویان لێکردم و ڕۆشتن ، ڕاستت دەوێت زۆر بۆم گرنگ نەبوو بچمە دەرەوە یا نا

زۆر بەتوندی ڕقم لەلیبیا دەبوویەوە، تەنها ئەو ژووری لێکۆڵینەوەیە بوو کەمێك خۆشی پێدەبەخشیم و هەستی دەبزواندم ، کاتێك چوومە ژوورەکەم هەستم بە تەنیایەکە زۆر کرد هیچ کات ئەوەندە تەنیا نەبووم بەڕاستی لەوانەیە ئەوە تەنها شەوێك بوبێت لەهەموو تەمەنم هێندە دڵم تەنگ بێت.

ئەم دڵتەنگیەم زۆر درێژەی نەکێشا ، کاتێك چەند خولەکێك دواتر بۆ نانخواردن چوومە چێشتخانەی هۆتێلەکە بە بینینی ژمارەیەکی زۆر کچی شۆخ و شەنگ و جوان لەناو ئەو هەموو ژاوەژاوەدا خەمی تەنیایم بیرچووەوە . وا دیار بوو کارمەندانی هێڵی ئاسمانی بریتانیا بوون ئەو شەوە لە طرابلس مابوونەوە ، هەوڵمدا هەر جۆرێك بێت لێیان نزیك ببمەوە ، بەڵام نە زمانم دەزانی و نە هێندەش جوان بووم هەتا سەرنجیان بۆلای خۆم رابکێشم .

کاژێر ١١ ی شەو گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم وا بیرم کردەوە خەو باشترین شتە بتوانم ئەنجامی بدەم ، دوبارە دڵم بۆ پاتریسیا تەنگ بویەوە .

کاژێر ٩ ی بەیانی خۆم گەیاندە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری ، ئەحمەدی و چایچی لەوێ بوون هەرسێکمان جل و بەرگی ئەفسەری لیبیمان پۆشیی بوو .

لە ژوورە نهێنیەکە چاوەڕوانی نێچیرەکەی خومان بووین ، زۆر بەئاسانی هەست بەوە دەکرا کە ئەحمەدی و چایچی لەمن کارامەترن ، کاژێر ١٠ ی بەیانی شاهیدی بینینی هاتنە ژوورەوەی کوڕێکی گەنج بووین بۆ لێکۆڵینەوە ، چەند ساتێك دواتر دوو ئەفسەری لیبی خویان بە ژووردا کرد ، هەتا ئەوکاتە من ئەوانم نەدیبوو ، بەڵام دیار بوو ئەحمەدی و چایچی دەیانناسین ناویان ( عبدالسلام و عبدالعامر ) بوو .

بەدیتنی من خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی ، کاتێك زانیان عەرەبی دەزانم زیاتر خۆشحاڵ بوون . بڕیار درا بەبێ درەنگ کەوتن دەست بە لێکۆڵینەوە بکەین ، من و عبدالعامر بە ئارامی چوینە ژووری لێکۆڵنەوە نێچیرەکەمان دەستێك

جلی سەربازی لەبەردابوو لە جێگای خۆی هەستا و سڵاوی کرد و عبدالعامر وەڵامی نەدایەوە ، بەڵام من بەفارسی بەشێوازی ئەسفەهانی سلاوم لێکرد. جگەلەوە کارێکی ترم لەدەست نەدەهات و کوڕە گەنجەکە زۆر سەری سوڕما و گوتی تۆ ئێرانیت ؟ گوتم بووم !

عبدالعامر پێکەنی..! بۆچی ؟ نازانم بەڕواڵەت ئەو فارسی نەدەزانی ، عبدالعامر گوتی : کارەکە دەست پێ بکە ، منیش بەئارامی و هێمنی لەسەر کورسیەك دانیشتم و بە گەنجەکەم گووت چ ڕۆخسارێکی جوان و میهرەبانت هەیە !. ئەمان لە سوریا فێر بووم دوێنێش زیاد لە پێویست ڕاهێنانم کردبوو لە دوایدا درێژەم پێدا ، بەهەرحاڵ ئەو تۆمەتانەی خراونەتە پاڵت زۆر گەورەن باشتر وایە ڕاستیەکان بڵێیت ، جگە لەڕاستی هیچی تر مەڵێ و گیانی خۆت لەم گێژراو و سەرئێشەیە ڕزگاربکە.

من لێرەدا هیچ کارێکم بەدەست نیە ، بەڵام بیستم تۆ ئێرانیت هاتم هەتا ئەو جێگایەی بتوانم یارمەتیت بدەم . بەبیرتان دەهێنمەوە تۆمەتەکانت زۆر قورسن، دزینی چەك ، کوشتنی مرۆڤ ، لەهەموو قورستر سیخوری و شۆڤاریە ، هێشتا قسەکانم تەواو نەکردبوو ، دەنگی هەنیسکی گریانی بەرزبویەوە و ساتێك دواتر لەسەر کورسیەکەی بەربویەوە بە زەویدا کەوت هەر بەو شێوەیە فرمێسکی دەڕشت و پێیەکانمی گرت و گوتی : کاکە بەخودا درۆدەکەن ئەمانە هیچی ڕاست نین ، ئەسڵەن من لە کوێم ؟ سێ ڕۆژە لەهەرکەسێك دەپرسم وەڵامم نادەنەوە ئەمانە عەرەبن . ئێوە بڵێن من لەکوێم ؟. بە لەقەیەك ئەوم لەسەر پێیەکانم دورخستەوە و گوتم : سەیرکە بەم کردەوەو خۆ نواندنانەت کارەکە خراپتر دەکەیت ، چۆن

نازانیت لەکوێیت تۆیان لەکاتی سیخوڕی لەم وولاتە گرتووە و تۆمەتباری بە کوشتن و دزی ، ئیتر چون دەڵێت ئاگام لەهیچ نییە.

لەو کاتەدا عەرەقێکی زۆری دەردابوو دەنگی گریانی تا دەهات بەرزتر دەبویەوە . دیسان خۆ هاویشتە سەر پێیەکانم و گوتی : کاکە بە خودا بە پێغەمبەر ، بە هەرچی پیرۆزیە بێ ئاگام لەوەی کە تۆ دەیڵێت..! کۆتا شتێك لەبیرم مابێت ئەوەی یە لەگەڵ طاهری و جەمشید ڕۆشتین بۆ براد وەی[٦] بڕێکی زۆر مەشروبمان خواردەوە و نازانم لەوانەیە لەگەڵ سێ کچی ئەمریکی قسەمان کردبێت ... تەنها و تەنها هەر ئەوە...

عبدالعامر لە ژووری لێکۆڵینەوە چووە دەرەوە و منیش دەستبەجێ ڕەفتارم گۆڕی و بە میهرەبانی لەسەر پێیەکانم بەرزم کردەوە و بەهێمنی گوتم : سەیرکە ئەزیزم ! ئێرە دیمەشقە پایتەختی سوریا

هەتا ئەو پیاوە لێرەنیە بهێڵە شتێکت پێبڵێم ئەگەر هاوکاری نەکەیت خەونی لەسێدارەدانیان بۆ بینیویت . من ناچارم لەبەردەم ئەمانە توند لەگەڵت ڕەفتار بکەم ، بەڵام ئەمە تەنها خۆت بیزانەو لەبیری خۆتی بەرەوە ، من کارمەندی ساواکم . ئەوەش دەزانم تۆ فرۆکەوانیت و لە ئەمریکایت ، بەڵام چۆن چۆنی هاتویت بۆ ئێرە نازانم دەبێت زۆر ...... ، هێشتا قسەکانم تەواو نەبوو عبدالعامر دەرگاکەی کردەوە و بە عەرەبی گوتی بڕۆ دەرەوە ، چاوێکم لە فڕۆکەوانەکە داگرت و چوومە دەرەوە ، کاتێك گەڕامەوە ژوورە

---

[٦] شەقامێکی بەناوبانگی نیۆرکە ، بە پایتەختی شانۆی جیهان ناسراوە . وەرگێڕ

نهێنیەکە عبدالسلام و عبدالعامر باوەشیان پێدا کردم و خۆشحاڵ بوو بە لێهاتووی و شێوازی کارکردنم.

ئەحمەدی و چایچیش خۆشحاڵ بوون ، لەکاتێکدا خەریکی خواردنەوەی قاوەی تاڵی عەرەبی بووین چاودێری بچوکترین جوڵەی فرۆکەوانەکەمان دەکرد مات و کز و نیگەران بوو جارجارێك دەستی دەکێشا بەسەری خوێدا . دوای تەواو بوونی قاوەکە گوتم بڕۆین دەست پێبکەین ، عبدالسلام گوتی نا ! لێیگەڕێ با ئازار بچەژێ بەڕاست لەو بەشەی گوتت ساواکم شاکارت کرد بە عەقڵی کەسدا نەدەهات .

گوتم نازانم هەروا بەبیرمداهات. گووتی. ئێستا هەستە بچین بۆلای دووەمیان ئەم دەبێت هەتا درەنگانێك بیربکاتەوە . چایچی و عبدالعامر لە ژووری نهێنی مانەوە و من و ئەحمەدی و عبدالسلام بەڕێکەوتین دوای بڕینی ماوەیەك نزیك بە سی مەتر چوینە ژوورێك هاوشێوەی ئەوەی پێشوو دروست کۆپی یەکتر بوون . ئەحمەدی خێرا لەپشت ئامێری دەنگ تۆمارکردنەکە دانیشت ، عبدالسلام پێی گوتم هەرکات من زللەیەکم لە تۆمەتبارەکەدا تۆ خۆت بکە بە ژووردا. لەدوای ئەم ڕاسپاردەیە خێرا ڕۆشت بۆ ژووری لێکۆڵینەوە .

قوربانی دووەم بە پێچەوانەی یەکەم خۆڕاگر و بەهێز بوو ، من و ئەحمەدی لە ژووری نهێنیەوە سەرگەرمی تەماشاکردن بووین . تا چەند خولەکێك لەوەوپێش عبدالسلام ئەفسەرێکی لەسەرخۆ بوو ، بەلآم لەناکاو بووبە یەك پارچە ئاگر هەرکە خۆی بەژووردا کرد بەدەنگی بەرز و تووڕەی یەوە بەزمانی عەرەبی دەستی بە جنێودان کرد ، کوڕەکەش یان لە عەرەبی

تێنەدەگەیشت یا هێندە هێمن و لەسەر خۆبوو حەزی بە پەرچەکردار نەدەکرد .

عبدالسلام تەنها هەوڵی دەدا تورەی بکات فرۆکەوانە گەنج و وەرزشکارەکەش ئارام و لەسەرخۆ هەموو توانج و جنێوەکانی قبوڵدەکرد، وابزانم ئەم سوکایەتی و بێڕێزیە پێنج خولەکی خایاند تا لەکۆتایدا فرۆکەوانەکە دەمی کردەوە و بەدەنگی بەرز بە فارسی و جارجارێکیش بە ئینگلیزی دەیگوت چی دەڵێیت ؟ من لە بۆڵەبۆڵەکانی تۆ تێناگەم ، هەتا بەیانی بۆخۆت بگرمێنە. لەم کاول بووە وەرگێڕێك پەیدا نابێت وەك مرۆڤ قسەبکات؟!

لەگەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی فرۆکەوانەکە عبدالسلام وای نیشاندا زۆر تورەبووە ، چووە پێشەوە و زللەیەکی توندیماڵی بە ڕوخساریدا ، ئەحمەدی گووتی: هاوڕێ ئێستا نۆبەی تۆیە . بەپەلە خۆم گەیاندە ژووری لێکۆڵینەوە ، دەرگاکەم کردەوە و سلاوێکی سەربازیم لە عبدالسلام کرد و ئەویش بە عەرەبی دەستی بە قسەکردن کرد لەگەڵم، بە جۆرێك رەفتارم کرد و خۆم نیشاندا کە فرۆکەوانەکە دەناسم و عبدالسلام هەر سەرگەرمی فەرمانکردن بوو بەسەرمدا ، بە گەنجەکەم گووت تو ئێرانیت؟!

باوەڕی نەدەکرد و بە واق وڕماوی سەیری منی کرد و دیار بوو خۆشحاڵ بوو .

گوتی : بەڵێ برا !... منی بەدبەخت ئێرانیم !... دەیویست درێژە بە قسەکانی بدات دیسان عبدالسلام بەدەنگی بەرز دەستی بەقسەکردن کرد و ئاماژەیەکی بۆ کردم هەتا پێکەوە بڕۆینە دەرەوە ، ئەم جۆرە کارانە

هەلگیرساندنی جەنگی دەروونی و چاندنی تۆوی هیوا و ترس و تۆقاندن بە لەسێدارەدان وێرانکردنی سیتەمی عەصابی بەرامبەر بەهەر شێوە و بەهەر هۆکارێك بێت سادەترین و سەرەتایترین جۆری لێکۆڵینەوە بوو لە چالاکی پارتیزانیدا.

لە پشت شوشەکەوە سەیرکردنی ڕەفتاری فڕۆکەوانە گەنجەکە تەماشایی بوو. پێدەکەنی و بزەی دەهاتێ دیار بوو پەیدابوونی هاوزمانێك لە وەها بارو دۆخێکدا زۆر خۆشحاڵی کردووە ، ئێستا دەبێت چاوەڕێ ی تێپەڕینی زەمەن بکەیت هەتا نێچیرەکانمان بەباشی لەناو بیر و خەیاڵەکانی خۆیاندا نغرۆ بکەین .

بەم جۆرە کاژێرێك دوای ئەم نمایشە ، هەر پێنج کەسەکەمان لە ژوورێکی تر کۆبووینەوە ، هەتا بەشێوەیەکی گشتی زانیاری وورتر وەدەستبخەین. زانیاریەك بتوانین لەسەر بنەمای ئەوە چارەنوسی لێکۆڵینەوەکە دیاری بکەین و کۆتایی پێبهێنین. هەر لەسەرەتاوە ڕوون بوو کە عبدالسلام بەرپرسی گروپی لێکۆڵەرەوەکانە واتە بەرپرسی هەمووومانە ، ئەو گوتی؛ کورتەی بابەتەکە ئەمەیە، لەنزیك شاری نیۆرك دورگەیەك بەناوی لۆنگ ئایلەند هەیە ، کۆمپانیای گرومان تایبەت بە دروستکردنی فڕۆکە لەوێ یە ئەم کارگەیە فڕۆکەی F14 دروست دەکات . زیاتر لە سەد فڕۆکەوانی ئێرانی لەبەشی میکانیکی سەرگەرمی خوێندنی چۆنیەتی دروستکردنی ئەمە فڕۆکەیەن ، لەم پەیوەندیەدا دوو بابەت بۆ ئێمە وولآتانی تازە گەشەسەندووی عەرەب گرنگە.

یەکەمیان :- لەگەڵ ئەوەی ئەمریکیەکان ئەمان فێری تەکنیکی دروستکردنی ئەم فرۆکەیە دەکەن ، مێشکیان دەسڕنەوە و بابەت گەلێك دەخەنە بەردەم ئەمانە کە جۆرێکە لە ڕەوتی چەپی مارکسی، لەڕاستیدا فرۆکەوانەکان بۆ چالاکی شۆڕشی دژی ڕژێمی شا ئامادە دەکەن. ئەوان بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو سەرگەرمی چاندنی تۆوی ڕق و کینەن لەناو فرۆکەوانەکان بەرامبەر بە شا. زۆربەشیان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریان بۆئەوەی هەرکات گەڕانەوە بۆ ئێران دەست بکەن بە ئەنجامدانی چالاکی سیاسی ، بە ئاگادار بوون لە هاوکاری و دۆستایەتی ئێران و ئەمریکا بۆ ئێمە و وولاتە گەشەسەندەوەکانی عەرەب، هەروەها یەکێتی سۆفیەت کە دابینکەری چەك و تەقەمەنی زۆربەی وولاتانی عەرەبیە جێگای تێڕامان و پرسیارە ، ئێمە دەمانەوێت بزانین بۆچی ئەمریکا دەیەوێت گۆڕ بۆ ڕژێمی شا هەڵکەنێت ؟ تەنها هەر ئەوە !.

بەڵام بابەتی دووەم لە دووبڕگە پێك دێت، یەکەمیان : جگە لەم دووکەسەی ئەم بەیانیەی بینیتان کەسی سێیەمیش هەیە و لەدەستمان هەڵهات ، کارمەندی هەواڵگری و سیخوڕی ڕژێمی شا لە نێو فرۆکەوانەکاندا بوونیان هەیە. سیخوڕی لەسەر ئەوانی تر دەکەن و ڕاپۆرتەکانیان دەنێرنەوە بۆ تەهران .

ئێمە دەمانەوێت سود لە ئامانجی گەشەندن و ڕاپەڕینی خۆمان لەوانەوە وەربگرین. زۆربەی وولاتانی عەرەب خاوەنی چەکی ڕوسین لەگەڵ ئەوەشدا F١٤ فرۆکەیەکی زۆر پێشکەوتووە ، هێشتا ڕوسەکەکان نەیانتوانیوە هاوشێوەکەی بخەنە بازاڕەوە.

بڕگەی دووەمییان :- ئەگەر کرابا و بۆمان ڕێك بکەوتایە ، نەخشەکان و هەندێ لە پێداویستیەکانی ئەم فڕۆکەیەمان بۆ سود و لێکۆڵینەوی خۆمان بەدەست بهێنایە و بوونی نەخشەیەکی تەواو لە دامەزراوەی لۆنگ ئایلاند لیستی داواکاریەکەی ئێمەی تەواو دەکرد. ئەمانە ئەو بابەتانەن دەبێت لەم لێکۆڵنەوەیەدا دەستی بخەین .

دانیی پێدا دەنێم هێشتا نازانم عبدالسلام هەموو ڕاستیەکانی گوتووە یان ئەمەش یەکێکە لە گەمەکانی تری بۆ بەگەورە زانینی عەرەبەکان ، ڕاستە من لە شاگردی قصابی یەوە تائێرە هاتبووم ، بەلاّم ئەوەشم دەزانی بۆ وێنە ؛ ئەگەر بچومایە بۆ خۆراسگان مەڕی قاچاغ بکڕم ، تەنانەت لەبری ڕاستیەکە بابەتێکی ترم بۆ داودی مێردی خوشکم باسدەکرد ، ئەم لیبیانەش دەبێ ئەوەندە نەزان بن بەم ڕوونیە باسی نۆکەری بۆ ڕوسیا و دروستکردنی فڕۆکە بۆ من و ئەحمەدی و چاپچی بکەن ، ئەڵبەتە ئەم بابەتانە بۆم گرنگ نەبوو ئەوەی لەو ساتەدا مێشك و بیری منی داگیر کردبوو ئەوە بوو، دڵم دەیخواست بزانم چۆن چۆنی دوو پیاوی گەورە و گران بێ ئەوەی خۆیان بزانن دزیویانن و بەم ئاسانیە لە نیۆرکەوە هێناونیان بۆ طرابلس بۆ من تەنها ئەمە گرنگ بوو.

لە کۆتایدا نەمتوانی دان بە خۆمدا بگرم و کاتێك ڕوونکردنەوەکانی عبدالسلام تەواو بوو بابەتەکەم لەگەڵ باسکرد ، پێکەنی و گووتی : ئەگەر بەم جۆرە بچیتە پێشەوە بەزووی خۆشت لەم جۆرەکارانەدا بەشداری دەکەیت !. ئەو ڕۆژە کاژێر ١٠ ی بەیانی یەکەمین پلەی لێکۆڵینەوەمان دەستپێکردبوو ، ئێستا بۆ دووەمین جار کاتێك بۆ ژووری یەکەم دەگەڕاینەو

هەتا لێکۆڵینەوە لە فڕۆکەوانە گەنجەکە بکەین کاژێر ٢:٣٠ دوای نیوەڕۆ بوو.

واتە چوار کاژێری تەواو قوربانیەکەی ئێمە لە ژێر فشاری دەرونی و ڕۆحیدا بوو ، ئێمە دڵنیا بووین پێدانی وەها پشوویەك ئەویش لە بارودۆخێکی تەنیایی و پڕ لە دنیای خەیاڵ و پرسیاری بێ وەڵام بەسە بۆ شکاندنی بەهێزترین ڕۆحیە و ئیرادە.

ئەمجارە کە چوومە ژوورەوە فایلێکم لە بن دەست دابوو ، بڕیار بوو بەتەنها لێکۆڵینەوە ئەنجام بدەم ئەوانیش لە ژووری نهێنی هەموو شتێکیان دەبینی و دەبیست و تۆماریان دەکرد. هەرکە چوومە ژوورەوە  فایلەکەم خستە سەر مێزەکەو تەوقەم لەگەڵی کرد؟ لە میهرەبانترین دۆخدا فەرمووی جگەرەم لێکردوو پێم گووت دانیشە ، دەستم بە قسە کرد گووتم : من ناوم سەعید ڕەجایی یە لە کۆتایدا توانیم ڕەزامەندیان وەرگرم هەتا بە تەنها لێکۆڵینەوەتان لەگەڵدا بکەم. سەرەتا ڕازی نەبوو بەڵام دواتر ڕەزامەندیان دەربڕی هەر لەبەر ئەمە بوو درەنگ کەوتم.

لەو کاتەدا بەتاسەوە نەفەسی لە جگەرەکەی دەدا و گوتی : نازانم بە چ زمانێك سوپاستان بکەم باوەڕ بکە خەریکە شێت دەبم ، ئاخر بیری لێبکەرەوە من لە نیۆرك بووم ئێستا ئێوە دەڵێن لە دیمەشقم چۆن جێگای باوەڕە مرۆڤێك ئەو هەموو ڕێگایەی بڕیبێت و بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێت ، ساتێك بێدەنگ بووم و دواتر گووتم : ڕێك ئەوە پرسیاری ئەو برادەرانەشە ، واتە نابێت ئێمە بە تۆ بڵێین چۆن چۆنی هاتویت ، ئێوە دەبێت بڵێین و بە ڕاستگۆیانەش دەبێت بڵێین چۆن چۆنی لە ئەمریکاوە

گەیشتونەتە دیمەشق ؟ بە پەرەشوت یا لەژێر چاودێری سوپای ئەمریکا یا بەرێگایەکی تر ، لەبەر ئەم هۆکارەیە دەڵێم بارو دۆخت خراپە و زۆریش خراپە . قسە لەسەر سێدارە و دادگای و دزی و سیخوریە ، بەئاشکرا ڕەنگ بەڕویەوە نەمابوو دیسان کەوتەوە گریان و پاڕانەوە کاکە تو خودا یا رمەتیم بدە ڕەحمم پێبکەن.

گوتم: سەیرکە بەگریان و زاری کارەکە دروست نابێت ، هەر کارێك لەدەستم بێت بۆت ئەنجام دەدەم ، بەلاّم بەو مەرجەی تۆش هاوکاری بکەیت ، لەبەر ئەوە بیرو هۆشت کۆبکەرەوە و بهێڵە لەسەرەتاوە لێکۆڵینەوەیەکی تەواوت لێبکەم ، بەهەرحاڵ هەتا ئەوجێگەیەی بتوانم پارێزگاریت لێدەکەم باشە ئێستا بڵێ ناوی خۆت و بنەماڵەکەت و تایبەتمەندیەکانت چین ؟

چەند چرکەیەك بێ دەنگ بوو ، بەلاّم دواتر دەستی بەوەلاّم دانەوە کرد ، چونکە لەوانەیە بەڕاستی هیچ ڕێگا چارەیەکی بۆ نەمابێتەوە .

ناوی ( عبدالرضا تەقەوی نیا ) بوو. کوڕی محەمەد لەدایك بووی ١٩٥٢ فڕۆکەوانی فڕۆکە خانەی سەربازی خاتەمی بوو لە ئەصفەهان. سێ مانگ بوو بۆ بینینی خولێك چوو بوو بۆ نیۆرك لە سەربازگەی لۆنگ ئایلاند ، دوو ساڵ لەوە و پێش هاوسەرگیری کردبوو خاوەنی منداڵێك بوو بەناوی مهرداد ، جگە لەمانە هیچی تری نەدەزانی.

گوتم : ئێستا بڵێ چۆن لە ئەمریکاوە توانیوتە بگەیتە دیمەشق ؟.

دوبارە دەستی کردەوە بە شین و شەپۆڕ ، بەخودا خۆشم نازانم !

گوتم : هەوڵبدە بێتەوە بیرت، هەرچیەکت لەبیرە بیڵێ کۆتا ئەوشتانەی لە یادت ماوە باسی بکە لەوانەیە بتوانیت بەم جۆرە یارمەتی چارمنوسی خۆت بدەیت !.

گووتی : دوای نیوەرۆیەکی هەینی بوو، من لەگەڵ دوو لە هاورێکانم لە لۆنگ ئایلان هاتبوینە نیۆرك دوو ڕۆژ پشوومان هەبوو، بیرمان کردەوە پشویەکی باشەو دەگرێت هەندێ خۆش ڕابوێرین ، ماوەیەك لە سێنترال پارك پیاسەمانکرد.

دواتر سێ قۆڵی هەندێ بەناو شەقامی پێنجەمی نیۆرك گەڕاین و بەرەو سەرەوە دەڕۆشتین و لە شەقامی چل و دووەمەوە چوینە ناو ئەڤینیو ، مەهدی ئەمیر حسێنی یەکێکە لە هاورێکانم گوتی: بابڕۆین لە یەکێك لە بارە یابانیەکان هەندێك خواردنەوەی کهولی بخۆینەوە. لەپارکی ئەڤینیو وە دەستمان پێکرد و نانی ئێوارەمان لە ڕستۆرانتێکی مەکسیکی هەر لە نزیك ئەو شەقامە خوارد ، لەگەڵ سێ کچی ئەمریکی بوینە دۆست ناویان ( جودی، کارول ، سۆنیا ) بوو ، سونیا باسی خۆی کرد لە ئێران بۆ ماوەیەك ماوەتەوە لە کۆمپانیای IBM وەك سکرتێرە کاری کردوە. کچێکی زۆر شۆخ و شەنگ بوو ، کاژێر ١١ ی شەو کچەکان پێشنیاریان کرد بچین بۆ براد وەی شەقامە بەناوبانگ و قەرەبالغەکەی نیۆرك بۆئەوەی کەمیك ڕابوێرین.

ئێمەش، مەست تر لەوەبوین هەتا بتوانین بەوەها پێشنیارێك بڵێین نا، بەرێکەوتین و شاد و خۆشحاڵ گەیشتینە براد وەی ، براد وەی ڕازاوە و جوان قەرەبالغ، لەمبەرەوە بۆ ئەوبەر دەڕۆشتین دوبارە هەتا توانیمان مەشروبمان خواردەوە. بەڕاستی ئیتر من هیچی تر تێنەگەیشتم ، بەلآم

ئەوەم لەبیرە سۆنیا پێشنیاری کرد هەموومان بچینە شوقەکەی ئەو، سواری ئۆتۆمبیلێکی گەورەی ئەمریکی بووین لە شوقەکی سونیا هەندێ تارمایم دێتە پێش چاو ، جگە لەمانە ئیتر هیچ شتێکی ترم لەیاد نیە ، هەتا سێ رۆژ لەمەوبەر لە زیندانەکەی ئێرە بەهۆش هاتمەوە.

لەکۆتاییدا من ئەو هەموو رێگەیە هاتبم خۆ دەبێت چەند شتێکم لەبیر مابێت ، بەلاَم هیچ شتێکم بەبیر نایەتەوە. ئەمانە هەموو راستیەکانن دەزانم ئێوە بڕواناکەن خۆشم بڕواناکەم چۆن چۆنی لە نیۆرك و شوقەکەی سونیاوە گەیشتوومەتە دیمەشق... لەو کات و ساتەدا عبد الرضا تەقەوی نیا گەرم و گوڕتر لەجاران قسەی دەکر، لەناکاو دەرگای ژووری لێکۆلێنەوە کرایەوە و عبدالعامر بە توڕەیی و گرژی یەوە خۆی بە ژووردا کرد لەو کاتەدا بە دەمانچەکەی دەستی ئاماژەی بۆ من کردوو دەستی بەهات و هاوار کرد دواتر بە شەق و مشت بەر بووە گیانی من کەمێك برینداا بووم، لەو کاتەدا سێ سەرباز هاتنە ژوورەوە و منیان بە خوێناڵنی و برینداریەوە بردەرەوە. لەکۆتا ساتی چوونە دەرەوەم بینیم عبدالعامر بە دەسکی دەمانچە کۆڵتەکەی بەردەوام دەیکێشا بەسەروچاوی تەقەوی نیا.

هێندە لە رەفتارە چاوەڕوان نەکراوەکەی عبدالعامر سەرم سوڕمابوو تەنانەت نەمتوانی بچوکترین نارەزایی دەربڕم. هەر بە سەروچاوی خویناوی یەوە چومە ژووری نهێنی و دەنگی پێکەنینی ئەحمەدی و چایچی و عبدالسلام بەرز بوویەوە و ئیتر زانیم ئەمەش نمایش بووە بە شیوازە لیبیەکەی.

له پشت ئاوێنەکەوە، دەم بینی چۆن عبدالعامر بە ج توڕەیەك و بێ ڕەحمیەك بە نیتاق و دەمانچە بەربوومتە گیانی تەقەوی نیا و دەماری دەردەهێنا. لەو کاتەدا عبدالسلام پۆزشی بۆ دەهێنامەوە برینەکانمی بە لۆکە و دیتۆڵ خاوێن دەکردەوە و دواتر بە لەزگەی برین بەشێك لە برینەکانمی ڕووپۆشکرد ، هەرچوارمان بە خەیاڵی ئاسودەوە دانیشتبووین تەماشایی شەق خواردنەکانی تەقەوی نیامان دەکرد.

کاژێر ٦ ی ئێوارە کاری ئێمە تەواو بوو، بێ ئەوەی بزانم بۆچی ئەو هەموو بێ بەزەیی و توندوتیژیە ناپێویستانە لەبەرامبەر ئەو کوڕە گەنجە بەکاردەهێنن. ئەوەشم بیرنەچێت کاتێك عبدالعامر لە ژووری لێکۆڵنەوە هاتە دەرەوە دەستەکانی و جل و بەرگەکانی خوێناڵین بوو بوون. سەربازەکان لاشەی نیوەگیانی عبدالرضا یان بردەوە بۆ ناو بەندیەکەی خۆی ، پرسیارم لە عبدالسلام و چایچی کرد ئەی ئەوی تریان ؟

عبدالسلام پێکەنی و گوتی : بەیانی نۆبەتی ئەوە .

ئەو شەوە هەتا کاتی نوستن نەگەڕامەوە بۆ هۆتێلەکە، میوانی عبدالسلام و عبدالعامر بووم لە یانەی شەوانەی ئەفسەرانی لیبی، لەم یانەیەدا منیان وەك جەنگاوەرێکی کارامە لەبەرەکانی شەڕی فلسطین بە هاوڕێکانیان ناساند و جارجارێك خۆشم پێکەنینم بەم درۆ شاخدارانە دەهات.

بەیانی دووبارە ڕۆشتمەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری. هەمان بەرنامەی دوێنێمان دووبارە کردەوە، ئەمجارەیان من و عبدالسلام پێکەوە بە مهرەبانی لێکۆڵینەوەمان لە فرۆکەوانە وەرزشکارە گەنجەکە کرد. ئەویش هەمان قسەکانی تەقەوی نیای دووبارەکردەوە، تەنها جیاوازیە کە

هەبوو ناوی بنەماڵەییەکەیان بوو نێر تەواوی چیرۆکەکەیان یەکێك بوو. ئەمیش بۆ ڕابواردنی کۆتایی هەفتە لەگەڵ هاوڕێکانی هاتبووە نیۆرك لەماڵی سۆنیا بەدواوە هیچی تری لەبیر نەمابوو ئەو تۆمەتانی ئاڕاستەیمان کرد هەمان تۆمەت بوون ، دزینی چەك ، پیاو کوشتن ، سیخوڕی و بەزاندنی سنور.

ڕەوتی لێکۆڵینەوە کاژێر ١٠ ی بەیانی دەستی پێکردوو کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ کۆتایی پێهات ، قوربانیە نوێ یەکە ناوی جەمشیدی نعمانی بوو وەك عبدالرضا ترسنۆك و لاواز نەبوو.

لە لێکۆڵینەوەدا زۆر سەرسەخت بوو ، لە کۆتایدا کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی تەواو نعمانی هەموو تۆمەتەکانی ڕەتکردەوە و زۆر بە ڕوونی و چاونەترسیەوە دەیگووت ، جگەلەوەی منیان دزیبێت هیچی تر بوونی نیە. عبدالسلام فەرمانی کرد بچم و بڵێم ئامادەکاری بکەن هەتا بچین بۆ پزیشکی دادوەری، ڕۆشتم بۆ ژووری نهێنی و دوای نیو کاژێر گەڕامەوە و وادیاربوو هەموو شتێك ئامادەیە .

چاوەکانی جەمشیدیان بەست و تورەکەیەکی ڕەشیان بەسەریدا کرد . هەتا دڵنیابن کە ناتوانێت هیچ ببینێت ، چایچی و ئەحمەدی هاتنە ژوورەوە و بەڕاکێشان ئەویان لە ژووری لێکۆڵینەوە بردە دەرەوە، لەتەنیشت دەرگای هاتنە ژوورەوەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری سواری ئۆتۆمبێلێکی مینی پاصی کەپسی بێ پەنجەرەیان کرد و هەر لە ئۆتۆمبێلی زیندان دەچوو ، ئێمەش سەرکەوتین نزیکەی دە خولەك بەناو شەقامەکانی طرابلسدا گەڕاین و دووبارە هاتینەوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و

هەواڵگری. ئەمجارەیان بەرەو هۆڵێك كەوتینەڕێ هەتا ئەو كاتە ئەوێم نەدیبوو . پێش ئەوەی بچینە ناو هۆڵەكە ئەحمەدی و چاپچی چوونە ژوورێكی تر و دواتر بەفەرمانی عبدالسلام سەرەتا تورەكەكەمان لەسەری دەرهێناو و پاشان چاویمان كردەوە، ساتێك دواتر هەرسێكمان چووینە هۆڵەكە و بۆنی دیتۆڵ و مەوادی دژە بەكتریای لێدەهات .

پیاوێكی پیری بەرگ سپی لەسەر مێزی توێكاری چەمابوویەوە و خەریكی خوێندنەوەی ڕاپۆرتێك بوو ، سلاّوی لە عبدالسلام كرد و عبدالسلام بە هێمنی شتێكی بە پیرە پیاوەكە گووت و ناچار بوو دەست لە خوێندنەوەی ڕاپۆرتەكە هەڵگرێت و بەرەو لایەكی تری هۆڵەكە بەڕێكەوت. ئێمەش بە ئاماژەی عبدالسلام بە دوای كەوتین، لە تەنیشت دیوارێكی ئاسنی خانەخانە وەستاین، یەكێك لە خانەكانی ڕاكێشایە دەرەوە و ئینجا زانیم ئێمە لەناو ساردخانەداین ، سارد خانەی پزیشكی دادوەری.

من و عبدالسلام چوینەپێشەوە تەرمێكی تێدابوو چەرچەفی بەرسەردا درابوو ، سەرەتا عبدالسلام بێ ئەوی بهێڵێت من بیبینم چەرچەفەكەی لادا و دواتر بەخێرایی داپۆشیەوە. بانگی جەمشیدی كرد ، لەوكاتەدا دووچاری ترس و لەرز و تۆقین بوو بوو، بەتوندی دەلەرزی و چووە پێشەوە، عبدالسلام بە منی گووت پێی بڵێم چەرچەفەكە لادات و سەیربكات بزانێت تەرمەكە دەناسێت یان نا؟ هەمان قسەكانی عبدالسلامم بۆ وەرگێڕا، بێ ئەوی قسەیەك بكات لەوكاتەدا لەشی بەتەواوەتی دەلەرزی و هاتە پێشەوە، هەر كە چەرچەفەكەی لادا بە توندی هاواری كرد و بەزەویدا كەوت، ڕاستت دەوێت حاڵی منیش لە جەمشید باشتر نەبوو. زۆری نەمابوو لەترسان دڵم

ڕابوەستێت، چونکە ئەو تەرمەی لە چەکمەجی ساردخانەکەدا بوو، تەرمی کەس نەبوو جگە لە عبدالرضا تەقەوی نیا .

بۆ یەکەمین جار بێژم لە خۆم دەکردەوە ، من لە دیمەشق نۆ ئەفسەری سوریم گوللەبارانکرد و سیانزە گوولەم لە مێشکیاندا خاڵیکردەوە ، من ئیتر ترسم لە کوشتنی ئەم و ئەو نەبوو ، بەلاّم ئەمەیان بێشك بێ گوناه ترین مرۆڤ بوو کە کوژرا بوو .

بۆ ساتێك بیرم کردەوە بۆچی ئەویان کوشت ئەو خەریك بوو هەمووشتێکی دەگووت ، شتێکی گرنگ نەبوو .

ئەم هەموو نمایشە لەڕاستیدا جەنگێکی دەرونی بوو بۆ تێکشکاندنی ئەو. دواتر سود لێوەرگرتنی ناچارکردنی بۆ سیخوڕی و نۆکەری یا هەرشتێکی تر ئیتر بۆچی کوژرا ؟.

مەودای ئەم بیرکردنەوەشم زۆری نەخایاند ، چونکە عبدالسلام داوی لە پیرە پیاوە سپی پۆشەکەکرد کارێك ئەنجام بدات، هەتا جەمشید بەهۆش خۆی بێتەوە و دواتر بیگەڕێننەوە بۆ بەندیەکەی خۆی ، کاری ئەو ڕۆژە بە نمایشی سارد خانە بەکۆتا هات. منیش بڕیارمدا هەرچی زووترە بگەڕێمەوە بۆ هۆتێل و پشوویەك بدەم، ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار نەمتوانی بەئاسودەی بخەوم هەتا بەیانی لەبارەی مەرگی تەقەوی نیاوە بیرم دەکردەوە و دووبارە بەناو یادەوریەکانمدا گوزەرم کرد، دەمبینی چۆن شاگردێکی قەصابی قەدریجانی لەپێناو پارە کەمندکێشی چ ڕێگایەك بووە و ئەم جۆرەکارانەی لە ناو خواردنەوە پێ ئاسانترە ، ئیتر بێژم لەخۆم و پارەش دەکردەوە .

زیاد لە دە جار بیرم لێکردوە، هەر لەداوی ئەوەی لەم جەهەنەمەی لیبیا ڕزگارم بوو دەچمەوە بۆ ئێران، تەنانەت ئەگەر بڕیاربێت زیندانیش بکرێم باشترە هەر لە ئێران بم. بیرم لەمانە دەکردەوە و دواتر سەرکۆنەی خومم دەکرد ، تۆ ئەوەندە ترسنۆك نەبوویت ! عبدالعامر تەقەوی نیای کوشتووە چ پەیوەندیەکی بەتۆوە هەیە ؟.

تۆ پارتیزانێکیت کاری تۆ ئەوەیە یا دەبێت بکوژرێت یا دەبێت بکوژی بۆ ئەوەی نەکوژرێت دەبێت بکوژی !.

بەیانی کاژێر ۹ ڕۆشتم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش بەتەواوەتی بیرم چووبویەوە کە دوێنێ شەو چ شەڕێکم هەبووە لەگەڵ خۆم و ویژدانم . دووبارە هەموو شتێك ئامادە و ڕێك و پێك بوو ، برادەران هەموو یان باش بوون هەم عبدالسلام و عبدالعامر هەم چایچی و ئەحمەدی ، دەبوو دەست بەکاری ڕۆژانەمان بکەین.

لەدوای خواردنەوەی قاوەیەکی تاڵی عەرەبی، بڕیار بوو من بچم لێکۆڵینەوە لە نعمانی بکەم خۆشم زۆر بەتاسەوە بووم بزانم حاڵ و تەندروستی فڕۆکەوانە گەنج و وەرزشکارەکە لەدوای ڕوداوی ساردخانەکە و بینینی تەرمی هاوڕێ و هاوپیشەکەی چۆنە؟

کاتێك، چوومە ژووری لێکۆڵینەوە یەکەمین شتێك سەرەنجی ڕاکێشام ئەوە بوو، جەمشید لەچاو دوێنێدا بەلایەنی کەمەوە پێنج تا شەش کیلۆ کەمی کردبوو. بڕیارمدا زیاد لە پێویست میهرەبان بم لەگەڵیدا، ئەوم لەباوەش گرتوو ڕوخساریم ماچ کرد. دواتر بەشێوەیەك خۆم نیشاندا کەمنیش لەژێر فشار و مەترسیدام، ئەگینا زیاتر هاوخەمیم دەردەبڕی ، ئاکار و ڕەفتاری

جەمشید وەها دەهاتە پێش چاو کە ئیتر ئەو مرۆڤە ئارام و لەسەر خۆیەی دوو ڕۆژی پێشووتر نییە، نیگەرانی و دڵەڕاوکێ وەك خۆرە بەربوو بوە گیانی ، پێم گووت : دەبێت زۆر ئاگات لەخۆت بێت ! من خۆشحاڵ دەبم بتوانم یارمەتیت بدەم ، بەلاَم ئەگەر بزانن خەیاڵێکی وام لەسەر دایە بارودۆخی منیش لەتۆ باشتر نابێت. سیمای جەمشید وەك مرۆڤێکی تازیەبار و مصیبەت دیدە دەهاتە پێش چاو.

گووتی: کاکە ! بەخودا من هیچ تاوانێکم نییە، ئەم عبدالرضایە نزیکترین هاوڕێ ی من بوو. من چۆن دەتوانم خۆشەویسترین و نزیکترین هاوڕێ ی خۆم بکوژم ، تۆ ئەوت نەدەناسی لەباشی و میهرەبانیدا وێنەی نەبوو. ئەو منداڵێکی شەش مانگەی هەیە هاوسەرەکەی هەتا ڕادەی پەرستن خۆش دەویست، چۆن دەگونجێت من ئەو بکوژم ؟

بەسەر سوڕمانەوە سەیرێکم کرد و دوای ساتێك بێدەنگی گوتم : سەیرکە تکات لێدەکەم درۆم لەگەڵ مەکە ! تۆ دەڵێیت ئەو هەتا ڕادەی پەرستن هاوسەرەکەی خۆش دەویست عاشقی منداڵەکەی بوو کەواتە چون دوێنی گوتت لەگەڵ سێ کچی ئەمریکی چووین بۆ ماڵی سۆنیا ؟ ئەمانە لەگەڵ یەکتردا ناگونجێن !.

دەستبەجێ گووتی : خودا بۆ خۆی ئاگادارە ئەومان بەزۆر برد. ئەدەهات تەنانەت کاتێك لە سەربازگەی لۆنگ ئایلەند بووین شەو ڕۆژ جگە لە نامەنوسین بۆ هاوسەر و منداڵەکەی و فرمێسك ڕشتن کارێکی تری نەبوو. حەزدەکەم باوەڕم پێبکەن تەنانەت ئەگەر ئەمانە لەسێدارەشم بدەن بۆم گرنگ نیە ، چونکە هێندە نیگەرانم لە کوژرانی تەقەوی نیا، ئیتر مردن

هیچ بۆم گرنگ نییە بەردەوام لە بیری ئەوەدام چی بەسەر ژن و منداڵەکەیدا دێیت ؟

گووتم : سەیرکە هەرجۆرێك بێت تۆ تومەتباری بەکوشتنی عبدالرضا. دەبێت هاوکاریمان بکەیت هەتا ڕاستی کوژرانی عبدالرضا ئاشکرابێت. ئەگەر بەراستی تۆ تاوانی کوشتنەکەت ئەنجام نەدابێت هۆکارێك نیە بۆ لەسێدارەدانت، دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ ئێران و سەرپەرشتی هاوسەر و منداڵەکەی عبدالرضا بگریتە ئەستۆ ، بەلاّم تۆمەتەکان یەك و دوان نین کوشتن ، دزی ، سیخوری ، بەزاندنی سنور و زۆر شتی تریش بۆ ئەمانە چ وەلاّمێکت هەیە ؟.

هێشتا قسەکانم تەواو نەبوو بوو دیسان نمایشەکەی دوێنێ ڕویدایەوە و ئەفسەرە لیبیەکە بەچەکەوە خۆی کرد بە ژووردا و سەرەتا کەوتە وێزەی من و هەتا سەربازەکان منیان بردە دەرەوە. دواتر هێرش بەرەو جەمشید دەستی پێکرد، بەهەمان سیناریۆی دوێنێ بەبێ بچوکترین جیاوازی دیسان لە ژووری نهێنی پێکەنین و گاڵتەوگەپ و قاوە و لۆکە و دیتۆڵ چاوەڕێم بوون .

ئیتر خەریك بوو کەم کەم ڕقم لە چایچی و ئەحمەدی دەبوویەوە، بیرم دەکردەوە بۆچی ئەم دوانە نایەنە ناو کاری لێکۆڵینەوە ؟ بۆچی هەر کارێك بە ئازار و ئەشکەنجە دەست پێبکات و کۆتایی پێبێت دەیخەنە سەرشانی من و ئەم دووانەش لەپشت پەردەوەن.

هێشتا قاوەکەم تەواو نەکردبوو، عبدالعامر گوتی : ئامادەیت بۆ لێکۆڵینەوە ؟

گوتم : خۆ دەیبینیت، نێچیرەکەمان هێشتا لە ژێر کوتەك کاریدایە خۆشم ئەمڕۆ بەڕادەی پێویست لێدانم خواردووە !.

هەموویان پێکەنین و... عبدالعامر گووتی : نا جەمشید نالێم !...

دەمویست بڵێم نا ! هاوار بکەم کە ئیتر ئامادەنیم هاوکاربم بۆ تاوانکاریەکانی ژەنراڵ قەزافی و کاربەدەستەکانی ، بەلأم هەموو هاوار و نارەزایەکانم لەناو قوڕگمدا پەنگیان خوارد. ساتێك دواتر هەرسێکمان بەدەم جگەرە کێشانەوە بەرەو ژووری ژمارە یەك بەرێکەوتین، هەمان ژووری عبدالرضا تەقەوی نیا کە کۆتا جار بە زیندوی لەوێ دیتبوومان ، چایچی و عبدالعامر چونە ژووری نهێنی و منیش بە بێهێزی و بێزاریەوە بەتەنهایی چوومە ژووری لێکۆڵینەوە .

لە یەکەم ڕوانیندا زۆری نەما بوو دڵم ڕابوەستێت. جێگای باوەڕ نەبوو، لەنێوان سەرسوڕماوی و شادی ، خوشحاڵی و ناباوەڕی لەنێوان خەندەو واق وڕماوی لەوەی بەرامبەرمدا بوو دەمڕوانی ، عبدالرضا تەقەوی نیا ئەو پیاوەی دوێنێ تەرمەکەی لە ساردخانە لەناو چەکمەجی مردووەکاندا دیتبووم ، ئێستا لەسەر کورسی یە و لەجێگای هەمیشەیی دانیشتووە جگەرە دەکێشێت !.

ساتێك وەستام و لێم ڕوانی، باوەڕم نەدەکرد من شاهیدی ئەو هێرش و ئەشکەنجە و توندوتیژیە بێبەزەیانە بووم عبدالعامر لەبەرامبەر ئەو کوڕە گەنجەدا بەکاری دەهێنا. دوێنێ ، هەر دوێنێ بوو لاشەی بێ گیانی ئەوم لە چەکمەجی ساردخانەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری لیبیادا بینی. ئێستا چۆن دەگونجێت هەمان قوربانی هەمان فرۆکەوان کە دوێنێ شەو بۆ

یەکەمین جار هەستم بە ئازاری ویژدانکرد نەمردبێت.  ساغ و سەلامەت لە جێگای هەمیشەی لەسەر کورسی تۆمەت لە ژووری لێکۆڵینەوە بەرامبەرم دانیشتبێت .

دەتگووت لەکاتی چوونە ناو ئەم ڕوداوانە دەبێت هەمووشتێك بۆ من بەشێوەی هەڵگەوت بێت ، هەموو شتێك لە دونیای درۆ و فریودانددا کورت دەبوویەوە.  بەهەرحاڵ ئەوە کۆمەڵە بیرێك بوون لەوانەیی هەموویان  بە چەند ساتێك لە مێشکمدا گوزەریان کردبێت ، چونکە دەست بەجێ پێکەنیم و عبدالرضا لە جێگای خۆی هەستا و سڵاوی کرد و ماچم کرد. لەبابەت ڕووداوەکەی دوێنێوە بەهێمنی هاو خەومی خۆمم بۆ دەربڕی

عبدالرضا گووتی : من نیگەرانی ئێوە بووم خەریك بوو یارمەتی منتان دەدا لەبەر خاتری ئەم سۆز نواندنە بۆ من دووچاری بێرێزی هاوکارەکانتان بوونەوە. بەهێمنی و ئارامی فەرمووی دانیشتنم لێکرد و گووتم : ئەڵبەتە ئەمانیش مافی خۆیانە هەڵەتێگەیشتنێك هەبوو سوپاس بۆ خودا چارەسەرکرا. وابیریان دەکردەوە ، چونکە منیش ئێرانیم لەوانەیە بمەوێت یارمەتی تۆ بدەم. مرۆڤی نالەبار لە هەموو جێگایەکی ئەم دونیایەدا پەیدادەبێت ، هەواڵیان دابوو کە من نەخشەی هەڵهاتنی ئیوەم داڕشتووە، بەهەرحاڵ  لەوە بگەڕێین کە ڕویدا لە کۆتایدا ڕاستیەکان ڕوون بوویەوە و دەبینیت نیستا دووبارە دۆسیەی لێکولێنەوەکەت لەدەستی مندایە ، بەڵام دەبێت تۆش بەڵێن بدەیت بە ئاگادار بوون لە هەموو ڕووداوەکان لەم لێکۆڵینەوەیەدا هاوکاربیت. یهێڵە بابەتەکە بە کۆتا بێت ، دواتر لێکۆڵینەوەم دەست پێکرد.

مەبەستی من لە باسکردنی ئەم ڕوداوانە و شیکردنەوانە بۆ دەرخستنی ڕەوش و بارودۆخی لیبیا نییە ، ئێستا ئیتر خەڵکانی دونیا بەئاگان لەو تاوانانەی دژ بە مرۆڤایەتی لە لیبیا و سوریادا ئەنجام دەدرێن.

بۆیە من ئەم یادەوەیانە بە وردی دەگێڕمەوە ، لەبەر ئەوەیە هەتا ئێوە بزانن لە دونیای سیخوڕی و زانیاری و پارتیزانی، لەکۆتایدا بوون بە پاسداری خومەینی چی دەگوزەرێت. بۆ نمونە؛ کەسێکی نەخوێندەواری قەدریجانی وەك؛ من دەبێت چ پلە و بارودۆخێك تێپەڕێنێت ، بەواتایەکی تر، من بۆیە ئەم یادەوەریانە بەوردی باسدەکەم، هەتا وەڵامی هەندێك کەسم دابێتەوە کە دەپرسن و بەسەرسوڕمانیەوە دەپرسن، بۆچی ئەم پاسدارانە هێندە دڵ ڕەق و بێبەزەین ؟ دەومەوێت بڵێم، من و زۆر کەسانی تر کە هەمووومان لە بونیادنەرانی کۆمیتەکان و سوپای پاسداران بووین، پێش ئەوەی خومەینی دەست بەشۆڕش بکات و سەربکەوێت ئێمە دەستمان بەخوێن سور بوو بوو ، جەنگمان کردبوو ، مرۆڤمان کوشتبوو ، کاولکاری و تەقینەوەمان ئەنجامدابوو .

هەمیشە باسکردنی ڕووداوەکان بەجۆرێك بوو، ئەگەر چوار کاری کوشتنمان ئەنجام بدایە، تەنها سیانیان ڕاست بوو چوارەمیان کوشتنێك لە ئارادا نەبوو، دروست وەك ڕووداوی کوشتنەکەی تەقەوی نیا. واتە نیوەی ڕووداوەکان ڕاست بوون ئەوی تر ساختە و درۆ بوون. ئەمە شێوازێك بوو هەتا خۆمانی پێ بەلاڕێدا ببەین و هەرگیز نەتوانین بڕیارێکی ڕاستگۆیانە بدەین.

هەر ئەم ئەزمونانەی لیبیا بوو بە سەرچاوەی تێگەیشتنم. لە دونیای پاتیزانیدا دەتوانرێت بەئاسانی وەك ئاو خواردنەوە یەخسیرێك ئەشکەنجە و ئازار بدەیت و بیخەیتە زیندان یان بەدەرزیەکی بێهۆشی بۆ یەك دوو کاژێر بەناوی تەرم بخەیتە چەکمەجی ساردخانەو چەرچەفی بەسەردا بدەیت ، هەتا لەناوەرۆکی ئەم سیناریۆیانە کارێك دیار نەبوو سەرەداوەکەی بەدەست کێ یە ئاشکرابێت.

لەدوای ئەزمونەکانی لیبیا، چەندینجار من ئەم ڕێکارە دژە مرۆڤایەتیانەم لە ئێرانی خۆماندا بەکارهێناوە و ئاکامی باشم لێ بەدەست هێناوە ، لەکاتی خۆیدا بەوردی لەبارەیانەوە دەدوێم ، هەرچۆنێك بێت هەفتەیەکمان بە لێکۆڵینەوە لە عبدالرضا تەقەوی نیا تێپەڕاند ، بۆ سبەی بەیانیەکەی دروست هەمان بەرنامە بەرامبەر جەمشیدی نعمانی بەکارمان هێنابوو، لەسەر عبدالرضا تەقەوی دوبارەمانکردەوە ئەمجارەیان تەرمی جەمشید لەساردخانە بوو دەبوو تەقەوی نیا ئەوی بناسیایەتەوە. ڕووی دیاری بابەتەکە ئەوە بوو هەردوکیان تۆمەتباربوون بە کوشتنی یەکتر سروشتیەن ئەم دوو فرۆکەوانە گەنجە بێئاگابوون لەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵیان، هیچ شتێکیشیان بۆ گووتن پێنەبوو ، بەڵام عبدالسلام و عبدالعامر لەکۆڵیان نەدەبوونەوە ، لە کۆتایی هەموو ڕۆژێکدا بەرنامەڕێژیان دەکرد بۆ سبەی. هەندێك بەڵێن و پەیمان و سۆز دەربڕین و ئەشکەنجە و هەڕەشە ، ئەمانەیان بەمن ڕادەسپارد دوبارە لە لێکۆڵینەوە ماندوو بێزارکەرەکانی سبەی بەکاریان بهێنم .

شتێك بۆمن جێگای پرسیار بوو، ئەویش ئەوەبوو پلە باڵاکانی ئاسایشی لیبیا هەرگیز ڕاستیەکانیان تەنانەت بە منیش نەدەگووت ، من تەنها

ئامرازێك بووم بە بێ ویستی خۆم بەدەست ئەوانەوە. لەم دوایانەدا تێگەیشتم هەموو ئەو پێشنیار و پلان و نەخشانەیان بە منیان دەگووت جگە لە درۆ و هەڵخەڵەتاندن هیچی تر نەبوون و تەنها ئاکامی کاریان لەمن دەویست .

ئەم لێکۆڵینەوانە دە ڕۆژی خایاند. لەماوەی ئەم دە ڕۆژەدا پلە بالاکانی ئاسایشی لیبیا بەڵگەی سیخوڕی و ئیمزای ساختە لەژێر پەڕاوەکانی لێکۆڵینەوە و وێنەی سێکسی و زۆر جۆری تری بەڵگەی ساختەیان دژی ئەم دوو فڕۆکەوانە ئامادەکردبوو. وەها ئەوانیان خستبووە ژێر فشارەوە ئامادەی ئەنجامدانی هەموو جۆرە کارێك بوون.

دوای دە ڕۆژ لە لێکۆلینەوە و خستنە ڕووی بەڵگەکان ، ئەگەر هاتبا و ئەم بەڵگە ساختەو ئامادەکراوانە بکەوتبایە دەست دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران یان پلە بالاکانی ئەمریکا و تەنانەت پۆلیسی نێودەوڵەتیەوە دەبوونە هۆکاری لە سێدارەدانی ئەم دوو فڕۆکەوانە گەنجە بێ تاوانانە.

ئەوەی لیبیەکان پێیان دەگووت ( کۆبوونەوەی گرنگ ) دەستی پێکرد. کاری من ئیتر تەواو بوو، ئێستا بۆ ڕۆژەکانی داهاتوو بڕیار بوو جێگای من لەگەڵ ئەحمەدی و چاپچی پێچەوانە بێتەوە و من بچم بۆ ژووری نهێنی و قۆناغێکی نوێ ی کار دەست پێبکات .

ئەو ڕۆژە، بۆ سبەینێکەی واتە ڕۆژی شەممە، کاتێك گەیشتمە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری بارودۆخی ژووری نهێنی بە جۆرێکی تر بوو ، عبدالسلام و عبدالعامر بەرگە سەربازیە هەمیشەیەکانی سوپای لیبیایان پۆشیبوو ، بەڵام ئەحمەدی و چاپچی جل و بەرگی فڕۆکەوانی

هێزی ئاسمانی دەوڵەتی شاهنشاهی ئێرانیان لەبەرکردبوو. هەروەها لە ژووری لێکۆڵینەوە پرۆژێکتۆرێکی نمایشکردنی فیلمیان دانا بوو .

کاژێر ۳۰ : ۱۰ خولەکی سەر لەبەیانی عبدالرضا تەقەوی نیا بە کەلەپچە کراوی بە جل و بەرگە فرۆکەوانیەکەی بەریەوە هێنا بۆ ژووری لێکۆڵینەوە. بە سەرسوڕمانیەوە بۆ دەزگای نمایشکردنی فیلمەکەی دەڕووانی نزیکەی نیو کاژێر بەتەنهایی لە ژوورەکەدا مایەوە هەتا ئەو کاتەی عبدالسلام و عبدالعامر و چایچی خۆیان بە ژووری لێکۆڵینەوەدا کرد. تەقەوی نیا ئاگای لە خۆی نەماو هاواری کرد سڵاو چایچی ! تۆ لێرە چی دەکەیت ؟ .

چایچی وشك و عەبوس دەهاتە پێش چاو بە هێمنی گووتی: هاتووم هەتا تۆم ڕادەست بکەنەوە !. ئەم گفتوگۆیە زۆری نەخایاند ، چونکە بە فەرمانی عبدالسلام گڵۆپی ژوورەکە کوژێنرایەوە نمایشکردنی فیلم دەستی پێکرد. فیلمەکە هەر لەسەرەتاوە بۆ منیش زۆر سەرنج ڕاکێش بوو فیلمی عبدالرضا تەقەوی نیا و جەمشید نعمانی چەند کەسێکی تری نیشان دەدا، لە سەربازگەی لۆنگ ئایلاند دەهاتنە دەرەوە و دواتر هاتنیان بۆ نیۆرك و گەڕان بەناو شەقامەکان و ڕۆشتنیان بۆ ڕستۆرانت و باڕ و دانیشتن لەگەڵ سێ کچی شۆخ و شەنگ و گرتەی سێکسی، وا دیار بوو لە ماڵی سونیا تومار کرابێت. دواتر چەند گرتەیەکی تر نمایشکران لەناویاندا تەقەوی نیا سەرگەرمی جنێودان بوو بە شا و ڕژێمی شاهنشاهی، من لە دیتنی ئەم فیلمە مات و حەیران بووم ، چونکە ئەم گرتانە زۆر ئاشنا بوون بۆم لە هەندێکیاندا منیش دەردەکەوتم ئەو قسانەی تەقەوی نیا لە فیلمەکەدا

دەیگوتن ئەوانە نەبوون لە لێکۆڵینەوەکاندا بەمنی گوتبوو، دەنگەکەش دەنگی تەقەوی نیا خۆی بوو خەریك بوو لەسەر سورمانیدا شێت دەبووم.

وێنەی تەقەوی نیا لەسەر پاسپۆرتێکی سوری نیشاندرا، زۆر گرتەی تریش نمایشکران فیلمەکە نزیکەی بسیت خولەك درێژەی کێشا، منیش لەهەندێ لە گرتەکاندا بەشداریم کردبوو. لەوەی کە دەم بینی نغرۆ دەبووم لە سەرسورمانی، چ بکات بەو بێچارە. تەقەوی نیا یەك دوو جار تانەی لە فیلمەکەدا و دەنگی نارەزایەتی لێ بەرزبویەوە ، بەلأم بە تانەکانی پێدەکەنین. کاتێك گڵۆپی ژوورەکە داگیرسێنرایەوە عبدالسلام دۆسیەیەکی ئەستوری بە چایچی دا و لەگەڵ عبدالعامر لە ژووری لێکۆڵینەوە هاتنە دەرەوە و خۆیان گەیاندە لای من.

ئەمجارە چایچی بە پێچەوانەی سەرەتای هاتنە ژوورەوەی بە ئاوازێکی هێمن و دۆستانە بە تەقەوی نیایی گووت : عبدالرضا چۆن ... چۆن توانیت ئەو هەموو خیانەتە لە نیشتمانەکەت بکەیت ؟

تەقەوی نیا گووتی : بە خودا ئەمانە هەمووی درۆن چایچی تۆ من باش دەناسی !.

چۆن درۆیە؟ مەگەر فیلمەکانت نەبینی؟ فیلمێك بەم رۆشنیە ناکرێت درۆ بێت ! تۆ بیرت لەوە نەکردەوە ئێران و سوریا پەیوەندی دۆستانە و سیاسییان پێکەوە هەیە. هەرکاتێك خاوەنشکۆ بیەوێت تۆ رادەست دەکەنەوە، سەیرکە چ چارەنوسێکت بۆ خۆت دروستکردووە.

من که هاوڕێ ی تۆم دەبێت بۆ وەرگرتنەوەت بێمە ئێرە و بۆ ئێرانت ببەمەوە ... لەوێش چارەنوست دیارە سەرەتا زیندان و لێکۆڵینەوە، دواتر بە تاوانی سیخوڕی و خیانەت ڕەمی دەکرێیت و والسلام !.

تەقەوی نیا هاواری دەکرد و دەگریا و دەپاڕایەوە و خودا و پێغەمبەری بەشاهید دەگرت، کە ئەمانە هەمووی درۆ و هەڵبەستراون. چایچی ئەمانە هەمووی دەزانی ، بەڵام بڕیار نەبوو گۆیان بۆ ڕادێرێت. نیو کاژێر دواتر دوبارە عبدالسلام و عبدالعامر چوونە ژوورەوە فیلمەکەیان دا بە چایچی و سەربازەکان تەقەوی نیایان بردەوە بۆ زیندان .

بەهەمان شێوە جەمشید نعمانی فیلمێکی هاوشێوەی بۆ نمایشکرا. دەبوو ئەوان لەو باوەڕەدا بوونایە لەسەروبەندی ڕادەستکردنەوەیانن بە پلە باڵاکانی دەوڵەتی شاهنشاهی ئێران. هەروەها زیندان و لە سێدارەدان چاوەڕێیان دەکات .

ئەم گرتە ڤیدیۆییە دروستکراو ساختانە ڕەوتی کاری لێکۆڵینەوە و دەستەمۆکردنیانی بەرەو سەرکەوتن دەبرد .

لەکۆتایی ڕۆژەکەدا کە بەڕاستی هەموومان ماندوو شەکەت بووین، عبدالسلام گوتی : دەبێت بەلایەنی کەمەوە دوو ڕۆژ لەچاوەڕوانیدا بیان هێڵینەوە هەتا ناکامی کارەکەمان مسۆگەر بکەین. بڕیاری دواتر بەشداریکردنی من لە لێکۆڵینەوە، سبەی ڕۆژی سێشەممە بوو.

کاژێر ١٠ ی شەو گەیشتمەو هۆتێلەکە و بەزووی حەمامێکم کردو نوستم. لەناکاو بەدەنگی تەلەفۆن خەبەرم بوویەوە واگومانم برد قطب زادەیە ،

بەڵام چایچی بوو داوای لێکردم بە خێرایی جلەکانم بپۆشم و لەبەردەم هۆتێلەکە ئامادەبم، هەتا چەند خولەکێکی تر خۆی دێت بەدوامدا کاتێك پرسیم چی بووە ؟  وەڵامەکەی  ئەمە بوو پەلەبکە دواتر بەزووی تێدەگەیت.

بە پەشۆکاوی لەجێگا هەستام و دەم و چاوم شت و جل و بەرگم لەبەر کرد ، بە نیگەرانی و نارەحەتی یەوە خۆم گەیاندە بەردەم هۆتێلەکە، هەزار و یەك پرسیار لە مێشکمدا بوو. ئەوەندە ڕووداوی دەستکرد و ساختەم دیبوو، خەریك بوو کەم کەم گومان لە بارودۆخی خۆم دەکرد نەبادا منیش کەوتبمە ناو تەڵەوە . ئەو بەڵایانەی بەسەر نعمانی و تەقەوی نیایاندا هێناوە بەسەر منیشدا بێنن.

چەند خولەکێك دواتر جیپێکی سەربازی گەیشت، جگەلە شوفێرەکە و چایچی کەسی تری تێدانەبوو، گوتم : چی بووە کە دەبێت بەم شەوە بگەڕێنەوە بۆ بەڕیوەبەرایەتی ؟

چایچی وەڵامی دایەوە گوتی : ناچین بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەچین بۆ نەخۆشخانە ..!

پرسیم بۆچی نەخۆشخانە مەگەر چی ڕوویداوە ؟ لەوکاتەدا چایچی پەشۆکاو نیگەران دەهاتە پێش چاو، گوتی : لەوانەیە شتێکی گرنگ نەبێت تەقەوی نیا هەوڵی خۆکوشتنی داوە !. یەکسەر گووتم لەو جۆرە خۆکوژیانە ؟  پێکەنی و گووتی نا هەربەڕاستی هەوڵی خۆکوشتنی داوە. گووتم : کەواتە دەتەوێ بڵێیت ئەمجارە چیرۆکی سادرخانە و پزیشکی دادوەری ڕاستەقینەیە ؟

گوتی : ئەگەر درەنگ بکەین و دکتۆرەکان دەست و برد نەکەن لەوانەیە !.

پرسیم: دەبێ چی بکەین؟

گوتی : هەرلەبەر ئەمەیە هاتم بەشوێنتدا و خەبەرم کردیتەوە. خۆ دەزانیت من مۆڵەتی ئەوەم نیە ڕووبەڕووی ببمەوە ، من نوێنەری دەوڵەتی ئێرانم دەبێت تۆ بەهانایەوە بچیت و کارەکانی بۆ ڕێکبخەیت.

گووتم: مرۆڤێك لە لیواری مردندایە من دەتوانم چ کارێکی بۆ ئەنجام بدەم من کە دکتۆر نیم ! گوتی: لەبیرت بێت ئێرە لیبیایە و دکتۆر و پەرستارەکان فارسی نازانن، تۆ دەبێت یارمەتی بدەیت بە جیپە سەربازیەکەوە بەخێرایی خۆمان کرد بەناو نەخۆشخانەی سەربازی طرابلس. عبدالعامر لە تەنیشت دەرگای چوونە ژوورەوەدا چاوەڕوانی ئێمەبوو، بەخێرایی لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم و پرسیم هەواڵ چیە ؟ بە ئارامی و لەسەر خۆ گووتی : لە ژووری نەشتەرگەریە !.

پریسم هیچ هیوایەك هەیە ؟ عبدالعامر وەڵامی دایەوە تەنها خودا دەزانێت، دەمارەکانی دەستی بڕیوە .

خۆشبەختانە عبدالرضا تەقەوی نیا لەمەرگ ڕزگاری بوو . بەکەوچکی نانخواردن بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دەمارەکانی دەستی بڕی بوو، ڕزگار بوونی لەمەرگ وەك معجیزە وابوو ، چونکە کاژێر ٨ ی بەیانی لە ژووری نەشتەرگەری هێنایانە دەرێ، دیار بوو نەشتەرگەریەکی قورس و ئاڵۆزیان بۆ ئەنجام داوە . ئەو هێشتا بێهۆش بوو. گواستیانەوە بۆ ژوورێکی تایبەت و مۆڵەتیاندا من لای بمێنمەوە کاژێر ٩ ئەحمەدی و عبدالسلام هاتن . من

خۆشحاڵ بوون لە مردن ڕزگاری بووە ، ئەوانیش خۆشحاڵ بوون لەوەی کە بەهانەیەکی چاکیان دەستکەوت هەتا زوتر بەرامبەرەکەیان دەستەمۆ بکەن.

عبدالسلام هەندێ فەرمانی نوێ ی پێدام و دواتر لەگەڵ ئەحمەدی ڕۆشت .

جارێکی تر سەری ڕێسەکە هاتەوە دەستم ، کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ تەقەوی نیا هاتەوە هۆش خۆی و چاوەکانی کردەوە . کاتێك بینی من لە تەنیشیتدام خۆشحاڵ بوو ، بەڵام دەبوو کەمێکی تر چاوەڕێ بومایە هەتا بتوانێت قسە بکات.

کاتێك توانی قسەبکات هەوڵمدا میهرەبانبم لەگەڵیدا ، هەندێ ئامۆژگاریم کرد ، پێش ئەوەی بیەوێت سوپاسم بکات گوتی : لەم دونیادا هیچ مرۆڤێکی لە من میهرەبانتر نەدیووە ! دواتر لەبارەی ڤیدیۆکەوە گووتی : نازانم چۆن ئەو قسانەم کردووە، کاتێك گەیشتەسەر باسی ئێران و چارەنوسە چاوەڕوانکراوەکەی هێندە نیگەران و بێ قەراربوو کە هیچ گومانێکم لەوەدا نەبوو ئەگەر بتوانیایە جارێکی تر ئەزموونی خۆکوژی دوبارە دەکردەوە .

دڵنەوایی زۆرم کرد و چیرۆکی زۆرم بۆ گێڕیەوە لەبارەی ئەو کەسانەی بە بێتاوان براونەتە بەر پەتی سێدارە و دواتر بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا ڕزگاریان بووە. هەوڵمدا کەمێك هێمن و ئارامی بۆ بگێڕمەوە ، چونکە وابیرم دەکردەوە بۆ ئازاردانی و هێنانە ژێر بار بەڕادەی پێویست کاتمان هەیە و دەبێت .

چەند ڕۆژێك دواتر عبدالرضا لەنەخۆشخانە گوازرایەوە بۆ زیندان ، ئێستا ئیتر هەردوکیان دڵنیابوون بەزوی لەلایەن پلە باڵاکانی سوپاوە ڕادەستی

هێزی ئاسمانی ئێران دەکرێنەوە و لە تەهران دادگایی دەکرێن و لەسێدارەدان چاوەڕێیان دەکات .

ئەو بەیانیەی تەقەونیا لە نەخۆشخانەوە گوازرایەوە بۆ زیندان بەفەرمانی عبدالسلام چووم بۆ لای ، چونکە پێشتر کارەکە لەگەڵ نعمانی تەواوکرابوو بەڵێنی هاوکاری لەگەڵ ڕژێمی بۆ وێنە؛ سوریا، بەلاّم لە ڕاستیدا لیبیا ی لێوەرگیرابوو، ئێستا ئیتر نۆبەتی تەقەوی نیا بوو .

پێم گووت : زۆرم خۆش دەوێت ، چونکە هاونیشتمانییەکین نیازم وایە یارمەتیت بدەم، لە خۆشحاڵیدا خەریك بوو لەپێستی خۆی دەهاتە دەرەوە. وابیری کردبویەوە خەریکم پلانی هەڵهاتنی دادەڕێژم زۆر زوو دانی بەمەدانا ، بەلاّم ئاگادارم کردەوە بەهیچ جۆرێك ناتوانرێت ئەو کارە ئەنجام بدرێت ، درێژەم بە قسەکانم دا و گووتم : سەیرکە! تۆمەتەکانت زۆر قورسن، هەرکە پێت نایە ناو خاکی ئێرانەوە ڕەمی کراویت. ئەم هەوڵی خۆکوژیەی تۆ ئەوەی بەبیری مندا هێنا. قسە لەگەڵ بەرپرسەکانی ئێرەدا بکەم هەتا بە جۆرێك ڕەزامەندیان وەربگرم بە نێراوەکانی دەوڵەتی ئێران بڵێن تۆ خۆت کوشتووە یان هەڵهاتوویت. لە بەرامبەردا تۆش بەڵێن بدەیت لێرە بمێنیتەوە و لەگەڵ بەرپرسەکانی ئێرەدا هاوکار بیت .

لەتەواوی ئەوماوەیەدا تەقەوی نیا بەتاسەوە گوێ ی بۆ قسەکانم گرتبوو ، دەستەکانی بەیەکدا داو گووتی : واتە دەبێت دەست بکەم بە خیانەتکردن لە نیشتیمان .

گوتم: ناوی هاوکاری یە ، بەلاّم ئایا چارەیەکی ترت هەیە؟ ئەگەر هەیە بڵێ هەتا منیش یارمەتیت بدەم !.

گوتی : نازانم .... نازانم ، بەڵام ئایا تۆ لەبارەی ئەم بابەتەوە قسەت لەگەڵ پلەباڵاکانی ئێرەدا کردووە ؟

شانەکانم بەرز کردەوە و گوتم : نا ! واتە هێشتا نا لەهەمووی گرنگتر ، لەوانەیە ئەسڵەن ڕازی نەبن و دۆخی منیش خراپتر بێت بەهەرحاڵ کارێکی سادە و ئاسان نیە.

تەقەوی نیا کەمێك بێدەنگ بوو لەناکاو ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی : دەبێت بیری لێبکەمەوە ! شەوێك مۆڵەتم بدە .

گوتم: هەر جۆرێك ئارەزووتە ، بەڵام وای بۆدەچم سبەی لای نیوەڕۆکەی مەراسیمی ڕادەست کردنەوەت بە نێردراوەکانی ئێران دەست پێبکات. دەبێت خێراتر چارەنوسی خۆت دیاری بکەیت دەزانی دەبێت سەرۆك کۆمار بڕیاری کۆتایی بدات ، دەست گەیشتن بە ئەو لە خولەکەکانی کۆتایدا کارێکی ئاسان نیە .

بە خەندەیەکی تاڵ کە یەکەمین بروسکەی خۆبەدەستدانەوەی تێدا بەدی دەکرا گووتی : کەواتە هەر ئەمشەو وەڵامت دەدەمەوە .

شەو هات و دیسان چومەوە زیندان، بۆ وەرگرتنەوەی وەڵام لە نێوان فرمێسك و ئاه و ئەفسوس خۆی دابەدەستەوە و ڕەزامەندی خۆی نیشاندا . تەنها نیگەرانی بارودۆخی هاوسەر و منداڵەکەی بوو هیچ بەڵێنیەکم پێنەدا ، بەڵام گووتم : هەر ئەمشەو دەچم لەگەڵ بەرپرسەکانی سوریا قسەدەکەم بەڵکو بگەینە ڕێکەوتن، دواتر ئاکامەکەیت پێڕادەگەیەنم، ئەگەر ئەوان

ڕەزامەندبن بەمانەوەت لەوانەیە بکرێت هاوسەر و منداڵەکەیشت بهێنن بۆ ئێرە .

نعمانی لە نواندنێکی هاوشێوەدا ڕەزامەندی خۆی دەربڕیبوو. ئێستا دوو ڕۆژە لە زیندان گوازراوەتەوە بۆ خانوویەکی هێمن، لەژێر چاودێری بەرپرسەکانی لیبیا خەریکی تێپەڕاندنی خولێك بوو هەتا ڕۆژێك بەسود بێت بۆیان ، نعمانی ژیانی هاوسەری پێکنەهێنابوو بۆیە لەتەقەوی نیا هێمن تربوو زوتر خۆی دابەدەستەوە و ژیانی گۆڕییەوە لەهەمبەر لەسێدارەدان.

بەفەرمانی عبدالسلام سبەی بەیانیەکەی مافی ئەوەم نەبوو بچم بۆ دیداری تەقەوی نیا. دیسان دەبوایە ئەویان ڕووبەڕووی چەند گرتەیەکی ساختەی تر بکردایەتەوە ، پێش نیوەڕۆ دەچنە لای و دەیبەن بۆ سەرتاشخانەو و حەمام ، ئاگاداری دەکەنەوە تا چەند کاژێرێکی تر ڕادەستی نێرداوەکانی ئێرانی دەکەنەوە. تەقەوی نیا یەك لەدوای یەك هەواڵی من دەپرسێت، ئەوانیش هەموو جارێك وەڵامێکی سەرپێ ی دەدەنەوە.

لەناکامدا چەند خولەکێك پێش ئەوەی وادەی چاوەڕوانکراو کۆتایی پێ بێت، بە هەناسە برکێ ڕۆشتم بەداویدا ، لەکۆتایدا مژدەی ئەوم پێدا ڕەزامەندی تایبەتی سەرۆك کۆمارم بۆ وەرگرتووە و ئەگەر هاوکاریەکانی بەسود بێت بۆ پلە باڵاکانی سوریا گواستنەوەی ژن و منداڵەکەشی بۆ ڕێکدەخەن.

چەند کاژێرێك دواتر عبدالرضایان گواستەوە بۆ خانویەکی هاوشێوەی نعمانی، هەتا دەورەیەکی تازە و ژیانی نوێ دەست پێبکات .

شتێك لێرەدا گرنگە دەمەوێت بیڵێم، ئەم چوار کەسە ( رضا چایچی ، حەمید ئەحمەدی ، جەمشید نعمانی ، عبدالرضا تەقەوی نیا ) دوای بەشداریکردن لە چەندین کاری تیرۆرستی لە ئەردەن و ئیسرائیل و فڕاندنی فڕۆکە نزیکەی یەك ساڵ لە لیبیا مانەوە . دواتر بەناوونیشانی پاسەوانی خومەینی لە نوفل لوشاتۆ لەگەڵ من هاوکار بوون پاشان هەموومان بە فڕۆکەی ئێر فرانس لەگەڵ خومەینی گەڕاینەوە بۆ تەهران .

هەرچواریان لەیەکەمین ڕۆژەکانی هاتنەوەمیان بۆ تەهران، بوون بە سەردەستەی فڕۆکەوانە ساختەکان و لەبەرامبەر خومەینیدا بەنمایشی سەربازی تێپەڕین . ئەم نمایشە چەواشەکاریە بووە هۆکاری لێکترازان و تێکشکانی سوپای شاهنشاهی و ڕووداوگەلێك هەرکە کاتی هات لەبارەیەوە دەدوێم.

ئەگەر بمەوێت یادەوەریەکانی ڕۆژانەی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە ساڵانێك دەخایەنێت ، بەڵام ئەم دوو سێ بابەتەی باسم کرد، دەتوانێت نیشانی بدات تۆوی کۆمیتەکان و سوپای پاسداران لەلایەن چ کەسانێك و بە چ ئەزمونێك و چ جۆرە بیرێك چێندراوە .

هەمووان لەسەرەتادا فریوی پارەی بێ ڕەنج و بێ دەردی سەری یان لەڕێگای دۆسیە دروستکرن وەك ئەوەی نعمانی و تەقەوی نیا ، گیرۆدەبووین و هەنگاومان لەم ڕیگایە هەڵهێنا. لەدوای ئەم پلەیەشەوە دەستەڵات لەزەتی پێدەبەخشین، چەك و پشتگیری دەوڵەتە تیرۆرست پەروەرەکان دلگەرمی دەکرین، هەرئەوەی کە دەستمان بەخوێن سور بوو ئیتر بە هیچ جۆرێك ڕێگای گەڕانەوەمان بۆنەمایەوە. بە ئەنجامدانی تاوانێکی سادە، کوشتن و

تەقینەوە و وێرانکاری، کومەڵکوژی بەدوای خوێدا دەهێنا و لەئەنجامدا ناشرینی و خراپکاری و گوناە لە دەروونماندا نەدەماو بەزووی ئەم کارانە بووبە خولیا بۆمان.

بۆ نمونە؛ ئەو شەوەی لە سەربانی ڤوتابخانەی ڕەفاە[٧] لەبەرامبەر چاوی ئایەتوڵا تازە بەدەستەڵات گەیشتووەکان، نیشانەمان لە دڵی ئەفسەرانی سوپا گرتبوو هەتا کۆتایی بەژیانیان بهێنین، ئیتر شتێك بەناوی ترس لە کوشتن لە ئێمەدا بوونی نەبوو ، لەوانەیە ئەمەش سروشتی نەبوو بێت هەر ئەمەش بوبێ بە هۆکار ئەوەی خومەینی بڵێت پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاو بکەینەوە دەستەی ڕەمی فلسطین یەکان پێکیان هێناوە ،

بەڵام ڕاستت دەوێت کوشتن ئیتر ڤسەی سەر و بنی زمانی ئێمەو بوو .

ئەگەر لەزەتیشمان لێنە دیتبا بەلایەنی کەمەوە دلگرانیش نە دەبووین، ئیتر ئەمە بووبووە دونیای ئێمە ، بەهەرحاڵ لەدوای ڕووداوی دوو فڕۆکەوانەکە و خۆبەدەستەوەدانیان و دەستەمۆکردنیان هەموو ڕۆژێك من وەك کارمەندێکی ئەرك ناس لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری ئامادە دەبووم، لەگەڵ عبدالسلام و عبدالعامر، ئەحمەدی و چایچی لەبارەی بابەتی

---

[٧] دامەزراوەیەکی فەرهەنگی تەهران بوو، نزیکەی چل ساڵ لەمەو بەر وەك ناوەندێکی پەروەردەی ئیسلامی ئافرەتان بنیاد نرا ئەم دامەزراوەیە لەلایەن محمەد جواد باهنر ، محەمەد علی ڕەجایی ، سەید محمەد بەهەشتی و عەلی ئەکبر هاشمی ڕەفسەنجانی کە نەیاری ڕژێمی شاهنشاهی بوو دامەزرێنرا بۆ کاری فەرهەنگی و سیاسیی سودی لێوەردەگیرا. وەرگێڕ

هاوشێوه دەدواین . بە نۆبەت سەرمان لە نعمانی و تەقەوی نیا دەدا، ئەوانمان پەروەردە دەکرد و ڕاهێنانمان پێدەکردن.

ئەمەش لێرەدا بڵێم، ئەوان بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك یەكتریان بە مردوو لەقەڵەم دەدا، لەكاتێكدا هەردووكیان لەیەك شاردا بوون.

كاتێك ڕاستیەكەیان بۆ ڕوون بویەوە ئیتر زۆر درەنگ بوو ، چونكە هاوڕێیانی سادە دڵی ئێمە، دەستیان بە خوێن و كوشتار و ڕفاندنی فڕۆكە پیس بووبوو. ئارامترین جێگا بۆیان تەنها بارەگای ژەنەڕاڵ قەزافی بوو.

هاوسەر و منداڵەكەی تەقەوی نیا هەر لە تەهران مانەوە بێ ئەوەی هەوڵێك لە ئارادابێت لەبارەی گواستنەوەیان بۆ لیبیا ، بنەماڵەی تەقەوی نیا و نعمانی باوەڕیان بەوە كردبوو كە ڕۆڵەكانیان لە لایەن ساواك و دژە هەوالگری سوپا لە ئەمریكا تیرۆركراون و لاشەكانیان فڕێداونەتە ڕوباری هیدسۆن ی نیۆرك. تەنانەت پرسەشیان بۆ دانابوون، ئەڵبەتە لەسەر بنەمای هەواڵێك لەیەكێك لە ڕۆژنامەكانی بەیروت بەفەرمانی عبدالسلام چاپكرابوو بەو دەرئەنجامە گەیشتبوون ، بەڵام لەدوای شۆڕش ڕاستیەكانیان بۆ ئاشكرابوو. خۆشبەختانە هاوسەرەكەی تەقەوی نیا وەفادار بوو بۆ عیشقەكەی لەسەر ژیانی خۆی بەردەوام بوو هەتا مەرگی دڵتەزێنی تەقەوی نیا هاتەپێشەوە .

قطب زادە بەڵێنی پێدابووم لەماوەی یەك هەفتەدا بگەڕێتەوە بۆ طرابلس دوو مانگ نەگەڕایەوە ، بەڵام هەموو هەفتەیەك دووجار تەلەفۆنی بۆ دەكرم لەماوەی ئەو دوومانگەدا دەوڵەتی لیبیا دووجار دوو هەزار دۆلای وەك مانگانە پێدام .

کاتێك قطب زادە لەدوای دوو مانگ و چەند ڕۆژێك گەڕایەوە بۆ طرابلس. لەبارەی ئەوەی کە ئەنجامم دابوو، پرسیاری لێکردم. دواتر هەواڵی دادگایی کردنی سەید مەهدی هاشمی و کەسە نزیکەکانمی پێدام ، دووبارە ئامۆژگاری کردم گەڕانەوە بۆ ئێران بەفازانجم نییە هەروەها گووتی : حەزدەکەیت لەگەڵم بگەڕێیتەوە بۆ پاریس یا هەردەتەوێت لە لیبیا بمێنیتەوە ، زۆر ڕاستگۆیانە وەڵامم دایەوە گووتم : پاریسم خۆش دەوێت ، بەڵام ئەم مانگی دوو هەزار دۆلارە خراپ لەزەتی چوومتە بن دانم ، ئەگەر بڕیار بێت لەپاریس وەك هاوڕێ مشەخۆرەکانت بێکاربم ئەوا بڕیار دەدەم لە لیبیا بمێنەوە و دۆلار لەسەر دۆلار کۆبکەمەوە، بەو مەرجەی بتوانیت کارێکم بۆ بکەیت چەند مانگ جارێك سەفەرێك بکەم بۆ پاریس . قطب زادە دەمی لە پێکەنیندا بۆ دانەدەخرا گووتی : لەگەڵ بەرپرسەکانی لیبیا قسەدەکەم و ئاکامەکەیت پێ دەڵێم .

هەواڵی پاتریسیام لێپرسی، بە زەردەخەنەوە گووتی: ئەگەر زوو بەهانایەوە نەچیت وەفاداریەکەی ئەبەدی نابێ بۆت. من هەمیشە لەگەڵ قطب زادە خۆشحاڵ و ئاسودە بووم ، چونکە ئەو خۆشگوزەرانێك تەواو عەیار بوو. هەرساتێك دانیشتن لەگەڵی ئەزموونێکی تازە و دڵچەسپ لێوەی فێر دەبووم . مانگێك لە طرابلس مایەوە دواتر پێکەوە بەرەو پاریس کەوتینە ڕێ. بەرپرسەکانی لیبیا زۆر ئاسودە بوون بە هاوکاریەکانی من. هەرلەبەر ئەمە بڕیارياندا دوای گەڕانەوەم لە پاریس خانوویەك لەگەڵ چێشت لێنەر و ئۆتۆمبێلێك بە شۆفێری تایبەتەوە بۆم دابین بکەن، هەتا لە مانەوە لەو هۆتێلە نەفرەتیە ڕزگارم بێت. قطب زادە گووتی : ئامادەم کارێك بکەم هەتا پاتریسیا بێت بۆ لیبیا ، بەڵام بەو مەرجەی لەو مانگی دوو هەزار

دۆلارەی وەریدەگریت هەزار دۆلاری بدەیت بە ئەو. گووتم : لە پاریس لەبارەیەوە دەدوێن .

لەگەڵ قطب زادە سواری فڕۆکەی لیبیا بووین. سەرەتا لە لەندەن دابەزین ، دواتر بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بکەین بەرەو پاریس کەوتینە ڕێ ، جگە لە فڕۆکەکانی لیبیا ئەوانی تر تەنها یەکجار مۆری هاتن و چونیان لە پاسپۆرتەکانیان دەدا بۆچی ؟ هەرگیز تێنەگەیشتم !.

دوبارە شەو هەمووومان ( من ، قطب زادە ، بنی صدر ، سەلامەتیان ، حەبیبی ، پائتریس و پاتریسیا ) لەدەوری یەك کۆبوینەوە ماوەی سەفەرەکەم بۆ پاریس بڕیار بوو بیست ڕۆژ بێت ، بەلآم بەمەیلی خۆم کورتم کردەوە بۆ پانزە ڕۆژ، دواتر گەڕامەوە بۆ طرابلس. دەوڵەتی لیبیا ڕازی نەبوو بەهاتنی پاتریسیا بۆ طرابلس ئەمە قطب زادە وای دەگووت. لەوانەشە درۆی کردبێت ، بەلآم بەهەر حاڵ منیش ئەو کەسە نەبووم مانگی هەزار دۆلار بدەم بە پاتریسیا. لەو ماوەیەدا هەردوومانگ یان سێ مانگ جارێك دەگەڕامەوە بۆ پاریس، هەرجارێك دەگەڕامەوە هاوڕێ پاریسیەکانم گرفتار تر لە جارانی پێشوو دەبینی تەنها ساتە خۆشەکانم لای قطب زادە تێدەپەڕی.

ئەوانی تر هێندە سەرقاڵ بوون بە گفتوگۆی سیاسی بەرنامە ڕێژی بەڕاستی ئامادەبوون لە دانیشتن و کۆبوونەوەکانیان بێزارکەر و تاقەت پچڕێن بوو ، هەرجۆرێك بێت ئەوکاتە هەتا پێنج ڕۆژ پێش سەفەری خومەینی بۆ پاریس من دانیشتووی لیبیا بووم. لە بەڕێوبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری

طرابلس سەرگەرمی کارکردن بووم، جارجارێك سەرێكم لە هاوڕێ و دۆستە پاریسەکانم دەدا دەگەڕامەوە بۆ لیبیا.

ئەوەی منی بۆ پاریس کەمەند کێش دەکرد جگە لە دیداری قطب زادە و خەوتن لەگەڵ پاتریسیا ئەو تەلەفۆنانە بوو بۆ ئەسفەهانم دەکرد، هەتا لەگەڵە دایك و باوکم و داود قسەبکەم . هۆکاری تەلەفۆنەکانم زیاتر لەبەر ئەوە بوون بزانم هاوڕێیان لەسەر قسەی خۆیان ماون یان نا ؟ ئایا بەشێوەیەکی بەردەوام پارە دەدەن بە باوکم و هیچیش دەخەنە سەر ئەژمارە بانکییەکەم؟ وەڵامەکەش هەمیشە بەڵێ بوو .

تەنها یەکجار سووربووم لەسەر گەڕانەوەم بۆ ئێران، ئەویش ئەوکاتە بوو دادگایی کردنی سەید مەهدی هاشمی و نزیکەکانم بە تۆمەتی کوشتنی ئایەتولاّ شەمس ئابادی ڕوویدابوو، هەتا لە لیبیاوە خۆم گەیاندە پاریس دادگا بڕیاری خۆی دەرکردبوو. سەید مەهدی هاشمی ئەو پیاوەی بووە هۆکاری ئەو هەموو پارە زۆرەی لە خۆڕا دەستم دەکەوت بە دووجا لە سێدارە دان حوکم درا بوو.

من ئەوکاتە نەمدەزانی مانای دووجار لە سێدارەدان چی یە. هەر ئەوەندە خۆش بوو قسە کەوتە دەمی قطب زادە ئیتر بوومە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی. بە قطب زادەم گووت : بە هەرشێوەیەك بێت دەبێ من خۆم بگەیەنمە ئێران و یارمەتی سەید مەهدی هاشمی بدەم، هەتا لە زیندان هەڵبێت. پێمگووت من ئیتر تەنها نیم بەلایەنی کەمەوە پەنجا هەتا شەست کەسی وەك خۆم لە لیبیا لەژێر دەستمدا کار دەکەن و لەهیچ شتێك ناترسن، دەتوان کێو لەبن بێنن بەهەر نرخێك بێت سەید مەهدی ئازاد

دەکەین ، قطب زادە گووتی ؛ یەکەم لە کوێ ڕا دیارە ئەو شەست کەسە بەبێ مۆڵەتی قەزافی دەتوانن هاوکاریت بکەن

دووەم ؛ هێشتا هەواڵێك نیە. ئەمە تەنها بڕیارێکی سەرەتاییە و من و کونفیدراسیۆن لەهەوڵی بە نێودەوڵەتی کردنی بابەتەکەین و هەرگیز حوکمەکە جێبەجێ ناکرێت

سێیەم ؛ دواتر بڕیاری دادگا دەنێردرێت و بۆ دادگای تێهەڵچوونەوە و گۆڕانکاری بەسەردا دێت . چوزانم هەزار و یەك جۆر فڕوفێڵی یاسایی تر ، لەوکاتەدا داوای لە بنی صدر دەکرد پشتگیری قسەکانی بکات و بە پێکەنینەوە گووتی؛ ئێستا دەزانی مانای دووجار لەسێدارەدان چیە ؟ گووتم نا

گووتی ؛ واتە ئەگەر جاری یەکەم ویستیان لەسێدارەی بدەن، تۆ و سوپا شەست کەسیەکەت نەگەشتنە تەهران ئەوا بۆ جاری دووەم دەگەن . دواتر لەگەڵ ئەوانی تر بەدەنگی بەرز دەستیان بە پێکەنین کرد .

دوای ئەوەی ویستم دوبارە بگەڕێمەوە بۆ لیبیا، دیار بوو لەسەر خواستی قطب زادە ئایەتوڵا بەهەشتی و پەرومرش و باوکم بە تەلەفۆن قسەیان لەگەڵ کردم و کە گەڕانەوە بۆ ئێران لە مێشکی خۆم دەرکەم. باوکم گوتی؛ ئەمە پەیامی بەڕێز مەهدی خۆیەتی ، جگە لە خۆبەدەست دانەوە چارەیەکی ترم نەبوو.

بەناچاری و بێ ئاگا لەهەموو شتێك گەڕامەوە بۆ لیبیا و درێژەم بە کارە هەمیشەیەکەمدا . تەنها دڵخۆشیم پارە پەیداکرن بوو، هەرئەوەندە و

والسلام. لەبەر خاتری پارە ئامادەی ئەنجامدانی هەموو کارێك بووم ، لە لیبیا خۆشم دەگوزەراند کەم کەم هەستم دەکرد خەریکە دەبم بە کەسایەتیەکی گرنگ و نوێ، کەسایەتیەك ئیتر ناتوانێت لە هەژاری و دوکانی قصابیدا بژێت ، چونکە ئیستا ئیتر خاوەنی مانگانەیەکی باش و چێشتلێنەر و شۆفیری تایبەتم. لە کاتێکدا دەمزانی هەردووکیان کارمەندی نهێنی ئاسایش و هەوالگری ڕژێمەکەی قەزافین .

ڕۆژێك بەیانیەکی زوو بەکاتی طرابلس قطب زادە تەلەفۆنی بۆ کردم و گووتی : هەرچی زووترە خۆت بگەیەنە پاریس ، چونکە کارە سەرەکیەکان دەستی پێکردووە. ئامادە بوونت لە پاریس و تەهران لە لیبیا گرنگترە. قطب زادە گووتی؛ لەم بارەیەوە قسە لەگەڵ پلە بالآکانی طرابلسدا دەکەم ، چونکە ئەوانیش ئاگاداری وورد و درشتی بابەتەکەن، دەتوانن بەیەکەمین فڕۆکە بتگەیەنە پاریس، هەرچیەکت هەیە لەگەڵ خۆت بیهێنەوە بۆ پاریس ، چونکە ئیتر ناگەڕێیتەوە بۆ لیبیا .

لەو کاتەدا سەرم لەسیاسەت دەرنەدەچوو، نەبووم بە سیاسی. ڕێڕەوی ژیانم زیاتر بە ناو چڵکاوی تیرۆرستی و پارتیزانیدا تێدەپەڕی، هەرکە لە دەمی قطب زادە گوێ بیستی ناوی تەهران بووم وا گومانم برد بەرنامەی ڕزگارکردنی سەید مەهدی هاشمی ئامادەی جێبەجێکردنە و ئێستا نۆرەی منە هەموو چاکە و پیاوەتیەکانی بە دەرهێنانی لە زیندان بدەمەوە . دوای کەمتر لە ٢٤ کاژێر لە فڕۆکەخانەی طرابلس ئامادەی فڕین بووم بەرەو پاریس. عبدالسلام و چایچی بۆ ماڵئاوایی و بەڕێکردنم هاتبوونە فڕۆکەخانە. هەر لەوێدا بوو عبدالسلام چەکێکی پەنجا هەزار دۆلاری

بەناوی دیاری لەلایەن قەزافی یەوە پێدام، بەڕاستگۆیانەوە دەیڵێم ، ئەگەر بابەتی ڕزگارکردنی سەید مەهدی هاشمی لە مێشکمدا نەبوویایە، هەرگیز ئامادە نەبووم ئەو پلە و جێگایەی لە بەڕێوبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگری لیبیا بەدەستم هێنا بوو بەجێیبهێڵم.

لەماوەی گەشتەکەم لە طرابلسەوە بۆ پاریس، دانی پێدادەنێم بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەوساتانەی تەمنم لە قدریجان تێپەڕی بوو، هیچ کات بەهێندەی ئێستا جگە لە پێشکەوتن و بەرەو بەزری چوون هیچی ترم لەخۆمدا نەدەدیت. ئەمجارە پێچەوانەی جارەکانی تر نەچوومە لەندەن. لە فڕۆکەخانەی ئورلی باشوور، بنی صدر و قطب زادە هاتنەبوونە پێشوازیم . بەزووی بۆم ڕوون بویەوە دیسان جیگای مانەوەم نوسینگەکەی قطب زادەیە. تەنانەت پێش ئەوەی بگەمە نوسینگەکە زانیم ئەو بەرنامە و پلانانەی بۆ ڕزگارکردنی سەید مەهدی هاشمی دامنابوون، جگە لە خەون و خەیاڵ و سەراب هیچی تر نەبوون.

هۆکاری ئامادە بوونی من لە پاریس و دواتر لە تەهران گرنگتر بوون لە سەید مەهدی هاشمی ، ئێستا کاتی ئەوەیە بڵێم پێچەوانەی ئەوەی کە دەگوترێت و دەنوسرێت مانەوەی خومەینی لە پاریس هەرگیز بەڕێکەوت نەبووە ، بەڵکو هەموو شتێك لە پێشتردا بەرنامە ڕێژی بۆ کرابوو. بەلایەنی کەمەوە خودی خۆم ئاگادار بووم، لەساتی هاتنی بۆ پاریس واتە پێنج ڕۆژ پێش ئەوەی خومەینی بگاتە پاریس، زانیاریمان هەبوو لەوەی چ کاتێك لەگەڵ چ کەسێك بە چ هێڵێکی ئاسمانی دێتە پایتەختی فەرەنسا ، لەبەر ئەوە ڕۆشتنی خومەینی لە عێراقەوە بۆ سەر سنوری کوێت و ڕێگری

له چوونەناوەی بۆ کوێت، لەلایەن بەرپرسەکانی ئەو وولاتە جگە لە سیناریۆیەکی ئەمریکی و فەرەنسیەکان بۆ ڕاکێشانی ڕای گشتی و نیشاندانی ستەمکردن لەو پیرە پیاوە هیچی تر نەبوو .

خومەینی و بەرنامە دارێژەرانی لە پاریس دەیانزانی بەرپرسانی کوێت مۆڵەتی ئەویان نیە ڤیزای چونەناو کوێتی پێبدەن. دەبێت ئەو بەپێ ی بەرنامەیەکی پڕ لە سەرو سەدا بچێتە پاریس .

ئەو ڕۆژەی گەیشتمەوە فەرەنسا، بۆ سبەیەکەی شاهیدی بینینی کۆبونەوەیەك بووم لە هوتێل مریدینی پاریس. لەو نێوەندەدا زانیاریم لەبارەی ئەو ئەو بەرنامەڕێژیانەوە دەست کەوت . خەریك بوو بیرم بچێت ئەو ڕۆژەی گەشتمەوە پاریس قطب زادە داوای لێکردم سی کەس لەو پارتیزانانەی بەردەستم کە متمانەی زۆرم پیان هەیە هەڵبژێرم ناوەکانیانی پێبدەم ، هەتا لەدوای وەرگرتنی ڕەزامەندی قەزافی بەناوی گاردی تایبەتی و پاسەوانی تایبەتی خومەینی لە طرابلسەوە بهێنرێن بۆ پاریس.

هەمان ڕۆژ لیستی ناوەکانم دا بە قطب زادە ، سروشتی بوو ( چایچی ، ئەحمەدی ، نعمانی ، تەقەوی نیا ) لە لیستەکەدا لەسەروی ناوە هەڵبژێردراوەکانەوە بوون.

هەر بەو جۆرەی گووتم، هەرکە گەشتمەوە پاریس سبەی بەیانیەکەی لەگەڵ (قطب زادە ، بنی صدر ، سلامتیان ، غضنفرپور ، خانم سیدفی ، علی و خسرو شاکری ، خسرو قشقایی ، حبیبی ) ڕۆشتین بۆ هوتێل مریدینی پاریس. لەو کۆبونەوەیەدا بۆیەکەمجار بە دکتۆر ئیبراهیم یەزدی ئاشنا

بووم، لەگەڵ چەند ئەمریکیەك لەوانە ( ڕەمزی کلارك ، ریچارد کاتم ، فالك ، راند ئیدوارد تامسۆن هەروەها ژنێکی گوماناویی بەناوی دوریان مەککرەی ) هاتبوو بۆ پاریس. دواتر ( بروس لینگن ) لەکاتی گەیشتنی خومەینی بۆ پاریس هاتە ناو کۆبوونەوەکان.

لەسەرەتاکانی شۆڕش بروس بوو بە باڵوێزی ئەمریکا لە تەهران، لە دوای پەلاماردانی و گەمارۆدانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تەهران دەستبەسەرکران ، ئەڵبەتە لەو ڕۆژانە و لەو کۆبونەوانەدا من تەنها ئاشنای ناوی دکتۆر یەزدی بووم ناوی ئەوانی تر تەنانەت نەمدەتوانی بەباشی دەریانببڕم، چ بگات بەوەی ئاشنا بم پێیان دوای تێپەڕبوونی چەند ماوەیەك و دەرکەوتنی هەندێك لەوان لەسەر ئاستی جیهان ئەم ناوانەی ئەمڕۆ ئاماژەم پێکردن فێریان بووم.

بەهەرحاڵ، ئەو ڕۆژە ژوورێکی گەورە لە هۆتێل مریدین بۆ ئەوان دابین کرابوو. من و غضنفرپور وەك پاسەوان لە لەناوەوە و لە بەردەم دەرگای چوونە ژوورەوە وەستا بوین، ئەرکی پاراستنی کۆبونەوەکەمان پێسپێردرابوو ، جگە لەو کاتانەی دکتۆر یەزدی قسەی ئەمریکیەکانی بۆ ئەوانی تر وەردەگێڕا هیچی ترمان لە قسەکانی ئەوانی دەست نەکەوت.

ئەو کۆبوونەوانە دوو ڕۆژ لەسەریەك بەیانی و عەسرەکەی بەردەوام بوون. کاژێری ١٠ ی بەیانی هەموویان دەهاتن ، هەتا ٢ ی دوای نیوەڕۆ لە کۆبوونەوەدابوون. دواتر هەرلەوێ نانی ئێوارەیان دەخوارد. هەر دوو ڕۆژەکە لە هەمبەرگر و ساندویچ تێنەپەڕی، کاژێر ٤ دەستیان بە گفتوگۆکانیان دەکردەوە هەتا ٢ ی نیوە شەو بەردەوام دەبوون.

ئەوەی دەستم کەوت ، لە وەرگێرانەکانی ئیبراهیم یەزدی و قطب زادە، هەروەها قسەی ئێرانیەکانی تری شاندەکە، چ لەنێوان خۆیاندا ، چ ئەوکاتەی داوایان لە یەزدی دەکرد بۆ ئینگلیزەکانی وەرگێرێت ئەوە بوو، کە ئیتر کاری شا تەواوە، ئێران دووبارە ناوێتە دەبێت لەگەڵ ڕوداوەکانی ساڵی ١٩٦٥.

هەموو بەرنامەڕێژیەکان پەیوەندیداربوون بە مانگرتن و خۆپیشاندان. بوونی پەیوەندی تەلەفۆنی بەردەوام لەنێوان تەهران و شارە مەزهەبیەکان، هەروەها دامەزراندنی ئەنجوومەنی لێوەشاوەیی دواتر ناوەکەی گۆڕدرا ئەنجومەنی شورای شۆڕش. بەرنامەڕێژی چوونی خومەینی بۆ کوێت و دواتر بۆ فەرەنسا. هەروەها لێکۆڵینەوە لەو ڕاپۆرتە سەرەتایانەی سات بە سات لەلایەن ڕەضا قطبی ، مجید تەهرانیان و عدنان مزارعی و محمد درخشش ئامادە دەکران لە ڕێگای ئایەتوڵا بەهەشتی و فضل الله محلاتی بە دەستیان دەگەیشت. لەگەڵ بەرنامەی گوێزانەوەی ڕۆحانیە شۆڕش گێڕەکان بۆ دەرەوەی وڵات، یان پاراستنیان لە ناوەوەی وڵات لەو بابەتانەی ئەو دووڕۆژە بوون. هەردوو لایەنی ئێرانی و خۆرئاوایەکان بە ئامادەبوونی ئەو دوو ئافرەتە ئەمریکیە گفتوگۆیان لەسەر دەکرد. کۆڵۆنێل ئیدوارد تامسۆن هەردوو ڕۆژەکە بە جل و بەرگی سەربازیەوە ئامادەی کۆبوونەوەکان دەبوو. جانتایەکی سەوزی تۆخی پێبوو هێندەی جانتایەکی بچوکی جل و بەرگ دەبوو، ئامێری زۆر پێشکەوتووی هەوالگری لەناودا جێگیر کرابوو ، هەردوو ڕۆژەکە چەند جارێك بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەمریکاوە کرد ئەمە زۆر جیاواز بوو لە پەیوەندی تەلەفۆنی بەهۆی جۆرە سیمکارتێکی بچووك لەڕێگای باڵوێزخانەی ئەمریکا لە پاریس پەیوەندیەکە

وەردەگیرا. ئەم پەیوەندیانە کاتێك ئەنجامی دەدا کە گفتوگۆکان لەنێوان خۆیاندا نەدەگەیشتە ئەنجام .

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم قطب زادە و سودابە سدیقی هاوسەری غضنفرپور لە بەشداری پێکردنیان لە کۆبونەوەکان دورخرانەوە ، هەتا هاوڕێ لەگەڵ پائتریس و پاتریسیا لە هۆتێلەکانی پاریس و دەوروبەر بۆ هاوسەفەرەکانی خومەینی و ئەوکەسانەی بڕیارە لە ئێرانەوە بۆ پاریس بێن جێگایان بۆ دابین بکەن . سەلامەتیان و بنی صدریش ڕاسپێردران بۆ ئەوەی چەند ئەژمارێکی بانکی بکەنەوە

لە کاژێرەکانی کۆتایی کۆبونەوەکە، ڕەمزی کلارك بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ واشنگتن کرد.

دکتۆر ئیبراهیم یەزدی ڕاسپێردرا سبەی سەفەر بکات بۆ عێراق و خومەینی لەئاکامی کۆبوونەوەکان ئاگادار بکاتەوە . لە چرکەساتەکانی کۆتایدا لە باڵوێزخانەی کەنەداوە دوو پاسپۆرت بۆ کۆلۆنێل ئیدوارد تامسۆن و خاتوو دوریان مەککرەی نێردار و خۆم وەرمگرتن . دواتر بۆم ڕوونبویەوە ئەم دوو پاسپۆرتە بەمەبەستی چونیان بۆ عێراق دروستکراون، هەتا لەهەموو لایەکەوە بەد گومانیەکانی خومەینی بڕەوێنەوە. کاژێر بووبە ۳۰: ۰۳ خولەکی بەیانی ڕوشتم بۆ نویسنگەکەی قطب زادە هەواڵی پێدام سبەی دووسبەی سی کەس لەو پارتیزانانەی دیاریم کردبوون دەگەنە پاریس و دەبێ بەیارمەتی براکانی شاکری بچمە پێشوازیان و سەرۆکایەتیان بکەم.

قطب زاده دۆستایەتیەکی وەهای لەگەڵ شاکرییەکاندا نەبوو. لەسەر یەک ئامۆژگاری دەکردم نەبادا مۆڵەت بدەم کۆنترۆڵی پارتیزانەکان لە دەستم دەرچێت، ئەو تەنها یەک کەسی دیاری کرد هەتا بتوام فەرمانی لێوەربگرم ، ئەویش پیاوێکی پاکستانی بوو بەناوی( ئیقبال ئەحمەد ) بڕیاربوو لە لەندەنەوە بۆ پاسەوانیەتی خومەینی خۆی بگەیەنێتە پاریس. ئەمە باشترین هەواڵێك بوو لەماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا بیستم، گفتوگۆ سیاسیەکان و بەرنامەڕێژیەکان بۆمن وەرمزکەربوون من دونیای خۆمم دەویست کە دونیای کار و هێز و دەستەڵات بوو. بەهاتنی پارتیزانەکانم ئەو هەلومەرجەم بۆ فەراهەم دەبوو .

هەر بەو جۆرەی کە گووتم چونی خومەینی بۆ پاریس و مانەوەی لە نوفل لوشاتۆ هەرگیز بە ڕێکەوت نەبوو . بەلایەنی کەمەوە سێ ڕۆژ پێش هاتنی بۆ پاریس من و سی کەس لە پارتیزانەکانم پاسەوانی ئەو دوو خانووە بووین لە نوفل لوشاتۆ[^] بۆ خومەینی بەکرێ گیرابوو.

هەر لەو ماوەیەدا شانزە هێڵی تەلەفۆنی و هێڵی تری هەواڵگری لەو خانوەدا جێگیرکران. تەنانەت من و پارتیزانەکانم دەمانزانی خومەینی لەکاتی گەیشتنی، سێ ڕۆژ لەماڵی بنی صدر دەمێنێتەوە . ئەوەش بڵێم دروست ئەو

---

[^] ( Neauphle-le-chateau ) لادێیەکە دەکەوێتە ٣٥ کم باشوری خۆرئاوای پاریس بەهۆی مانەوەی خومەینی تێیدا لە ساڵی ١٩٧٨ ناوی دەرکرد ، بەپێ ی ئاماری ساڵی ٢٠٠٦ ژمارەی دانیشتوانەکەی ٢٠٠١ کەس بووە . وەرگێڕ.

ڕۆژانەی ئێمە ئەرکی پاراستنی ئاسایشی ڤێلاکەی نوفل لوشاتۆمان پێسپێردرابوو،

سەد و چل و سێ لە مەلا و روضە خوێنان کە دواتر لە کۆماری ئیسلامی بوون بە خاوەنی پلەو پایە و کاری دەوڵەتی لە ئێران و نەجەف هاتن بۆ پاریس و لە چاوەڕوانی گەیشتنی خومەینیدا بوون . تێبینی بکەن، ئەفسانەی سەفەری خومەینی بۆ پاریس بەڕێکەوت لە بنچ و بنەمادا درۆیە

تەنانەت ئەوەی کە دەڵێن ئەمریکیەکان لەنزیك ڤێلاکەی نوفل لوشاتۆ بینایەکیان گرتبوو، هەتا کارەکانی خومەینی بخەنە ژێر چاودێریەوە لەلایەکەوە ڕاستەوە لەلایەکەوە درۆیە.

ڕاستە ئەو بینایە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە بەکرێ گیرابوو یازدە کەسی سەربازی و مەدەنی بەتەواوی پێداویستیەکانی هەواڵگری لەوێ نیشتەجێ بوون .

درۆیە ئەگەر بگوترێت بۆ سیخوری کردن لەسەر کارەکانی خومەینی لەوێدا نیشتەجێ بوون . بە پیچەوانەوە ئامانجی ئەوان لەم بەرنامەیە پارێزگاری کردن لە خومەینی و ڕێنمای کردنی بوو، لە هەرجێگاو هەر ساتێکدا کێشەو گرفتێك هاتبایەتە پێش، دکتۆر ئیبراهیمی یەزدی ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو بینایە دەچوو، ماوەیەك لەوێ دەمایەوە و دواتر دەگەڕایەوە و چەند ساتێك دواتر خومەینی دەیدایە بەر توانج و پلار.

ئێمە کە لەوێ دەماینەوە ئاگامان لەهەموو بابەتەکان بوو. دەمانزانی دکتۆر یەزدی بە جۆرێك لەگەڵ ئەمریکی یەکان و بنی صدر لەگەڵ ئیسرائیلیەکان

، قطب زادە هاوکات لەگەڵ فەرەنسی و بریتانیەکان سات بە سات یان بەلایەنی کەمەوە ڕۆژانە لە پەیوەندیدان.

لەو ماوەیەی خومەینی لە پاریس دەمایەوە دووجار چەند کەسێك لەو بەرپرسە ئەمریکیانە لە درەنگانێکی نیوەشەودا لە ژێری بەرگی ڕۆژنامە نوس دەهاتن بۆ ماڵی خومەینی و سەردانیان دەکرد . یەکێك لەو دیدارانە ئەو کاتە بوو ئەندازیار مەهدی بازرگان[9] هات بۆ پاریس، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە، هات بۆ دیداری خومەینی یەزدی ئەمریکیەکانی بۆ دیداری نیوە شەو بانگێشت کرد .

سەرپەرشتاری تیمی ئەمریکیەکان هەمان کۆڵۆنێل ئیدوارد تامسۆن بوو.

بابەتێکی تر لەوانەیە ئێرە جێگایەکی باش بێت بۆ باسکردنی، بێ ئاگای و گوێ پێنەدانی خومەینی و ماڵباتەکەی بوو بە ئاداب و ئەرکە ئاینی و مەزهەبیەکان. خومەینی هەرگیز نوێژی نەدەکرد تەنها لەبەردەم کامێراکاندا نەبێت، گۆشتی ئاژەڵی بەستوی دەخوارد ئیتر بەلایەوە گرنگ نەبوو بەپێ ی شەریعەتی ئیسلامی سەربڕدراوە یان نا .

---

[9] لەدایك بووی ١ ی کانونی یەکەمی ساڵ ١٩٠٧ ی شاری تەهران ، سیاسەتمەدا و مامۆستای زانکۆ ، ئەندامی پارتی جەبهەی میللی و دامەزرێنەری پارتی نهضتی ئازادی ، حەفتاوپێنجەمین سەرۆك وەزیرانی ئێران و یەکەمین سەرۆك وەزیرانی حکومەتی کاتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ٤ ی شوبات ی ١٩٧٩ بۆ ٦ ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ . دواتر بەهۆی نەخۆشی بۆ وەرگرتنی چارەسەری ڕووی لە سویسرا کرد . سەرئەنجام لە ٢٠ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٥ لەشاری زوریخ لەتەمەنی ٨٧ ساڵی کۆچی دوایکرد و لەسەر وەسیەتی خۆی لە بەرامبەر حوسەینیەی ئیرشادی لە قوم بەخاکسپێردرا . وەرگێڕ

خاڵێکی تر دەبێت ئاماژەی پێبکەم ئەمەیە، کە خومەینی دژە گوللەی لەبەردەکرد ئەگەر سەرتان نەسورِمێ تەنانەت مێزەرەکەی سەریشی دژە گولله بوو ئەمریکەیەکان دابویان بە ئەڵمانیەکان هەتا بۆی دروستبکەن.

له دوای گواستنەوەی خومەینی لە ماڵی بنی صدر بۆ نوفل لوشاتۆ ئەو دژە گوللانەی پۆشی ، ئەگەر بەوردی سەرنجی وێنەکانی نوفل لوشاتۆ بدەیت دەبینیت مێزەرەکەی گەورەترە لەو کاتانەی لە ماڵی بنی صدر یان لەئێران دەمایەوە. مێزەرەکە لەلایەن دەستەی پاسەوانە تایبەتیەکانەوە گرنگی پێنەدەدرا ، بەڵام دواتر بەفەرمانی ئیقباڵ ئەحمەد لە ژێر چاودێری یەزدی و قطب زادە و سەید ئەحمەد ، ڕۆژێك دوای نیوەڕۆ لە دارستانێکی نزیك شاری ڤێرسای دژە گوللەکانمان کردە بەری جەمشید نعمانی، دکتۆر یەزدی بە تفەنگێکی ئەمریکی نیشانەی لێگرتوو گوللەیەکی تەقاند هەتا دڵنیابێت گیانی ئیمامی ئایندە سەلامەت دەبێت ، لەکاتی ئەم تاقی کاریەدا بە یەزدی مگووت ئاگاداربە تفەنگەکە لە دەستت نەترازێت ، گوتی : دەورەی پارتیزانیم لەگەڵ قطب زادە و چەمران لە مصر گوزەراندوە .

بەهەرحاڵ ڕووداوەکانی مانەوەی خومەینی لە نوفل لوشاتۆ هەمووان بیریانە، من هەوڵ دەدەم ئەوانەی لەچاوی کامێراکان شاراوە بوون و ڕاستی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانە پێکدەهێنن بهێنمەوە یاد و باسیان بکەم . من تەنها پاسدارێکی سادەبووم، بەشێوەیەکی گشتی لەزۆربەی شتەکان تێنەدەگەیشتم زۆر کەسیشم نەدەناسی ، چونکە نە گۆێم پێ دەدا نە زۆریش بۆم گرنگ بوو ، بەڵام کەسانێك هەن زانیاریەکانیان لەچاو ئەمانەی مندا زۆرە ، ئەگەر ئەمەی من یەك لە سەد بێت ئەوا هی ئەوان هەزارە.

دڵنیام ڕۆژێك بۆ سەلماندنی بێ تاوانی خۆشیان بێت دەمیان دەکەنەوە و هەموو ڕاستیەکان دەدرکێنن. مەگەر وەك قطب زادە بۆ هەمیشە دەمیان پێ دابخرێت.

لەبەرئەوەی ناچارم بۆ پاراستنی کات و درێژەدان بە گێڕانەوە بەدوای ڕێڕەوەی یادەوەریەکانم لە بابەتی سیاسی لە نوفل لوشاتۆ هەتا تەهران و جمکران و قم دا بچم ، لەوانەیە گونجاوێت لێرەدا ئاماژە بەچەند یادگاریەکی گرنگ بکەم، ئەو ڕوداوانەی ئەو ڕۆژانە لە نوفل لۆشاتۆی پاریس ڕویاندا پێش ئەوەی پاشخانێکی سیاسیان هەبێت پاشخانێکی کەسیی و تایبەتیان هەبوو .

بۆئەوەی زیاتر ئاشنابن بە زۆرێك لە کەسایەتیە دەست ڕۆشتوەکانی شۆڕش، خراپ نییە بگوترێت زۆرێك لەو دووبەرەکیانەی لەم دوایانەدا لە تەهران ڕویاندا ڕەگەکەی لە نوفل لوشاتۆوە داکوترابوو. بۆ نمونە؛ دوبەرەکیەکەی شێخ مەلا شهاب ئیشراقی و حەسەن نزیە یەکێك بوو لەوانە.

شێخ مەلا شەهاب لە نوفل لوشاتۆ خەونی بوون بە بەڕێوبەری گشتی کۆمپانیای نەوتەوە دەدیت و بەریتانیەکانیش حەسەن نزیەیان بۆ ئەو پۆستە کاندید کردبوو هۆکارەی کاندیدکرنەکەی لەسەر ئەو هەل و مەرجێك بوو کە قطب زادە بۆی باسکردم ئەویش ئەمانەبوون:-

یەکەم : حەسەن نزیە جێگای متمانەی بەریتانیەکان بوو.

دووەم : نزیە یاساناس بوو هاوکات سەرۆکی سەندیکای یاساناسانی تەهران بوو . هەوڵیان دەدا ڕێگای ئەوەوە گرێبەستە نەوتیەکانی نێوان ئێرانی

سەردەمی خومەینی و گروپی ئابوری(کنسرسیۆم) ببەسترێت و نۆێ بکرێتەوە و لایەنێکی یاسایش بەکارەکە بدەن . هەتا ئەو جێگایەی قطب زادە بۆی باسکردم بەریتانیەکان لە ڕێگەی ترساندن و دۆسیە دروستکردن کە پەیوەندی بە خۆکوشتنی ژن براکەی نزیە بەناوی نصرت الله نەزیە هەبوو هەروەها دەست درێژی سێکسی لە سەردەمی خوێندنی زانکۆ نزییان خستبووە چنگی خۆیانەوە. کاری ئەم دووبەرەکیە هێندە گەورە بوو تەنانەت بەریتانیەکان پێشنیاریان کرد شێخ مەلا ئیشراقی بکرێت بە وەزیری نەوت و حەسەن نزیە بکرێت بە بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای نەوتی ئێران. ئەڵبەتە ئەم پێشنیارە هەر زوو ڕەتکرایەوە ، بەڵام هەرچۆنێك بێت خومەینی وەزارەتی نەوتی دامەزراند.

نمونەیەکی تر دزیکردن و دەستگیری سەید مەحمودی دوعایی لە فرۆشگایەکی بەناوبانگی پاریس بەناوی گەلەری لافایت ، پێمگوتبوون پێش هاتنی خومەینی هەروەها لەکاتی گەیشتنی و هەتا ئەو کاتەی لە پاریس بوو، هەموو ڕۆژێك مەلایەکی مێزەر بەسەر لەم شارەدا زیادی دەکرد .

مەلا ئەوروپا نەدیوەکان بەو پارەیەی بەفەرمانی خومەینی لەلایەن ئەحمەد سەلامەتیان پیان دەدرا، کەوتبوونە گیانی فرۆشگاکانی پاریس جارجاریش شتێکی سادە و هەرزان دەنوسا بەدەستیانەوە و لەگەڵ خۆیان دەیان هێنایەوە. عەبا و دژە باران ( مطری ) شتێکی باش بوو بۆ ئەم جۆرە دزیانە، هەم کەمتر دەکەوتە بەرچاو. هەم هەتا ئەوجێگایەی کرابا گوڵدانێکی گەورەی کریستاڵی لەناو گیرفانەکانیدا جێ ی دەبوویەوە. هەرجۆرێکیش بێت فەرەنسیەکان ئەوانیان وەك پیاوانی خودا تەماشادەکرد.

حجت السلام و المسلمين مەحمود دوعایی نزیکەی دە ڕۆژ پێش هاتنی خومەینی خۆی گەیاندبووە پاریس، بە نووری چاوەکانی خومەینی ئەژمار دەکرا. سەرئەنجام لەکاتی ئەنجامدانی دزیدا دەستگیرکرا، زۆری نەما بوو هەواڵی دزیە ئابڕووبەرەکەی لە ڕۆژنامەکانی پاریسدا بلاّو ببێتەوە. بەفەرمانی خومەینی بەپێدانی بڕە پارەیەك وەك بارمتە توانیمان لەزیندان ئازادی بکەیت ، پێشتر گووتم مەحمود دوعایی نووری چاوەکانی خومەینی بوو ، بۆچی ؟ چونکە لەگەڵ ئەوەی خومەینی بۆماوەیی چواردەساڵ لە عێراق ژیابوو ، بەلاّم ئێستاش و ئەوساش نەی دەتوانی بەعەرەبی قسەبکات ئەو وەك زۆرێك لە مەلاکان تەنها دەیزانی قورئان بخوێنێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو لەو ماوەی مانەوەی خومەینی لە عێراق سەید مەحمودی دوعایی وەك وەرگێڕ لەلای دەمایەوە. تەنانەت لەکاتی هاوکاری خومەینی لەگەڵ دەوڵەتی عێراق دژی حکومەتی شا، بە ڕاسپاردەی ژەنراڵ تەیموری بەختیار چەند ئامێرێکی ڕادیۆ خرایە خزمەتی خومەینی و دوعایی بەڕێوبەر و بێژەری ئەو ڕادیۆیە بوو. بەزمانی فارسی بەرنامەکانی پەخش دەکرد .

شێخ مەهدی کەڕوبی بۆی باسکردم، جارێك لەکاتی گفتوگۆی یەكێك لە پلە بالاّکانی ئاسایشی نشتیمانی عێراق لەگەڵ خومەینی، پلە بالاّکەی عێراق بەباشی شارەزای زمانی فارسی بووە . ئاگاداری ئەوە دەبێت کە سەید مەحمودی دوعایی لەکاتی وەرگێڕاندا هەرشتێك خۆی بیەوێت بەزیادەوە بۆ خومەینی وەردەگێڕێت .

کەروبی گوتی : لەکاتی بینینی ئەم ئەگریسەیەی دوعایی پلە بالاّکەی عێراق بەزمانی فارسی قسەدەکات و خومەینی لە وەرگێڕانە

چەواشەکاریەکانی دوعایی ئاگادار دەکاتەوە . بەهەرحاڵ ئەم سەید مەحمود دوعاییە، لەدوای هاتنی بۆ پاریس هەموو ڕۆژێك دەچوو بۆ گەلەری لافایت هەموو جارێك شتێکی سادە و هەرزانی دەدزی و لەگەڵ خۆیدا دەیهێنایەوە . لەناکامدا ڕۆژێك شتێکی بەنرخ هەڵدەگرێت و کارمەندانی بەشی ئاسایشی فرۆشگاکە چاودێری دەکەن و لەکاتی چونەدەرەوەدا دەستگیری دەکەن و ڕادەستی بنکەی پۆلیسی ناوچەکەی دەکەن. دوعایی لە بنکەی پۆلیسەوە تەلەفۆنێك دەکات و بەگریانەوە قسە لەگەڵ بنی صدر دەکات . دەڵێت فریام کەون ئەگەرنا دەمبەن بۆ زیندان.

بنی صدر خومەینی لە ڕووداوەکە ئاگادار دەکاتەوە، خومەینیش فەرمان بە شێخ مەلا شهاب ئیشراقی دەکات هەرچۆنێك بووە بەهانایەوە بچن. سەلامەتیان و حەبیبی و غضنفرپور بەرەو پاریس بەڕێدەکەون نزیکەی چل هەزار فرەنك وەك بارمتە دادەنێن و دوعایی ئازاد دەکەن. لەوکاتە بەدواوە ناوی سەید مەحمود دوعای گوڕدرا بە ( دوعایی لافایت ) ئەو ناوەی ئێستاشی لەگەڵ بێت لێی نەبوومتەوە. من خۆم چەندین جار لە ئێران گوێم لێ بووە هاشمی ڕەفسەنجانی و شەبەستری و خامنەیی ئەویان بە دوعای لافایت بانگ دەکرد.

زۆر بەئاسانی دەتوانن وێنای بکەن، کە ئەم بونەوەرانە کاتێك دەگەنە دەستەڵات دەبێت چ کارێك هەبێت نەتوان بیکەن. من خۆم لەو کەسانەبووم کە ئێستا باش دەزانن لەکوێ وە بەکوێ گەیشتووم هەموو شتێکم لە پارە و دەستەڵاتدا کورتدەکردەوە ، بەڵام لەبیرتان نەچێت من کوڕە قصابێکی کەم خوێندەوارم، زۆر جیاوازم لەگەڵ ئەمانەدا، هەریەکیان مەلا و مێزەر بەسەر بوون هەرکە دەمیان دەکردەوە باسی بەهەشت و جەهەنەمیان دەکرد.

دوو هەفتە بەسەر هاتنی خومەینی بۆ پاریس تێپەڕی بوو، شەوێك ئیقباڵ ئەحمەد بانگی کردم و گووتی خۆم بۆ ئەنجامدانی چالاکیەکی شەوانە ئامادەبکەم، دەبێت بچمە دەرەوەی نوفل لوشاتۆ، دواتر ئامۆژگاری کردم کە چەکداربم. بەهەر نرخێك بێت پارێزگاری لەو کەسانەبکەم لەگەڵمدان، دەمانچەیەکی کۆڵتی پێدام، نیشانەی دەوڵەتی سوریای لەسەربوو، پرسیم مۆڵەتی تەقەکردنم هەیە ؟

ئیقباڵ ئەحمەد گوتی ، ئەڵبەت کە نا ! مەگەر ئەوکاتەی کە بەڕاستی گیانی ئایەتولا زادەکان لەمەترسیدابێت ! بەم جۆرە بۆم ڕوون بویەوە، کەسایەتی گرنگی ئەم چالاکیە سەید ئەحمەدی خومەینی یە . ئەو شەوە یەکێك بوو لە شەوە ڤەرمبالغەکانی نوفل لوشاتۆ، مانگرتنی کرێکارانی نەوت تازە دەستی پێکردبوو.

چەندین نوێنەر بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی خومەینی هاتبوونە نوفل لوشاتۆ، هەتا ئەم پیرە پیاوە ڕازی بکەن بەیاننامەیەك دەربکات و داوا لە خەڵکی بکات مانگرتن بشکێنن . تەلەفزیۆنەکان و ڕاپۆرتە هەواڵیەکان خەڵکی ئێرانیان نیشاندەدا کە لەسەرەی نەوتدا لەبەردەم دوکانی نەوت فرۆشەکان بەڕیز وەستاون، هەوڵەکانی ئەوان بێ ئاکام بوو ، چونکە کەسانێك لە نوفل لوشاتۆ دانیشت بوو، لەوە خۆش خەیاڵتر بوون بەتەنگ سەرمای تەهران لایەنگرانی شۆڕشەوە بێن، یەکێك لەو کەسانە ئەم ئایەتولا زادە سەید ئەحمەدی خومەینی یە بوو .

کاتێك کاژێر ١٠ ی شەو شاندێکی تر تازە لە تەهرانەوە گەیشتبوون. چونە دیداری خومەینی، لەوکاتەدا ئیقباڵ ئەحمەد ئاگاداری کردمەوە، هاوڕێ

لەگەڵ قطب زادە بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکەم بە ڕێکەوم . ئەمە یەکەمین یان دووەمین جار بوو، لەدوای هاتنی خومەینی بۆ پاریس لەگەڵ قطب زادە بەتەنها بمێنمەوە. لەو ڕۆژەوەی خومەینی هاتبووە فەرەنسا پێشبڕکێیەکی توند لەنێوان قطب زادە و دکتۆر یەزدی و بنی صدر دەستی پێکردبوو، هەریەکەیان دەی ویست بەجۆرێك سۆزی خومەینی بۆ خۆی ڕابکێشێت، هیچ یەکێکیان ئامادە نەبوو تەنها بۆ چرکەیەك لای خومەینی، ئەو ئیمامەی خۆیان دروستیانکردبوو چۆڵ بکەن .

دواتر قطب زادە لە پشت سوکانەوە دانیشت و گوتی ؛ جەعفەر دەبێت زۆر وریا بین، ئەم پیرە پیاوە ڕاستی ڕاستی باوەڕی کردووە بووە بە ئیمام، شانزە ملیۆن دۆلار پارەی بەستەزمانم لە سەرۆکە پێشوەکەت قەزافی وەرگرتووە. ئێستا بنی صدر و یەزدی خۆیان بردۆتە پێشەوە ، وادەزانن ئەو تۆزە پارەیەی لەتەهرانەوە دێت، بەسە بۆ ئەنجامدانی کارەکان ، سەلامەتیان و بنی صدر ئەژمارێکی بانکیان بەناوی خۆیانەوە کردۆتەوە، هەر پارەیەك لە تەهرانەوە دێت یان دەچێتە ژێر دۆشەکەکەی ئیمام یان ڕاستەوخۆ دەچێتە سەر ئەژمارە بانکیەکەی ئەوان.

تازە لەم نێوەندەشدا بڕی پێنج ملیۆن تومان دیارنیە ، بەهەرحاڵ تۆ دەبێت ئاگات لەخۆت بێت. هێشتا منیان نەناسیوە، ئەمشەو هۆشت بکەرەوە و باش ئاگادار بە، دەمانەوێت سەید ئەحمەد ببەین بۆ فسق و فجور و بەدڕەوشتی، خۆی وای ویستووە و منیش بۆم ڕێك خستووە . ئەگەر لەناکاو کەسێکت دی سەرگەرمی وێنەگرتن بوو هەڵەشەیی نەکەیت و پارتیزان بازی نەنوێنیت. خۆت بدە لەگێلی و وابزانە هیچت نەدیووە، کەرێتی

نەکەیت و یەخەی وێنەگری بێچارە بگریت، بەم جۆرە ئاشکرامان بکەیت ، زۆر پێویستم بەم وێنانە دەبێت .

کاژێرێك دواتر، لە پاریس سێ میوانی ئەزیزمان بۆ زیاد بوو ( سەید ئەحمەد خومەینی ، شێخ محمد منتظری ، بئاتریس، خوشەویست و سکرتێرەی قطب زادە ) باوەڕبکەن ئەو بەڕێزانە واتە سەید ئەحمەد خومەینی و شێخ محمد منتظری، وەها خۆیان گۆڕی بوو ئەسڵەن نەدەناسرانەوە. سەید ئەحمەد چاکەت و پانتۆڵێکی سورمەیی ئاوریشمی لەبەرکرد بوو، هەروەها دەسرۆکەیەکیشی لەمل دابوو ، منتظری بەو بەژن و بالاّ باریك وردیلانەیەوە چاکەت و پانتۆڵێکی ڕەشی لەبەرکردبوو، قژی بیدادی بوو لە بۆنی عەتر .

من و قطب زادە لەپێشەوە دانیشتین ، بئاتریس لە دواوەوە لەنێوان سەید ئەحمەد و شێخ محمد دانیشتبوو. بە ئۆتۆمبێلێکی مۆدیل بەرزی مارسیدرس بینز ٤٥٠ لە جادەی کەمەرمیی شەقامی بەناوبانگی فوش، بەرەو کلیشی و نوسینگەکەی قطب زادە بەرێکەوتین و چالاکی شەوانە دەستی پێکر.

لە نوسینگەکەی قطب زادە، پاتریسیا چاوەڕێی دەکردین. تریاك و مەقەڵی پێشتر ئامادەکرابوو، هەتا کاژێر ١١ ی شەو ئەو بەڕێزانە لەوێ سەرگەرمی تریاك کێشان بوون. دواتر هەمووومان بەرەو یانەیەکی شەوانە، بەناوی (ڕاسپۆتن) لە کۆلانێکی پێچ، لە شەقامی شانزە لیزێ بەرێکەوتین . قطب زادە زۆر جار سەردانی ئەم ئایت کلاّبە ناودارەی دەکرد. لەوێدا ژنانی

نیوەڕوت بەسنگی ڕووتەوە وەك خزمەتکار پێشوازیان لەمیوانە تازە هاتووەکان دەکرد.

هەر لە سی خولەکی سەرەتا قطب زادە لەگەڵ دوو کچی شۆخ و شەنگ، کە چاوەڕوانی ئێمە بوون، سەری قسەی دامەزراند و ئەوانی لەنیوان سەید ئەحمەد و شێخ محەمەد دانیشاند.  کاژێرێك دواتر سەید ئەحمەد و شێخ محەمەد و قطب زادە هێندە مەست بوون، تەنانەت ئاگاداری هاتنی خانم دوریان مەککرەی نەبوون ، بەلاّم من خێرا ئەوم ناسیەوە، بە جلێکی جوانی شەوانەوە لە سوچێکدا دانیشتبوو. لەگەڵ دووکەسی ئەمریکی قسەی دەکرد. هەر لەگەڵ ئەوەی ئاگاداری هاتنی ئەو خانمە بووم بۆ یانەی ڕاسپۆتین، زۆر چاوم بۆ ڕوخسارە ئاشناکانی تر گێڕا ، بەلاّم وادیاربوو جگە لەو ئافرەتە ئالۆزە ئەمریکیە کەسی تری لێنەبوو هەتا ئێمە بناسێتەوە .

چەند خولەکێك دواتر، خانم دوریان مەککرەی لەجێگای خۆی هەستا و بەرەو تەوالێتەکان ڕۆشت. منیش بەهێشتنەوە کەمیك مەودا دوای کەوتم، پاتریسیام جێهێشت و دوریان لەگەڵ دەرگاوانی یانەکە قسەی کرد . دواتر لەدەرگایەکی تەنیشت تەوالێتی ئافرەتان، کە نیشانەی قەدەغەی لەسەر بوو چووە ناوچەیەکی نەناسراو، ساتێك بیرم کردەوە و دواتر بڕیارمدا چاودێری بکەم. هەر لەگەڵ ئەوەی دەستم بۆ دەرگاکە برد بیکەمەوە، لەناکاو دەستێك دای بەسەر شانمدا، بە پەشۆکاویەوە لام کردەوە بۆ دواوەوە، بە دیتنی قطب زادە زۆر سەرم سوڕما گوتی ؛ هێ ی مەگەر بڕیار نەبوو بهێڵی مەردوم کاری خۆیان بکەن !.

گوتم ؛ ئەمە هەمان ئەو خاتوونە ئەمریکیە نییە !.

گووتی : دەزانم لەخۆمانە

شتێکی تر سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو، کە قطب زادە بەهیچ شێوەیەك مەست نەبوو. تەنها وەك مەستەکان خۆی دەنواند ، ساتێك دواتر گەڕاینەوە، دوبارە قطب زادە چووەوە بەرگی مەستی . کازێر ٤ ی بەیانی هەموویان جگەلەمن مەستی مەست بوون، بە ئۆتۆمبێلەکەی قطب زادە کە بەڕاستی جێگای هەناسەدانیشی تێدا نەدەبوویەوە و کچانی تازە ئاشنا بە بیانوی نەبوونی جێگا لە باوەشی سەید ئەحمەد و شێخ محەمەد دانیشتبوون، بەرەو جێگایەکی نەناسراو کەوتینەڕێ.

لەوانەیە ئێستا ئەم یادەوەریانە دەگێڕمەوە باوەڕنەکەن ، بەڵام کاتێك لەشەقامی فوشی بەناوبانگ وەستاین هەتا بچینە ناو بینایەکی چەند نهۆمی، دوو کچەکەی ڕاسپۆتین هەر نیوە ڕووت بوون. بئاتریسیش لەمەستیدا هاوتای ئەوان بوو ئاگاداری کردینەوە زۆر دەنگە دەنگ نەکەین. قطب زادە هێشتا خۆی وەك مەستێك نیشاندەدا، چاوێکی لێداگرتم منیش بەخێرایی هەمویانم بردە ناو ئاسانسۆرەکەوە بۆ نهۆمی شەشەم، بەڕاستی بینایەکی ڕازاوە و بەشکۆ بوو. پاتریسیا دەرگای کردەوە و هەرکە چووینە ژوورەوە، کەشی ژوورەکە پڕبوو لە قاقای پێکەنین.

دوای پارك کردنی ئۆتۆمبێلەکە بە چەند خولەکێك قطب زادە هاتە ژوورەوە، هیچ هەواڵێك لەمەست بوونی نەبوو . گووتی : ئەو گێژە ئافرەت نەدیوانە لەکوێن ؟ بئاتریس ئاماژەی بۆ ژووری نوستنەکە کرد ، لەو کاتەدا قطب زادە بە فەرەنسی چەند قسەیەکی بۆ بئاتریس کرد و بەمنی گووت: وەرە بەدوامدا پاڵەوان .

من و قطب زاده چوینه ژورێکی تر خانم دوریان مەگگرەی و پیاوێکی گەنجیش لەوێ بوون.

دوریان قطب زادەی ماچ کردوو دواتر بەفارسیەکی ڕەوان پرسیاری لێکردم، بۆچی لە یانەکە چاودێریم دەکرد !.

دوای چەند خولەکێك پاتریسیا قاوەی بۆ هێناین، ئەو شتەی هەموومان پێویستمان پێ ی بوو . دواتر هەموومان هەر لەو ژوورەدا لەسەر قەنەفەیەکی نەرم و نۆڵ دانیشتین، قطب زادە گووتەنی هەتا سەیری بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی بکەین. منیش بەسەر سوڕمانیەوە گووتم ئێستا هیچ کەناڵێك بەرنامەی نییە .

دوریان گووتی : بۆچی نا ! کەناڵەکەی قطب زادە هەمیشە بەرنامەی هەیە !. پیاوە گەنجەکە واتە دۆمەنیك کاسێتێکی خستەناو ڤیدیۆکەوە، ساتێك دواتر گرتەی سەید ئەحمەد و شێخ محەمەدی نیشاندا ، خەریکی داکەندنی جل و بەرگی مەلایەتی بوون و جلی نوێیان لەبەر دەکرد . بە پوختی پێش چوونەژوورەوەی من و قطب زادە لە فیلمەکەدا سەرەتا ڕەفتار و ئاکاری مەلازادەکان تۆمارکرا بوو.

دواتر گرتەی تریاك کێشانەکەیان لە نوسینگەکەی قطب زادە نمایش کرا. دواتریش ڕابواردنەکانی یانەی ڕاسپۆتین، تەنها شتێك زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو فیلمەکە بە جۆرێك تۆمار کرابوو لەهیچ یەکێك لە گرتەکاندا من و قطب زادە و بئاتریس و پاتریسیا دەرنەدەکەوتین.

قطب زاده و دوریان هەردوکیان دەستخۆشیان لە دۆمەنیک کرد ، من پرسیم ئایا لەم ساتەدا و لە ژووری نوستەنەکەدا فیلمیان لێ تۆمار دەکرێت ؟ دوریان پێکەنی ، قطب زادە گووتی ؛ هەموو کارەکان ناتوانرێت لەیەك شەودا ئەنجام بدرێت پاڵەوان .

دواتر هەموویان پێکەنین ، پێش ئەوەی لەسەر یادەوەریکانم بەردەوام بم، دەبێت لێرەدا ئەمەش بڵێم، قطب زادە بەهۆی ئەم فیلمەوە لە تەهران سەید ئەحمەدی خستبووە ژێر فشارێکی زۆرەوە، هەتا باوکی ڕازی بکات قطب زادە ببێت بەزاوای بنەماڵەی خومەینی، ئەمە بەناو هەمووواندا بلاّوبووبوەوە کە قطب زادە دەیەوێت ببێت بە هاوسەری یەکێك لەنەوەکانی خومەینی. هەر ئەم فیلمە بووە هۆکاری کوژرانی قطب زادە لەکاتی خۆیدا بۆتان باسدەکەم.

کاژێر ١٠ ی بەیانی دەگەڕاینەوە بۆ نوفل لوشاتۆ، ئایەتولاّزادەکان دووبارە جبە و عەباکانیان لەبەرکرد و مێزەرەکانیان لەسەر ناو وەها پێیان دەکەوت دەتگوت زۆر دەمێکە نوێژی بەیانیان خوێندووە .

کاتێك گەیشتینە نوفل لوشاتۆ، قطب زادە چرپاندی بە گوێمدا و گووتی ؛ ئەمشەو تا سبەی شەو ئامادەبە، نوێژی جەماعەت لەگەڵ ئەم بەرێزانە چێژی خۆی دەبێت .

گەیشتنی ئێمە بە نوفل لوشاتۆ هاوکات بوو لەگەڵ ئەوساتەی خومەینی دەیویست لەو ماڵەی خۆی و بنەماڵەکەی تێدا دەژیا بچێتە دەرەوە، بۆ ناو باغە سێوی دامێنی کۆلانەکە. لەناو ئەوکەسانەی هاوڕێیەتی خومەینیان

دەکرد لەیەکەم ڕوانیندا دیسان چاوم بە خانم دوریان مکگرەی کەوت، عەبای بەسەردا دابوو هاوەڵی ئیمامی دەکرد.

لەدوای ئەو شەوە پڕ ڕووداوە، هەر دوو یا سێ شەو جارێك بەرنامەی فسق و فجور و بەدڕەوشتیەکانی سەید ئەحمەد خومەینی و شێخ محەمەد منتظری بەهاوڕێیەتی قطب زادە و بئاتریس و پاتریسیا، ئەڵبەتە لە ژێر چاودێری دوریان مکگرەی بە فیلم تۆمارکردنەکانی دۆمەنیك و هاوکارەکانی بەردەوام دەبوو . ئایەتۆڵا زادەکان هێندە خولیاو هۆگری ئەم کارە بوو بوون، گوێیان بە دەوروبەر نەدەدا . بوو بوونە جێگای سەرنج و تێڕامان، ئەویش لە پاریس و دەوروبەری کە ئەم کارانە تێیدا ئاسایی بوو. ئەم بەدڕەوشتی و ڕابواردنانە بەڕوداوێکی ڕسوابوون و ئابڕووبەر پێش یەك هەفتە لە جێهێشتنی پاریس بەرەو تەهران بەکۆتا هات . هێشتا بەباشی نازانم ئەوەی ڕوویدا یەکێك بوو لە پلانەکانی قطب زادە لەهەمبەر ئایەتولاً زادەکان یا نا ...!.

هەرچۆنێك بێت، لەو چەند شەوەی کۆتایدا، بەرنامەی ڕابواردن و بەدڕەوشتی ئایەتولاً زادەکان بەمجۆرەبوو، ڕۆشتنی هەمووان بۆ یەکێك لە هۆتێلە نمرە یەکەکانی پاریس، لە شەقامی فرانسوا کە ناوەندی کۆبوونەوەی زۆرێك لە سۆزانیە نرخ گرانەکان بوو.

ئایەتولاً زادەکان بەناوی شازادە عەرەبەکان دەچوون بۆ ڕاوی سۆزانیەکان ، دواتر ئەوانم سواری ئۆتۆمبێل دەکرد و دەمانهێنان بۆ شوقەکەی شەقامی فوش .

هەڵڕشتنی پارەیەکی زۆر و زەبەند، لەلایەن ئایەتوڵا زادەکانەوە سۆزانیەکانی خستبووە پێشبڕکێوە بۆ شەوە ڕابواردنێك و دزینی دڵی ئەوان ، ئەو پارە بێ ڕەنجەی کاسبکارانی تەهران دەیانناردن، تەنها بۆ خۆش گوزەرانی و شمەك کڕینی ئەم مێزەر بەسەرانە خەرج دەکران. تەواوی خەرجیەکانی تر وەك مانەوەی خومەینی و دەست و پێوەندەکانی، لەو شانزە ملیۆن دۆلارەی قطب زادە لە قەزافی وەرگرتبوو دابیندەکرا. بۆیە ئەمانە دەڵێم هەتا کاسبکاران و پیشەوەران و بازرگانانی تەهران کە ئێستا جێگای گومانی خراپی خومەینین، بزانن ئەو پارەو دیاریانەی دەیاننارد بەکەڵکی شۆڕش نەدەهات. تەنها بەکەڵکی سەید ئەحمەدی خومەینی دەهات هەتا دیاری و ئاڵتونی گرانبەهای سەد هەزار فرەنکی پێبکڕێت بۆ سۆزانیەکان. ئەوانەی وەك دیاری دەیبەخشین کەمترینیان بەلایەنی کەمەوە نرخەکەی هەزار فرەنك دەبوو .

ئەو شەوە، واتە کۆتا شەوی ڕابواردنەکانیان ، سەید ئەحمەد خومەینی و شێخ محەمەد منتظری، لەگەڵ دوو سۆزانی گرانبەهای پاریس بەهۆی ئێرانیەکی دەسڕۆکە لەمل بە ناوی کامران ناوی بنەماڵەکەیم لەیاد نەماوە ئاشنا بوون. ناوی یەکێکیان (کارمن) ئەویتریان (سەروین) بوو . ئاوێتەی یەك دەبن و دوای خواردنەوەی مەشروب، هەمووماڼ بەرەو بیناکەی شەقامی فوش بەڕێکەوتین کارمن و سەروین بەڵێنیان دابوو هەتا کاژێر ٢ ی شەو لەخزمەت ئایەتوڵا زادەکاندا دەبن، دواتر دەچنەوە بۆ ماڵەکانیان. هەروەها لەسەر دە هەزار فرەنك ڕێکەوتبوون ، ژمارەیەك نە بۆ من ، نە بۆ قطب زادە جێگای باوەڕنەبوو.

هەموو شتێك خۆش و باش بوو وەك چیرۆكی شەوەكانی تر لەڕاستیدا هەرواش بوو .

بەڕاستی كارمن و سەروینی لە دزینی دڵی پیاوان و خرۆشاندن و ئاگرتێبەردانیان لێزان و كارامەبوون.

بۆ یەكەمین جار، كاری تریاك كێشان لە نوسینگەكەی قطب زادەوە گوازرایەوە بۆ شۆقەكەی شەقامی فوش، شەوی شادی و پێكەنین و سەما دەستی پێكرد ، لە كاژێر ١ ی نیوەشەو ئاهەنگەكەمان بە ئاراستەیەكی پێچەوانە و نەخوازراو ملی نا. بڕیار وابوو كارمن و سەروین دەهەزار فرەنك وەربگرن، لەناكاو نرخەكەیان بەرزكردەوە و داوی بیست هەزار فرەنكیان كرد.

لەسەرەتادا بابەتەكە بەگاڵتە وەرگیرا ، بەڵام ئاكار و ڕەفتارەكانی دواتر بابەتەكەی كرد بەڕاستی ، كارمن لەنیوان یەك دونیا ترساندن و هەڕەشەكردن دڵبەری كە هەندێجار سودی لێوەردەگرت، لەكۆتایدا هەمووومانی گیرۆدەكرد و گوتی ؛ ئێمە هێندە ساویلكە و نەزانن نین، باش دەزانین ئێوە كێن، بۆ پاراستنی ئابڕوی خۆشتان بێت، بڕواناكەم بیست هەزار فرەنك پارەیەكی زۆر بێت .

ئەم چەلەحانێیە هەتا كاژێر ٢ ی نیوەشەوی خایاند. سەید ئەحمەد خومەینی و شێخ محەمەد منتظری و صادق قطب زادە نەدەچوونە ژێربار، سۆزانیەكانیان بەوەدەترساند پەیوەندی بە پۆلیسەوە دەكەن، لەولاشەوە سۆزانیەكان بەدەنگی بەرز پێدەكەنین و تكایان دەكرد هەرچی زوترە پەیوەندی بكەن .

لەنێوان قاقای پێکەنینەکانی کارمن و سەروین و هەڵیت و پەڵیتەکانی سەید ئەحمەدی خومەینی، بەزمانی فارسی کە دەیگووت ئێمە شازادەی عەرەبین و خاوەن پێگەی سیاسین لەناکاو زەنگی دەرگا لێدرا ، بئاتریس بەخێرایی دەرگاکەی کردەوە، لەپڕ چوار پیاوی بەهێزی زل و چەکدار بە خێرایەکی چاوەڕواننەکراو خۆیانکرد بە ژووردا، بەبیانوی ئەوەی کارمن و سەروین خوشك و هاوسەری ئەوانن. ترس و دڵەڕاوکێ و جنێودان جێگای پێکەنین و ڕابواردنی پێشوو گرتەوە ، بەهیچ شێوەیەك نەمتوانی ڕووبەڕووی هێرشبەرەکان ببمەوە، خێرایی دەستبەکاربوونی ئەوان لەو گرتە فیلمانە دەچوو کە لە ڕابردوودا چەندینجار لە سینەماکانی ئەصفەهان دیبووم، ئەم ڕووداوە وەها هەموومانی حەپەساندبوو بەڕاستی هیچ کارێکمان لەدەست نەدەهات .

هێرشبەری کارامەو زل و مل پان و ئایەتوڵا زادەی مەست و بێهۆش، بەناگاکەی ناوییان من و صادق قطب زادە پائتریس و پاتریسیا بین دەتوانین چی بکەین، تەنها دڵ خۆشی من ئەوەبوو، کە گومانم وابوو خانم دوریان مەکگرەی و دۆمەنیکی هاوکاری لەبیناکەدان و بێنەوەی هێرشبەرەکان ئاگاداربن خەریکی فیلم تۆمارکردنن، هەموو ئەم ڕووداوانەش دەبینن، ئەگەر نمایشێکی درۆینە نەبێت دێن بەهانامانەوە. چەند خولەکێك تێپەڕنەبووبوو سێ میوانی تر هاتنە ناو ئاژاوەکەوە، من دڵنیابووم لەدوای هاتنە ژوورەوەی ئەو چوار پیاوە مل پانە یەکێك لەوان دەرگاکەی داخستووە، بەڵام کاتێك سێ کەس بە بەرگی پۆلیسیەوە هاتنە ژوورەوە، دەرگاکە کرابوویەوە تازە هاتووەکان پێویستیان بە زەنگ لێدان نەبوو .

سەرەتا گومانم وابوو پۆلیسەکان ڕاستی نین و بەشێکن لە بەرنامەکە ، بەلاّم بوونە ڕاست و هەموومانیان کەلەپچە کرد ژن و پیاو ، لەدوای پشکنین دەمانچەکەم کەوتە دەستیان . هەمووما‌نیان گواستەوە بۆ ناوەندی پۆلیسی پاریس .

نەزانینی زمان هەر عەیبەیەکی هەبێت ئەم چاکەیەشی هەیە، کە مرۆڤ ئاگاداری ئەو ڕووداوانە نابێت خەریکن ڕوودەدەن. ئەو ڕۆژ و شەوە بارودۆخی ئێمە وابوو ، جگەلە صادق قطب زادە و بئاتریس و پاتریسیا، من و ئایەتولاّ زادەکان هیچ کامێکمان فەرەنسیمان نەدەزانی. هەتا بزانین پلە دارەکانی پۆلیس و دەستگیرکراوە فەرەنسیەکان لەنێوان خۆیاندا چی بەیەکتر دەڵێن، تەنها شتێك لێی تێدەگەیشتم گریە و زاری ئایەتولاّ زادەکان بوو.

لەدوای یەك مانگ لە ڕابواردن و عەیش و نۆش گیرۆدەبوون بەم ڕوداوە. لەوە دەترسان شۆڕشەکەی باوکی ئەزیزیان بکەوێتە مەترسیەوە ، دوای نزیکەی یەك کاژێر لە دەست بەسەربوون لە ناوەندی پۆلیس، کەوتبوە نزیك شارەوانی پاریس، هەمووما‌نیان لەیەك جیاکردەوە . هەیەکەو خراینە ژوورێکەوە لە دواساتەکانی جیاکردنەوەمان، صادقی قطب زادە بەهێمنی گوتی: لەبەر خاتری دەمانچەکە بارودۆخی تۆ لە هەمووما‌ن خراپتر دەبێت. لەوکاتەدا لەناو هەموو دەستگیر کراوەکاندا، بەو هەموو گومانەی هەمبوو هیچ یەکێکیان هێندەی من لەسەرخۆ و هێمن نەبوو. بیرم دەکردەوە بۆچی وام لێهاتووە کە ئەوەندە هێمن و لەسەر خۆم .

لەسەردەمی شا لەبەر سەربڕینی ناتەندروست کەوتمە زیندانەوە، وەها ترسابووم ئەم ترسە بووە هۆکاری نزیك بونەوەم لە سەید مەهدی هاشمی، ئێستا هەموو ئەوانەی لەژیانمدا ڕوویانداوە هەموتان دەیزانن، بووم بە پارتیزان بە تیرۆرست بە پیاوکوژ، مرۆڤم ئەشکەنجە دەدا، وابیرم دەکردەوە خەریکم تۆڵە دەسێنمەوە ، بەلأم ئێستا لەبەر خاتری بەدڕەوشتی و ڕابواردنی ئایەتولاَ زادەکان لە پاریس کەوتومەتە زیندان، زۆریش ئاسایی بوو بەلامەوە لەوانەیە ئەم بێباکی و هێمنیەم بۆ ئەوە بووبێ، کە بۆمن هیچ جیاوازیەکی نەبوو، من ئەکوڕی ئایەتولاَ خومەینیم ئەکوڕی شێخ حسێنعلی منتظری ئەباوکیشم دەیەوێت شۆڕش بکات، ئەخۆشم دەمەوێت پلەو پایەیەك بەدەست بهێنم لەبەر ئەوە لەزیندان مانەوە گرفت نەبوو بەلامەوە .

لە سوریا و لیبیا هێندە فێر بووبووم، هەتا بتوانم بەهەرنرخێك بێت لەزیندان هەڵبێم ، یەك دووجار پۆلیسم بانگکرد، هەرجارەو بە زمانێکی تێك و پێك شکاو وام هەست دەکرد بە فەرەنسی شتێکم گوتەوە، دواتر بۆم ڕوون دەبویەوە لێم تێنەگەیشتووە ، چونکە لە دوای قسەکانم یان خواردن یان جگەرەی بۆ دەهێنام.

کازێر ۹ ی شەو منیان لە بەندی تاکەکەسی هینایەدەرەوە بۆ هەمان ژووری یەکەمجار، واتە ئەو ژوورەی سەرەتا هەموومان لەوێ دەستبەسەرکرابووین.

لەکاتی ڕۆشتنم بۆ ئەوێ زانیم پێش من هەموو تومەتبارەکانی تری دۆسیەکە، جگە لە من و کارمن و سەروین و هاوسەر برا مل پانەکانیان هەمویانیان هێنابووە ئەوێ، جیا لە ئێمە بنی صدر و سلامەتیان و حەسەن

ئیبراهیم حەبیبی و حاج مانیان و پرۆفیسۆر سیف الدین نبوی و یەك دوو پارێزەری فەرەنسی لەوێ ئامادەبوون. پاتریسیا لە بەرچاوی هەموویان منی ماچکرد.

لەوکاتەدا صادقی قطب زادە هەوای دەمی خالّی دەکردەوە و گووتی : زۆریش خۆشحالّ مەبە دادگایی سەرەکی لە نوفل لوشاتۆیە .

هەرلەوکاتەدا بوو سەرو سیمای خانم دوریان مەککرەی بەدەرکەوت، دوای ئەوەی ماچی کردم گووتی: لەناو هەموویاندا زیاتر دڵم بۆ تۆ دەسوتێت تۆ لەهەموومایین بێ تاوانتری، کەچی قورسترین تۆمەت ئاراستەی تۆ کراوە ، ئیتر نە لە ئیقبالّ ئەحمەد و نە لە هیچ نەزان و گەمژەیەکی تر چەکی نیشاندا و پەیوەندیدار بە هیچ دەوڵەتێك لە کەس وەرمەگرە. ئەگەریش بەزۆر پێتیاندا لەیەکەمین هەلدا دوور فرێیبدە ، بەهۆی ئەم چەکە نەفرەتیەوە تەواوی ڕۆژ لە زیندان بوویت. بەسەر سورماویەوە گووتم : بەلاّم ڕووداوەکە شتێکی تربوو .

گووتی : هەموو شتێك دەزانم، لە بەختی خراپی ئێوە پۆلیس بەشوێن ئەو سۆزانی و پیاوانەوە بوون، چونکە ئەمانە باند و ئیشیان ئەم جۆرە کارانەیە ، ماوەیەك لەمەوپێش ئەم بەلاّیەشیان بەسەر وەزیری نەوتی سعودیە بەرێز ( ذکی یەمانی ) هێناوە و یەك ملیۆن دۆلاری کاشیان لێوەرگرتووە .

گووتم : ئێستا بارودۆخمان چۆن دەبێت ؟

گووتی : هەمووتان ئازاد دەکرێن، تەنانەت دەتوانن سکالاّ لەدژیان تۆمار بکەن ، بەلاّم بارودۆخی تۆ بەهۆی دەمانچەکەوە جیاواز دەبێت. وابڕیارە

ئەم بابەتەی تۆش هەرجۆرێك بێت پەردەپۆش بکەین. چونکە بەرێز ژیسکار دستن[10] نایەوێت و حەزناکات هیچ مەترسیەك بۆ شۆڕشی ئێران بێتە پێشەوەو. دواتر. دوبارە ماچی کردمەوە و گوتی: دونیایەکی پیسە وانیە ؟. منیش تەنها توانیم پێبکەنم.

نزیکەی کاژێر ١١ ی شەو کاری پەیوەندیدار بە ئازادکردنمان بەکۆتا گەیشت . هەمووومان بەرەو نوفل لوشاتۆ کەوتینەڕێ.

---

١٠ ( ڤالری ماری دونە ژۆرژ ژیسکار دستن ) بیستەمین سەرۆك کۆماری فەرەنسا لە ٢٧ ئایاری ساڵی ١٩٧٤ بۆ ٢١ ئایاری ساڵی ١٩٨١ پەیڕەوی ئاینی کاتۆلیکی ڕۆمانی . سەربە پارتی یەکگرتوی بۆ دیموکراسی فەرەنسا . وەرگێڕ

لەکاتی گەیشتنەوەمان دکتۆر یەزی دەیویست سەرزەنشتمان بکات، گووتی : بلاّوەی لێمەکەن ئیمام دەیەوێت هەمووتان پێکەوە ببینێت و بچنە خزمەتی .

قطب زادە لەبەر چاوی هەمووان و چەند کەسێك کە ئەسڵەن ئاگاداری ڕووداوەکەدا نەبوون، بەخێرایەکی چاوەڕواننەکراو یەخەی کراسەکەی یەزدی گرتوو خراپترین و پیسترین جنێوی ناموسی پێدا و گووتی : دایك قەحبە ئەگەر وابیردەکەیتەوە لەم بابەتەدا ناوێکی سازگار بە قوڕگدا دەچێتە خوارەوە بەهەڵەدا چویت و سەرت دای لەبەرد، هۆشت بەخۆتەوە بێت هەتا ئێستا گەورەیم نواندوە بەرامبەرت ...... ، پرۆفیسۆر نبوی یەزدی لەژێر دەستەکانی قطب زادە دەرهێنا ، چونکە لەوکاتەدا واتە نزیکەی کاژێر ٢ ی شەو کۆلۆنێل تامسۆن و پیاوێك بەناوی ساسان فەر و

ئەسەدوڵا موبەشیری کە دواتر لە حکومەتە کاتیەکەی مەهدی بازرگان بوو بە وەزیر لە ژوورەکەی خومەینی دەهاتنە دەرەوە.

دڵەڕوکێ بەکۆتا هات، ئێمە چاوەڕێ بووین هەتا خومەینی بانگمان بکات ، سەرەتا سەید ئەحمەد و دواتر ئەوانی ترمان چوینە ژوورەوە. خومەینی لەسەر پاڵپشتێك دانیشتبوو، تەنها کەسێك دەیتوانی لەتەنیشتی دابنیشێت خانم دوریان مکگرەی بوو. لەو کاتەدا خومەینی توڕە دەهاتە پێش چاو، دوای چەند چرکەیەك ڕووی کردە بنی صدر و گووتی : چی بوو ؟ بنی صدر گووتی : شتێکی گرنگ نەبوو، تەنها لێکتێنەگەیشتنێکی بچوك بوو ، چونکە ئەم بەڕێزانە جگە لە قطب زادە زمانی فەڕەنسیان نەزانیوە و بوەتە کێشە بۆیان، لێرەش ڕاپۆرت و ڕاپۆرت کاری شتێکی ئاسایە، هەتا کاری دۆسیەکەیان کۆتایی پێهات و داخرا کەمێکی پێچوو ، بۆیە هێندە دواکەوتین .

خومەینی ڕووبە سەلامەتیان گووتی: ئەی بابەتی پێج سەد هەزار فرەکەکە چی بووە ؟ سەلامەتیان بە دەسەپاچەی و پەشۆکاویەوە گووتی :
خۆشبەختانە پێویستی نەدەکرد.

قطب زادە لەتەنیشت منەوە دانیشتبوو بەهێمنی گووتی : ئەی دایك سەگ !.

خومەینی ڕووی لە سەید ئەحمەد و شێخ محەممەد کرد، بەدەنگی بەرز گووتی : ناسەلامەتی ئێوە ژن و منداڵتان هەیە و هاوخوێنی منن، مەگەر نازانن دونیا چاوی لەسەرمانە و هەتا کاری باش لەمنێمەوە بە ئەنجام بگات،

ئەم قورپەسەریانە هەلگرن بۆ دواتر، شەو ڕۆژێکە لێرە هەمووان لە دڵەڕاوکێدان.

هەروەها لە تۆش بەرێز قطب زادە تکادەکەم، ئیتر گوێ بۆ داواکاریەکانی ئەم دوو چەپەڵە ڕامەگرە. لەو کاتەدا یەکەمجارم بوو خەندەی خومەینی ببینم، ڕووی لەمن کردوو گوتی : لەبارەی ئێوە قسەی زۆرم بیستووە، کە بۆ ئێمە و ئیسلام چ فیداکاریەکتان کردووە. خودا خۆی پاداشتان دەداتەوە. ئێستا هەمووتان ئەم بابەتە لەبیری خۆتان ببەنەوە، لەبارەی ئامادە نەبوونتان لێرە، بڵێن بەشوێن کارێکی سیاسیەوە بووین. ئەحمەد و محەمەد بمێننەوە و ئەوانی ترتان دەتوانن بڕۆن .

کاتێك لەژوورەکەی خومەینی هاتینە دەرەوە قطب زادە بە سەلامەتیانی گووت : قەرزاری منیت، من و برادەران لە زیندان بووین و تۆش دەتویست پێنج سەد هەزار فرەنك حەپەلوش بکەیت، بۆ مەگەر من بتم ، دوریان تازە لە ژوورەکەی خومەینی دەهاتە دەرەوە، قطب زادەی لەگەڵ خۆی برد و ئێمەش بلاوەمان لێکرد.

خەو تەنها شتێك بوو پێوستیمان پێ ی بوو ، بەلاّم مەگەر فکر و خەیاڵ دەیهێشت، ئەوەی بە خەیاڵمدا دەهات ئەوە بوو، لە چوارچێوەی نوفل لوشاتۆ هەر شتێك دەگوزەرا درۆ بوو، هەموویان حەزیان لە درۆ بوو ، ئیمام درۆی دەکر ، بنی صدر هەروەها ، قطب زادە درۆی دەکرد ، دکتۆر یەزدی درۆی دەکرد ، درۆ ، درۆ ، درۆ . ئەمەش لەناو ئەوکەسانی کە یەکتریان بەباشی دەناسی.

من، بەهیچ شێوەیەك نامەوێت بچمە ناو ژیانی تایبەتی کەسەکانەوە، ئەگەر نا زۆرم لەو فسق و فجور و بەد ڕەوشتیانە دیوە ، ئەڵبەتە ئەمەش بەو مانایە نا خۆشم بێبەریبم لە عەیب و عار، نەخێر ، ئەگەر من خاوەنی عەیب و عارێکیشبم گووتومە و پاشماوەکەشی بەڕاستگۆیانە دەڵێم، ئیتر خۆ هەڵکێشانێکم نییە ، سەر و بنی زمانیشم باسی خودا و پێغەمبەر و بەهەشت و جەهەنەم نیە.

بەهەرحاڵ با لێرەدا ئەمەش بڵێم، لەدوای ڕووداوی ئەوەشەوە بتەوێ و نەتەوێ قطب زادە لەبەرچاوی خومەینی کەوت ، ئەگەر نا، هەتا پێش ئەو شەوە قطب زادە سۆمای چاوی خومەینی بوو. بەتایبەت لە بابەتی ئەو هاوکاری و پشتیوانیانەی لە دەوڵەتی سوریا و جەزائیر و لیبیا بۆ خومەینی دەستەبەر کردبوو.

قطب زادە خۆی بەمنی گووت ئەگەر ئەو ڕووداوە نەهاتبایەتە پێش لە جێگای سەرپەرشتی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن دەکرام بە سەرۆك وەزیرانی کۆماری ئیسلامی .

هەروەها خاڵێکی تر کە پەیوەندیدار بوو بە ڕابواردن و عەیش و نۆش، دەبێت ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە لەداوی ئەو ڕوداوانە ( فاتمە خومەینی ) واتە هاوسەری ئەحمەدی خومەینی، خوشکی صادق طباطبایی هەتا لیواری لێکجیابوونەوە ڕۆشتن ، بەڵام بە نێوان گیری هاوسەرەکەی ئیمام و براکەی و خوشکەکەی ئیمام موسا صدر، ناچار بە پەشیمان بوونەوە کران.

لەوانەیە فاتمە بیری تۆڵە سەندنەوە کردبێت، بۆیە عاشقی ڕۆژنامەنوسێکی کەنەدی بوو دواتر لە جێگای خۆیدا چیرۆکەکەیتان بۆ دەگێڕمەوە .

دووبەرەکی یەکەی سەید ئەحمەد و فاتمە، هەتا چوار ساڵ دوای سەرکەوتنی شۆڕش درێژەی کێشا .

لەبەرئەوەی دەمەوێت زووتر بگەمە سەر یادەوەریەکانی ڕۆژانی گەڕانەوە و نیشتەجێ بوونم لە تەهران، ناچارم هەندێ لەو بابەتانەی لە نوفل لوشاتۆ یان ئەو ڕووداوانەی  بە جۆرێك پەیوەندیان بە ئێرانەوە هەیە و بنەماکەی لە نوفل لوشاتۆیە باسبکەم. وەك؛ ڕووداوەکەی کەریم سنجابی، یان سەید جەلال تەهرانی، یان لیستی ئەو ناوانەی دەبوو لەسەرەتای شۆڕشدا لە سێدارە بدرێن ، پێش ئەوەی بگەمە سەر ئەو ناوانە، دەبێت ئەمەش بڵێم لەماوەی دوومانگ مانەوەی خومەینی لە پاریس، من بە ناونیشانی سەرپەرشتیاری پاسەوانە تایبەتیە ئێرانیەکانی خومەینی دەستنیشان کرام، لەو کەسانەی لە ئێران یان وولأتانی تر دەهاتن بۆ لای خومەینی،  دەبوو من دیدارەکەیان بۆ ڕێکبخەم نزیکەی دووسەد و بیست هەزار دۆلارم وەك پاداشت و بەخشیش وەرگرت. بەهاوکاری و ڕێنمایی خانم دوریان مەکگرەی ئەژمارێکی بانکیم لە لەندەن کردەوە، پارەکەم خستە بانکەوە تا ئێستاش سود لەو پارەیە وەردەگرم.

ئێستا تێبینی بکەن، کاتێك ئەو برە دەستی من کەوتبێت، ئەی ئەو ڕێژەیەی کەسانی تری وەك : ئیقباڵ ئەحمەدی سەرۆکم یان دکتۆر یەزدی یان بنی صدر و ئەوانی تر دەستیان دەکەوت، دەبێت چەند بوو بێت.

دوباره بەبیرتان دەهێنمەوە، ئەو برە پارەیە هەندێك لە دۆستانی خومەینی، دەیانبەخشی بە شۆڕش بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ نەبوو ، بەڵكو لەڕێگای (حاج عراقی و مانیان )ەوە بوو. ئەو پارانەیی بە ئێمە دەدرا، لەلایەن هاوڕێ نمەك نەناس و سپڵەكانی شای ئێرانەوە دەهات. هەندێكی تریان، هێندە بە سوكی و سەرشۆڕیەوە بە برە پارەیەكی زۆرەوە دەهاتن بۆ پێ ماچكردنی خومەینی، چونكە هەمیشە لە خەون و خەیاڵی ڕابردوودا دەژیان، ئەگەر تەنها كارێكی باش خومەینی لەهەموو تەمەنیدا كردبێتی دوای شۆڕش ئەوە بوو پێش هەموو شتێك كەوتە گیانی ئەوان و چووە سەروەختیان.

ڕۆژانی مانەوەی خومەینی، لە پاریس ڕۆژنامەنوسان و پەیامنێرانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەكان تەنها ڕواڵەتی بابەتەكان واتە تەنها ڕوخساری ڕووداوەكانیان رووماڵ دەكرد ، زۆر بوون ئەو بابەت و ڕووداوانەی تر لە پشت پەردەوە و دوور لە چاوی ڕاگەیاندنەكان ڕوویان دەدا ، ئەگەر لە سەدا یەكی ئەو ڕووداوانە بكەوتبایە دەست ڕاگەیاندنەكان و بلاْویان بكردایەتەوە، بێگومان پێ ی خومەینی و هاوەڵەكانی كە منیش یەكێك بووم لەوان هەرگیز نەدەگەیشتەوە ناو خاكی ئێران.

بەنارمە و پلانەكانی نوفل لوشاتۆ لایەنی ئاشكرا و نهێنی هەبوو ، ئێستا لەدوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ، بەو ئەزموونانەی بەدەستم هێناوە. دەتوانم بەڕاشكاوی بڵێم، ئەو بابەتانەی بە ئاشكرا باسدەكران، جگە لە درۆ و هەڵخەڵەتاندن هیچی تر نەبوون . بۆ نمونە ؛ ئەو هەڵخەڵەتاندن و كلاْو لەسەرنانی دكتۆر شاپوری بەختیار، كۆتا سەرۆك وەزیرانی حكومەتەكەی

شا، لەلایەن خومەینی یەوە، هەروەها هەموو ئەو شتانەی دەگوتران و دواتر دەنوسران، هەمووی درۆ بوون.

ڕاستیەکەی ئەوەیە، ئەگەر لە کۆبونەوە شەوانەکانی نوفل لوشاتو رێکبکەوتنایە لەسەر لیستی ئەو ناوانەی کە دەبوو لە دە ڕۆژی یەکەمی سەرەتای شۆڕش لە سێدارە بدرێن، هەم دکتۆر شاپوری بەختیار دەهات بۆ پاریس ، هەم ئەگەر دکتۆر یەزدی و قطب زادە و بنی صدر بیان هێشتبا و هێندە بەگوێ ی خومەینیان نەخوێندایە، لەوانەبوو بەختیار بە جێگای دکتۆر مەهدی بازرگان ببوایە بە سەرۆك وەزیرانی سەردەمی شۆڕش .

کورتەی بابەتەکە لەمەدا کۆدەبێتەوە، ئەمریکیەکان و ئینگلیزەکان لیستێکی هاوبەشیان ئامادە کردبوو. ناوی ٤٨٣٠ کەسی لە خۆگرتبوو. وەك؛ فەرماندەکانی سوپا ، ئەفسەران ، وەزیر و پارێزەر ، بازرگانەکان ، مامۆستایانی زانکۆ ، ئەندازیارانی بەڵێندەر ، پزیشکانی خاوەنکاری دەوڵەتی ، پیاوانی ئاینی و ڕۆژنامەنوسان ، ئەمانە ئەو چین و توێژانەبوون، لەم لیستە هاوبەشەدا ناویان هاتبوو. کە دەبوو لەماوەی هەمان دە ڕۆژی یەکەمی شۆڕش، بە پەتی سێدارەدا هەڵبواسرێن ، خومەینی و ڕاوێژکارە نزیکەکانی، زۆرێك لەو کەسانەیان نەدەناسی، لەوانەیە ئەمە بووبێتە هۆکار هەتا خومەینی زۆر زووتر لەوەی بیری لێبکاتەوە ڕازیبونی خۆی لەسەر لیستی ناوەکان نیشانبدات ، بەڵام بوونی ناکۆکی لەسەر لیستەکە، لەنێوان ئەمریکیەکان و بریتانیەکان بووبوە هۆکار، بۆ ڕۆژ بە ڕۆژ دواخستنی بڕیاردان لەسەری .

لەم لیستەدا ٣٠٠٠ کەس لەلایەن ئەمریکیەکانەوە و ١٨٣٠ کەس لەلایەن بریتانیەکانەوە، دیاری کرابوون ، هیچ یەکێك لە ئێمە، هەرگیز نەمانزانی ، بۆچی کۆلۆنێل ئیداور تامسۆن و میستەر ساندەرزی بریتانی بەجێگای ئەوەی کێشە و بابەتەکانیان لەنێوان خۆیاندا چارەسەر بکەن هانایان دەبردە لای خومەینی !.

بەو جۆرەی دەگوترێت، ئەمریکیەکان هەمان لیستیان دابوو بە باڵوێزی شا، (ئەردەشیری زاهیدی) ئەویش لەکاتی سەفەرکردنی بۆ ئێران، لەگەڵ خۆیدا بردبووی. ئەو لیستەی ئەمریکیەکان دابوویان بە زاهیدی، هەڵگری زیاتر لە چوار هەزار ناو بوو، ئەڵبەتە بەبێ ڕەچاوکردنی لیستی بەریتانیەکان ، ئەمانە دوریان مەگگرەی لە دوای ڕووداوی لەسێدارەدانەکان لە ئێران بۆی باسکردم .

لیستی ئەمریکیەکان، زیاتر ناوی پلەدار و ئەفسەرانی سوپای لەخۆ گۆتبوو ، لیستی بریتانیەکانیش زۆربەی ناوی کەسانی سڤیل و ٢٥ کەس لە پیاوانی ئاینی ناودار بوون ، تا ئەوجێگایەی من زانیاریم هەبووبێ، زۆرێك لەوان بە بێدەنگی و ئارامی و بێ دادگایی کردن، بەشێوەیەکی دڵتەزێن کوژران ( ئایەتوڵا عەلامە بوشەهری ، ئایەتوڵا سەید محمد خلفی نائینی ، ئایەتوڵا سەید مەحمود سادات ئەشکەومری ، ئایەتوڵا حاج سەید ئەسەدوڵا نظام العلمای تفشەری ، ئایەتوڵا ڕەحمەتوڵا ئیمامی دەستجردی ) ئەمانە بەشێك بوون، لەو پیاوە ئاینیانەی کە من بەشداربووم لە ڕووداوی مردنەکەیان بەشێوەیەکی دڵتەزێن .

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێبکەم، ناوی ئایەتولاّ سەید مەحمودی طالقانی یە لە لیستی بەریتانیەکاندا هاتبوو، تەنها کەسێك بوو خومەینی ڕەزامەندی لەسەر لەسێدارەدانی دەرنەبڕی. وە ئەوە ڕاست نیە کە دەگوترێت، ئایەتولاّ طالقانی بە پلان و دەست تێوەردانی ئایەتولاّ بەهەشتی کوژراوە. بەڵکو پلان دارێژەران و بکوژانی ئایەتولاّ طالقانی، دکتۆر مستەفا چەمران و فخرالدین حیجازی بوون. کاتی خۆی هات ئەویشتان بۆ باس دەکەم.

بۆئەوەی لە چارەنوسی پیاوە ئاینیەکانی تر ئاگاداربن، ناچارم ئەم ڕازەشتا بۆ بدرکێنم، دروست لەو شەوەی ژەنراڵەکان ( نصیری و ناجی ) گوللەبارانکران، خالخالی لە زیندانی قصر ۳۱ کەس لە پیاوانی ئاینی دەست بەسەرکراوی هێنایە دەرەوە و لە مزگەوتی زیندان دانیە بەر ڕێژنەی گوللە، بەداخەوە پارتیزانەکانی ژێر چاودێری من بەشداریەکی کاریگەریان لەو کوشتارە بە کۆمەڵەدا هەبوو. پارتیزانەکان لەناوخۆیاندا بەو شەوەیان دەگووت شەوی کوشتنی ئاخونەدەکان .

دەبینن ڕەگ و ڕیشەی ئەم جۆرە کارانە، لە نوفل لوشاتۆ داکوترا بوون نەك لە تەهران. لەو پەڕی بێ سەروبەری کارەکاندا هێزی بڕیاردان و ئەنجامدانی وەها کارێك لەبارودۆخێکی وەهادا ، لەڕاستیدا ڕێژەی مەترسیداریەکەی لە پلەی سفردا بوو .

یان با نمونەیەکی ترتان بۆ بهێنمەوە ، پلانی ڕێوڕەسمی ڕۆشتنی سەربازی فڕۆکەوانەکان، لەبەرامبەر خومەینی لە نوفل لوشاتۆوە بەرنامەی بۆ

داڕێژرابوو. لەهەمان ئەو کۆبونەوانەی نیوەشەو کە ئیدوارد تامسۆن و ئەوانی تر لەگەڵ خومەینی دەچوونە خەڵوەتەوە .

لە کەم تازۆرێکی ئەم پلان و بەرنامانە ئاگادرابووم، بە بەڵگەی ئەوەی، پارتیزانەکانی من بەرپرسیارێتی ئاسایشی و پاراستنیان لە ئەستۆدابوو.

ڕاستی ڕوداوەکان بەمجۆرەیە دزە کردنە ناو سوپا دوبەرەکی خستنە ناویان، وەك کرم کەوتبووە گیانی کۆبونەوە شەوانەکانی نوفل لوشاتۆ، هەر بۆ ئەم مەبەستە ژەنراڵ ( هایرز ) یان ڕوانەی ئێران کرد، هەتا لەبارەی کاری دوبەرەکی نانەوە لەناو سوپا دەستبەکاربێت ، ئەمریکیەکان و خومەینی باش دەیانزانی سوپا بەو ئاسانیە خۆی نادات بەدەستەوە. هەروەها وەفادارن بەو سوێندە بە قورئانی پیرۆز خواردبوویان، کە فەرمانێکی مەزهەبی بوو شکاندنی کارێکی ئاسان نەبوو. تەنها کلیلی سەرکەوتن دروستکردنی دووبەرەکی و دزەکرنە ناو سوپا بوو .

کۆڵۆنێل ئیدوارد تامسۆن بەبەردەوام دەیگوت، ئێوە بیری دزەکردنە ناو فەرماندەکانی سوپا، تەنانەت پلەدارو ئەفسەرەکان یان کڕین و بەکرێ گرتنیان، لە مێشکی خۆتا بهێننە دەرەوە ، ئەو دەیگوت؛ ئەڵبەتە، ئێمە تەنها چەند کەسێکی ناڕازیمان لە چنگدایە، ئەمەش بەمانای دزەکردنە ناو سوپا نایەت.

تەنها زەمینەی گونجاو فێرخوازانی هێزی ئاسمانی و دەریای ئێرانن، کە لە ئەمریکا خولیان بینیوە و بۆ ئەمجۆرە کارانە پەروەردەکراون. هەر دوو گروپەکەش لەژێر چاودێری دوو جێگری هێزی ئاسمانی و دەریاین و لە ئامادەباشی دان ، بەڵام دەبێت لەم ماوەیەدا، بە بەرنامەیەکی نمایشی ترسی

ئەوان برەوێنینەوە. ئەمەش بە پێشنیاری هەردوو جێگرانی هێزی دەریای و هێزی ئاسمانی بوو. کە بەهۆی ڕاوێژکارێکی ئەمریکی بەناوی ( کۆلۆنێل گیست ) لە تەهرانەوە هێنرابوون بۆ نوفل لوشاتۆ. دەبوو لەسەرەتای هاتنەوەی خومەینی بۆ تەهران، فڕۆکەوانەکان بە نمایش و ڕێ و ڕەسمی سەربازی بە بەردەمی خومەینیدا بڕۆن.

چایچی و جمشید نعمانی و فڕۆکەوانێکی هێزی دەریای بەناوی (عباس رضا زادە) بە فڕۆکەیەکی ڕاوێژکاری سەربازی، ڕۆشتن بۆ تەهران. هەتا لەژێر چاودێری ژەنراڵ (ئازەر بەرزین) جێگری هێزی ئاسمانی و ژەنراڵ (مەجیدی) جێگری هێزی دەریایی، لەگەڵ ئەو فڕۆکەوانانەی کە کۆلۆنێل تامسۆن بە لیستێك پێ ی دابوون، بەهاوکاری کەسێك بەناوی حاج مانیان لە جەبهەی میللی[10] پێکیان بناسێنێت و پەیوەندیان پێوەبکەن و هەرجۆرێك بووە، کاری ئەو نمایشە ساختەیە لەگەڵ فڕۆکەوانەکان بەئەنجام بگەیەنن. ئەگەر نەکرا جل و بەرگی فڕۆکەوانی بدەن بەکەسانی تر، هەتا وەك فڕۆکەوان دەربکەون.

بۆ ئەم مەبەستە پارتیزانەکانی من، بە هاوکاری حاج مانیان بەرگ دروویەکیان بەناوی (خلیل عمادی) لە شەقامی ژاڵە نزیك ئاب سەردار ڕاسپارد، هەتا نزیکەی چوارسەد دەستە جلی فڕۆکەوانی هێزی ئاسمانی ئێرانیان بە ئەندازەی جیاواز بۆ بدروێت، کلاّویش بە هەمان ئەندازە و

---

[10] جەبهەی میللی حیزبێکی سیاسی بوون، ساڵی ١٩٤٩ ز لەلایەن چەند سیاسەتمەدارێکی ئێرانی وەك ( د. محمد مصدق ، حسێن فاطمی ، کریم سنجابی ) هوە دامەزرێنرا ئامانجیان ( میللی گەرایی ، دیموکراتی ، سیکولاریزم ) بوو. وەرگێڕ

بەشێوەیەکی نهێنی لە کلاّو فرۆشی تاج، لەشەقامی پەهلەوی چوار ڕیانی سپەهـ کردران .

نمایشە ساختەکە بەبێ ئامادەبوونی تەنها فرۆکەوانێکی ڕاستەقینە و بە بەشداری کەسانێك کە دڵخۆش بوون، بە دەستێك جلی سپی و جوتێك پێڵاو، یەکی پەنجا هەزار تومان ڕێ ڕۆشتنە سەربازیەکە، لەبەرامبەر خومەینی ئەنجامدراو بەئاسانی پشتی سوپا بەهێزەکەی شا شکا .

یادەوەریەکانی مانەوە لە پاریس و نوفل لوشاتۆ، ناتوانم بەبێ ئاماژەکردن بە ڕووداوەکەی دکتۆر سنجابی و دەست لەکارکێشانەوەکەی جلال تەهرانی بەکۆتا بهێنم. بەتایبەت پێشتر پەیمانم دابوو لەبارەی هەردوو ڕووداوەکەوە بدوێم .

لەناوەڕاستی ڕۆژانی مانەوەی خومەینی لە نوفل لوشاتۆ بوو، شەوێك صادقی قطب زادە بانگی کردم و گوتی : جەعفەر دوو کەس لەو کوڕانەی جێگای متمانەی خۆتن هەڵبژێرە، سبەی بەیانی بچن بۆ فرۆکەخانە، پێشوازی لە کەسێکی گرنگ و پایە بەرز بکەن، سبەی لە تەهرانەوە دێت ، پریسم ئێوەش دێن ؟

گووتی : نەك تەنها من ، بەڵکو بنی صدر و حەبیبی و بناتریس یش دێن.

دوو لە پارتیزانەکانم هەڵبژارد، بەیانی زوو ڕۆشتین بۆ فڕۆکەخانە. ئەو میوانە گرنگەی چاوەڕێمان دەکرد دکتۆر کەریم سنجابی[11] ڕابەری جەبهەی میللی بوو.

بەڕێگاوەبوو بۆ کەنەدا هەتا بەشداری لە کۆبونەوەیەکدا بکات و وەستانێکی هەبوو لە پاریس. سەرەتا دکتۆر سنجابی زۆر خۆبەزلزان و لەخۆبایی بوو. هەرکە پێ ی نایە نوفل لوشاتۆ ئیتر تێگەیشت کەس حسابی بۆ ناکات و ئاوڕی لێناداتەوە، پلە بە پلە ڕەفتارەکانی گۆڕی و قطب زادە گوتەنی خاکی بویەوە .

خومەینی دوو ڕۆژ ئەوی لە چاوەڕوانیدا هێشتەوە، هەردوو ڕۆژەکە بە بیانوی جۆراوجۆرەوە پێشوازی لێنەکرد. ئەو کەسەی ئەم ڕێ و شوێنانەی بۆ خومەینی دادەنا ئیبراهیم یەزدی بوو. من بە گوێ ی خۆم گوێم لێبوو ئەندازیار مەهدی بازرگانی ڕادەسپارد ئەم کارانە ئەنجام بدات.

لە ئاکامدا لە دوای دوو ڕۆژ سنجابی دەنگی ناڕەزایی لێ بەرز بوویەوە و ڕووی لە حەبیبی و بنی صدر و قطب زادە کرد و گووتی : ئێوە ناتوان لە پاریسەوە هیچ شتێك بکەن، هەتا جەبهەی میللی نەیەوێت هیچ کارێك لە تەهران ئەنجام نادرێت .

---

[11] کەریم سنجابی کوڕی قاسم خان سەردار ناصری سەرۆك هۆزی سنجاب لە ساڵی ١٩٠٥ ز لە کرماشان لە هۆزێکی کورد لەدایك بووە ، سیاسەتمەدار و ڕابەری جەبهەی میللی و وەزیری ڕۆشنبیری حکومەتەکەی دکتۆر مصدق لە ساڵی ١٩٤١ ز لە ٤ ی جولای ١٩٩٥ ز لەتەمەنی ٩٠ ساڵی لە شاری کاربۆندیلی وویلایەتی ئیلینۆی ئەمریکا لە ماڵەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ

ئەم سێ کەسە زۆر هەوڵیاندا ڕێز لە سنجابی بگرن ، بەلأم دکتۆر یەزدی بە پێچەوانەی ئەوان قسەی کرد و گووتی : بەڕێز دکتۆر سنجابی، ئیمام زۆر گرفتارن و ناتوانن چاوپێکەوتنی تایبەت ئەنجام بدەن ، بەلأم لەوانەیە بتوانرێت بۆت ڕێك بخەین، ئێوەش لەگەڵ میوانەکانی تر بچنە خزمەتی. لە ڕاستیدا دوای بیستنی ئەم قسەیە ڕوخساری سنجابی زۆر گۆڕا، وەك نیوە جەڵتە لێی دابێت وایلێهات ، بەلأم دوای چەند چرکەیەك سنجابی گووتی : ئێستا کە وایلێهات من زیاتر لەمە دان بەخۆداناگرم نامێنمەوە دەچم بۆ کەنەدا.

قطب زادە هەوڵیدەدا هەتا سنجابی زویر نەبێت، بۆیە بردیە ژورێکی تر و بەڕواڵەت بارودۆخەکە هێمن بویەوە. کاژێرێك دواتر ڕاسپێردرام بەڕێز دکتۆر سنجابی بۆ بەشداریکردن لە کۆبونەوەیەکدا ببەم بۆ پاریس، بۆ بیناکەی شەقامی فوش.

بە ئۆتۆمبێلێکی پژۆ لەگەڵ عەلی شاکری و دکتۆر سنجابی گەیشتینە شوقەکەی شەقامی فوش، بئاتریس دەرگاکەی لێکردینەوە و بەخێرهاتنی کردین. هەرکە چاوم بە دکتۆر یەزدی و خانم دوریان مەککگرەی کەوت ئیتر زانیم سفرەی پلانگێڕی ڕاخراوە.

دوریان سەرەتا دکتۆر سنجابی و دواتر منی ماچکرد، گوێ ی بە شاکری نەدا.

دۆسیەیەکی گەورە و گرانی دایە دەست سنجابی و گووتی : هەتا من قاوەیەك ئامادەدەکەم، جەنابی وەزیر سەیرێکی ئەم دۆسیەیەبکەن.

سنجابی دۆسیەکەی وەرگرت و دەستی بە سەیرکرن و خوێندنەوە کرد. ڕەنگ بەڕوویەوە نەما، گوتم کە دۆسیەیەکی گەورە و گرانبوو. سنجابی بەخێرایی خەریکی هەڵدانەوەی پەڕەکانی بوو، هەندێجار کەمێك لەسەر پەڕەیەك دەمایەوە، لەو هەوا ساردەی پاریسدا ئەو پیرە پیاوە عرەقێکی زۆری دەردا بوو. لە ئاکامدا نەگەیشتە کۆتایی دۆسیەکەو دایخست و ڕویکردە یەزدی و گووتی ؛ وادیارە ئیمام حساباتی وردی بۆ هەموو کارەکان کردووە ، ئێستا بڵێن بزانم دەبێ چی بکرێت .

لەو کاتەدا یەزدی پێدەکەنی و دۆسیەکەی لە سنجابی وەرگرت و گووتی ؛ ئەڵبەتە ئێوە ناچن بۆ کەنەدا ئەمە فەرمانی حەزرەتی ئیمامە، بەجێگای ئەوە دەچنە دیداری بەرێزیان. دواتر ئەم بەیاننامەیەی کەئێستا بە ڕا و بۆچونی خۆتان کەم و زیاد دەکرێت، دەنوسرێت و ئیمزای دەکەن، هەتا لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەکاندا بلاّوبکرێنەوە .

من هەرگیز نەمزانی چی لەناو دۆسیەکەدا بوو. لەکاتێکدا قطب زادە پێداگیری دەکرد هەرچۆنێك بووە دەبێ بزانم دۆسیەکە چی تێدایە ، بەلاّم تەنها ئەوەندە دەزانم لە دوای بینینی ئەم دۆسیەیە سنجابی بەیاننامە بەناوبانگەکەی لەبارەی نایاسایی بوونی دەستەلاّتی پاشایی لە ئێران ئیمزاکرد.

ئەڵبەت، بە ئاگاداربوون لە دۆخی هاوشێوە کە بۆ( سەید جەلال تەهرانی)[12] هاتە پێش، دەکرێت وەها گومان ببرێت دۆسیەکەی سنجابیش لەو بازنەیەدا بخولێتەوە ، بەڵام بابەتەکەی سەید جەلال تەهرانی لەوە وە سەرچاوەی گرت، کە ئەو بەناونیشانی سەرۆکی شورای سلطنت[13] هاتە پاریس، هەتا بچێتە دیداری خومەینی، بەپێ ی بڕیارێکی پێشوەخت هیچ مەرجێك بۆ ئەم دیدارە دانەنرابوو، بەڵام هەرکە گەیشتە پاریس لەدوای کۆبونەوەیەکی شەوانە بە ئامادەبوونی خومەینی ، یەزدی، دوریان مەکگرەی ، قطب زادە ، بروس لینگن و ئیدوار تامسۆن، barودۆخەکە بە شێوەیەکی تر گۆڕدرا .

ئەمجارە، ڕاسپێردرام سەید جەلال ببەم بۆ شوقەکەی شەقامی فوش. بە بیستنی ئەم هەواڵ بۆنی پیلان گێڕیەکی تر گەشتە لوتم، دۆسیە و نێچیری ئەمجارەش سەرۆکی شورای سلطنت بوو .

پاتریسیا دەرگای لێکردینەوە، ئەمجارە جگە لە دوریان مەکگرەی، سەید ئەحمەد خومەینی و کۆلۆنێل تامسۆن ، شێخ شەهاب ئیشراقی و محەمەد

---

[12] سەید جلال تەهرانی ، سیاسەتمەدار و بیرکاری زان ، ئەستێرەناس و دەوڵەتمەداری ئێرانی لەساڵی ١٨٩٦ ز لە تەهران لەدایك بووە لە سەردەمی حوکمڕانی شا ،چەندین جار بە سیناتۆر و وەزیر هەڵبژێردراوە . ساڵی ١٩٨٧ ز لە پاریس کۆچی دوای کردووە . وەرگێڕ.

[13] شورای سلطنت ، لە ڕۆژەکانی کۆتایی دەستەڵاتی شای ئێران، بە پێشنیاری عەلی ئەمینی ، بەفەرمانی محەمەد ڕەزا شا لە ساڵی ١٩٧٨ ز بەمەبەستی نزیك بونەوە و پەیوەندیکردن بە خۆپیشاندەران و هێورکردنەوەی بارو دۆخەکە دامەزرێنرا ، ئەندامەکانی بریتین بوون لە ( سەید جلال تەهرانی سەرۆك و ئەندام ، شاهپور بەختیار ، محەمەد سجادی ، جەواد سعید ، محەمەد عەلی وارستە ، عبداللە انتظام ، عەلی قولی انتظام ، عەلی ئابادی سەرۆکی دادگاکانی پێشوی ئێران ، عەباس قەرەباغی ) . وەرگێڕ

منتظری لەوێ ئامادەبوون. هەواڵێك لە دکتۆر یەزدی نەبوو. عەلی شاکریش لەبەر دزینی هەشت هەزار فرەك لەم جۆرە کارانە دورخرابوویەوە و لە جێگایەکی تر سەرگەرم بوو .

لە دوای سلاو کردن و بینینی و ماچکردن، شێخ شەهاب ئیشراقی گووتی: ئێستا لە دەنگە دەنگ و سەرئێشەکانی نوفل لوشاتۆ هاتوینەتە دەرێ، خراپ نیە چەند خولەکێك فیلمێکی خۆش سەیربکەین.

گلۆپی ژوورەکە کوژێنرایەوە، کۆلۆنێلێ تامسۆن ئامێرێکی بچوکی فیلم نمایشکردنی خستەکار و چەند خولەکێك دواتر فیلمی پێش بینی کراو نمایشکرا، دەسپێکی فیلمەکە بە تریاك کێشان دەستی پێکرد .جەنابی سەرۆکی شورای سلطنت سەید جەلال تەهرانی، لەسەر دۆشەکێك ڕاکشابوو، تریاکی دەکێشا. گرتەکانی دواتر لەو پیستر بوون، نزیکەی چل و پێنج خولەك، هەمووومان شاهیدی بنینی عەشق بازی پیرە پیاو، لەگەڵ چەند سۆزانیەکی ناسك و لوس، هەروەها دیمەنی هاوڕەگەز بازی ئەو بووین، گرتەکان پیاوی دەخستە دۆخی هێڵنجدان و تێکچوون ، پاڵەوانەکەشی سەید جەلال تەهرانی بوو.

شوێنی فیلم تۆماکردنەکە ئاشنابوو بۆم. هەمان نوسینگەی قطب زادە بوو، لە شەقامی کلیشی، ئێستا ئیتر هیچ گومانێکم نیە، لەوەی تەنانەت لەخودی منیش لەم جۆرە فیلمانە تۆمارکراوە . گرتە عەشق بازی و هاوڕەگەز بازیەکانی سەید جەلال تەهرانی، یەکێك بوو لە پیسترین و قێزەون ترین دیمەن لەهەموو تەمەنمدا بینی بێتم .

پیره پیاوی لاوازی ئێسك دەرپەڕیوو ڕووت و قووت بوو. لەوانەشە لە ژێر کاریگەری مادەی هۆشبەر و سڕکەر ئەم کارە نابەجێ و دزێوانەی ئەنجامدابێت، بەڕاستی ئەوەی بینەر دەیدی، دوچاری ئەفرەت کردن دەبویەوە ، دیار بوو فیلمەکە لەماوەیەکی دور و درێژ تۆمار کراوە ، نزیەکە سێ چارەکە سەعاتی خایاند، هەتا گڵۆپی ژوورەکە هەڵبوویەوە. سەید جەلال تەهرانی دەتگووت مشکی بە ئاودا کراوە ، شێخ مەلا شەهاب ئیشراقی بەدەنگی بەرز پێدەکەنی و گووتی : فیلمێکی تەماشایی بوو بەڕێز تەهرانی ، ئێستا حەزرەتی پایەبەرزی پاك داوێن بەم پێشینەیەوە، نیازی چونە دیداری ئیمامی هەیە ئەڵبەت ڕێگەشتان پێدراوە .

تەهرانی سەری شۆڕکردبوویەوە و بەدەنگی بەرز دەگریا. چەند خولەکێك دواتر، دوریان مەکگرەی لە سەید جەلال نزیك بویەوە و لەکاتێکدا پیرە پیاو هەر دەگریا، ماچی کرد و گوتی : بیری لێ مەکەرەوە، بێئاگای لەخۆتانەوە بووە ئەگینا ئەم کارانە لە شەو و ڕۆژێکدا ئەنجام نادرێت ، لەوانەیە دەست لەکارکێشانەوەتان لە سەرۆکایەتی شورای سلطنت، قەرەبووی هەڵەکانت بکاتەوە. داوی ماوەیەکی کەم دووبارە پاتریسیا شتومەکی تریاك کێشانی ئامادەکرد، سەید جەلال و شێخ مەلا شەهاب لەدوای کێشانی چەند بەستەیەك تریاك، سەرگەرمی نوسین و ڕێکخستنی ناوەرۆکی نامەی دەست لەکارکێشانەوەکە بوون. دواتر قطب زادە بۆی گێڕامەوە، لەکاتی چونی سەید جەلال بۆ دیداری خومەینی ، ئیمام پێ ی گوتبوو ، بیستومە پێش نوسینی نامەی دەست لەکارکێشانەوەت چویتە سینەما، لەم جۆرە فیلمانە لە تەهران نمایش ناکرێت مانەوت لێرە بە

سوودی خۆتە.  لەدوای ئەو ڕووداوەوە ئیتر سەید جەلال نەگەڕایەوە بۆ ئێران.

لێرە بەدواوە، یادەوەریەکانی من لە نوفل لوشاتۆ شتێکی گرنگی تێدانیە شایستەی گوتن بێت . لە ڕاستیدا دەمەوێت دڵنیاتان بکەمەوە، ئەمە هەموو پێشەکی یادەورەیەکانی من بوون. بۆئەوەی بگەینە سەر باسە سەرەکیەکانی ناو ئێران ، ڕوداوەکانی پەیوەندیدار بە سەفەری خومەینی لە پاریس بۆ تەهران هەر ئەوانەبوو لە تەلەفزیۆنەکان نیشان دەدران .

لەناو ئەو جەمبۆجێت ئێر فرانسەی ئێمەی هێنا بۆ تەهران، جێگای پلانگێڕی نەبوو، ئەگەریش ببوایە نەدەتوانرا لەبەرامبەر ئەو هەموو ڕۆژنامەنوس و پەیامنێرانە هیچ کارێك ئەنجام درابا ، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا، دەتوانرێت بگوترێت تەنانەت پێش ئەوەی تایەی فڕۆکەکە لەزەوی فەرەنسا ببڕێت، ڕەوت و باڵەکان دیاربوون هەریکەو بۆ خۆی خاوەن ڕەوت و گروپێك بوو ، دوبەرەکیەکانی نێوانیان لەسەر دوو بابەتی چەور بوون، لیستی سەروەت و سامانەکانی نوفل لوشاتۆ، هەروەها دابەشکردنی پۆستە باڵأکانی ئێرانی ئایندە ، هەموو ئەوانەی من دەمناسین، بەجۆرێك لالوت بوون لەیەکتری و هەمیشە لە کەمیندا بوون بەرامبەریەك.

پلان گێڕیەکان هەر لەسەرەتایی هاتنەناو فڕۆکەخانەی مهرئاباد دەستی پێکرد ، قطب زادە ، بنی صدر ،  غضنفر پور، دکتۆر ئیبراهیم یەزدی و حەسەن ئیبراهیم حبیبیی لە سەرۆکەکانی پیلان گێڕەکان بوون ، چونکە لەماوەی چەند مانگی ڕابردوو، وەها خویان گرتبوو، لە چوارچێوەی نوفل

لوشاتۆی پاریس، هەرچیەکیان بویستایە بەبێ ڕا و بۆچوونی یەکتری ئەنجامیان دەدا ، لەبەرئەوە تەهرانیشیان وەها چواندبوو .

چەند ڕۆژی سەرەتا، دەبوایە جێگە پێ ی خۆیان لە تەهران قایم بکردایە، بەڵام وا دیاربوو ئەوەی کردبویان بە بایان دا ، ئەمەش گەورەترین هەل بوو بۆ باڵی مێزەر بەسەرەکان، کە ئایەتولاّ بەهەشتی سەری داوەکەیانی بەدەستەوە بوو، بۆ جیاکردنەوەی خومەینی لە هاوڕێ پاریسیەکانی .

وەها خومەینیان لە هاوەڵە پاریسەکانی جیاکردەوە، کە ئیتر دیداری ئەوان لەگەڵ خومەینی دەبوو بە تکا و پاڕانەوە یان بە پێداگیری خانم دوریان مەککرەی بە ئەنجام بگەیشتایە.

لەناو ئەو چەند کەسەدا بەڕای من قطب زادە لە هەموویان زیر تر و بیرتیژ تر بوو. خاوەن مێشکێکی تەواو بوو بۆ پلان داڕشتن، هەندێ تایبەتمەندی و ئاکاری هەبوو ئەوانی تر نەیان بوو .

خویشی دەیگووت : ئەوان زیاتر و زۆرتر لەمن خوێندویانە ، بەڵام هیچ شتێك نازانن، لەبارەی بنی صدرەوە دەیگووت : ئەم پیاوە حەزی لە خۆدەرخستن و خۆ نواندنە ، چونکە کەم عەقڵە دەیەوێت وەك کەسێکی خوێندەوار بناسرێت، بە ئاواتی ئەوەوەیە بۆ تەنها ڕۆژێکی بێت لە زانکۆ وانە بڵێتەوە.

کە باس هاتەسەر دکتۆر یەزدی دەیگووت : مانگا لە چاویدا سوقراتە ، بچوکترین ئامادەباشی تێدانیە، هەرچی ئەمریکیەکان بیڵێن، وەك سەربازێك ئەنجامی دەدات ، بەڵام لەبارەی حەبیبی یەوە بۆچونی جیاوازبوو دەیگووت

: ئاقڵ و زیرەکە، ئاگری بن کایە و کونسێرڤاتیڤە. بە گووتەی خۆی ئەوانی تری بە مرۆڤ دانەدەنا، هەر ئەو قطب زادەیەی گووتم لەهەموویان ژیرتر بوو، دەیزانی دەبێ چیبکات، هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتینەوە تەهران، لەدوای مەراسیمی بەهەشتی زەهرا لە جێگای مانەوەی خومەینی بانگی کردم و گووتی : ئامادەبە هەتا لەگەڵ پارتیزانەکانت بچیتە دیداری خومەینی .

گووتم : هەواڵ چی یە ؟

گووتی : هیچ هەواڵێك نییە، ئیمام دەیەوێت سوپاستان بکات، وادیارە دەیەوێت سمێڵیشتان چەور بکات .

هەرواش بوو، خومەینی زۆر وەصف و پێدا هەڵدانی گووت، لەبارەی پارتیزانەکانم و شەخسی خۆم. لەدوایشدا گووتی: دەزانم لەو دوومانگەدا، لە ج دۆخێکی ناهەمواردا بوون. بیستومە چەند ساڵە لە خزم و کەسەکانتان دوورن، لەبەرئەوە ئێستا هەمووومان بەسەلامەتی لێرەین، ئیتر مەترسیمان لەسەر نییە و ئێرەش فەرمبالغە سەردانکەرمان هەیە وە چی و چی .... . لەگەڵ دکتۆر یەزدی هاوڕام پێج ڕۆژ مۆڵەت وەرگرن و بڕۆنەوە. ئەڵبەتە دەبێت ڕۆژی هەژدەی مانگ لێرەبن، چونکە کارەکان تازە خەریکە دەست پێدەکەن، ئەڵبەتە بەڕێز جەعفەر، پێنج ڕۆژ بۆ تۆ زۆرە، ئەگەر پانزەی مانگ لێرە بیت خراپ نییە.

لە زوورەکە هاتمە دەرەوە، بەڕێزێك بەناوی دەستماڵچی، یەکێك بوو لە کاسبکارانی تەهران بیستم لەم دوایانەدا خومەینی گوللە بارانی کردووە ، لە بەرامبەر قطب زادە و دکتۆر یەزدی یەك ملیۆن تومانی پێدام، هەتا لەناو پارتیزانەکانمدا بەشی بکەم. لەکاتی ماڵئاوایی بە قطب زادەم گووت : نازانم

، بەلاّم واهەست دەكەم كەسانێك هەن نایانەوێت ئێمە لێرەبین، خودا دەزانێت ئەم چەند ڕۆژە چی ڕوودەدات .

قطب زادە پێكەنی و گووتی : ئێستا هەواڵێك نییە، خومەینی خۆیەتی و ئەم چەند ئاخوندە سپێونانە، باشترە پشوویەك بدەیت، هەتا تایمی دووەمی یاریەكە دەست پێدەكات، تۆش بە خەیاڵێكی ئاسودەوە بڕۆ و بزانە ئەو ناپیاوانە پارەكانتیان حەپەلوش نەكردووە، بەیانی ڕۆژی پانزەیەم لێرە ئامادەبە.

كاژێر ٢ ی نیوەشەوی ڕۆژی پێنج شەممە بوو ، لەڕاستیدا چوبوینە ناو ڕۆژی هەینییەوە، بە مارسیدرس بنزێكی ئاخر مۆدێل كە هەمان دەستماڵچی بۆی دابینكردبووم، بەرەو ئەسفەهان بەڕێكەوتم. لەكاتێكدا دڵ تەنگ بووم بەوەی نەكا ئەم مۆڵەت پێدان و دووركەوتنەوەیە جۆرێك بێت لە پلان و دەسیسە ، بەلاّم لەلای خۆمەوە حسابم كرد، هەینی دەستی پێكردووە و منیش بەگووتەی خومەینی دەبێت پانزەهەم واتە یەك شەممە لە تەهران بم، هەینی پشووە و ئەمێنێتەوە ڕۆژی شەممە لەماوە یەك ڕۆژدا كەس ناتوانێت هیچ كارێك ئەنجام بدات. بەم دڵخۆشیەوە كاژێر ٨ ی بەیانی گەیشتمە قەدریجان .

بار و گوزەرانی دایك و باوكم هەروەها داود و خوشكەكەم لە قەدریجان نمونەیی بوو. دوكانی قەصابیەكەش گەورەتر و مۆدێرن تر بووبوو، ئێستا خاوەنی چەند بەفرگر و ڤاترینێكین، هەم دەرامەتی دوكانەكە بەرزبووبوویەوە، هەم ئەو مانگی دە هەزار تومانیە شێوازی ژیانی ئەوانی گۆڕیبوو. دایكم بەردەوام بەساقەو بە قوربانم دەبوو ، بەلاّم ڕەفتاری باوكم

زۆر گەرم و دۆستانە نەبوو. لە کۆتایدا دانی بە خۆدانەگرتوو کاتێك شەو تەنها کەوتینەوە، دەرگای سەرزەنشتی کردووە و گووتی : نازانم لەم ماوەیەدا خەریکی چی بوویت، لەکوێ بوویت و چ کارێکت کردووە ، بەڵام دڵنیام ڕێگایەکی شەرمەمەندانەت هەڵنەبژاردووە . ئەمە قسەی ئەو پیرە پیاوە بوو.

دەیگووت : باش دەزانم، لەم دەور و زەمانەیەدا، ئەم پارە بەلاش و موفتانە هەروا بەکەس نادرێت. ترسم لەوەیە چوبیتە ناو باندی قاچاخی و ئەم جۆرە کارانەوە .

قسەکانی پیرەپیاو هەمووی ڕاست بوون، بۆ یەکەمین جار و کۆتا جار، لەنێوان هەموو ئەوکەسانەی هەتا ئێستا دەیانناسم و دەمناسین، ئەو تەنها کەسێك بوو پارە فریوی نەدەدا، نازانم لەبەر ئەوە بوو کە من کوڕی بووم، وا فریوی پارەی نەدەخوارد ، تاقەتی وەڵام دانەوە و دەمە قاڵێم نەبوو لەگەڵ باوکم. نوستم و سبەی بەیانیەکەی لەگەڵ داود قسەمکرد و بەڵکو بتوانم بچم بۆ زیندان، بۆ دیداری سەید مەهدی هاشمی، هەتا دەرگای سەرەکی زیندانیش ڕۆشتم، دواد داوای سەردانیکردنی کرد بەبێ ئەوەی ناوی من بهێنێت، بەڵام بەڕێوەبەری زیندانەکە ڕائدێك بوو بەناوی (فەدەوی) نەچووە ژێر بار ، بەم جۆرە بەسەر کزی و بێ هیوای گەڕامەوە و سەرێکم لە بانك دا ، بەڵام بەهۆی مانگرتنەوە داخرابوو .

داود گووتی لەبارەی پارەکانەوە خەیاڵت ئاسودەبێت، نزیکەی دوو ملیۆن و چوار سەد هەزار تومان لە ئەژمارە بانکیەکەتدایە، دوبارە گەڕامەوە بۆ قەدریجان، پەنجا هەزار تومانم دا بە دایکم ، بیست هەزار تومانم دا بە داود

و خوشکەکەم. پێش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژی شەممە، بەرەو تەهران کەوتمە ڕێ ، هەستم کرد کە ئیتر قەدریجان جێگەی ژیان نییە بۆ من، نزیکەی کاژێر ٦ ی ئیوارە گەیشتمە قوتابخانەی ڕەفاه ، قطب زادە بەپەلە منی کێشایە کەنار و گووتی، پاڵەوان تۆ لەسەر حەق بویت باش بوو زوو گەڕایتەوە، ئەگەر ئەتوانی ئەوانی تریش ئاگادار کەرەوە، چاوەڕێ ی ڕۆژی هەژدەیەم ئەبن زوو بگەڕێنەوە، شۆڕش لەگەڵ ئەم دایك قەحبانە بەبێ ئێمە و کوڕەکانی لیبیا هیچ خۆشیەکی نیە خۆشت باش چاو گوێت بکەرەوە بزانە من چی دەڵێم .

یەکەم : بەهیچ جۆرێك لەمن دور ناکەویتەوە .

دووەم، ئەم شێخ صادق خالخالیە، گروپێکی فیدایی بۆ خومەینی دروستکردوە، وەك ئاوخواردنەوە مرۆڤ سەر دەبرن، لە کۆڵ کردنەوەی تۆش بۆ ئەم مەبەستە بوو ، ئەڵبەتە منیش فریوم خوارد، تۆ لەسەر حەق بوویت، ئێستا تۆ هەیت دەبێت باڵادەستی خۆت نیشان بدەیت، بەسەر ئەم گروپە منداڵەی ئاخوندەکان.

سێیەم، دەمتوانی چاپچی بکەمە هەمەکارەی ئێرە، پێم گووت وەك فەرماندەیەك لەگەڵت ڕەفتار بکات ، لەبەر ئەوە بیر و هۆشت کۆبکەرەوە و تێکی مەدە.

چوارەم : کاژێر ١٠ ی شەو هەر لێرەبە، بڕیارە بچین بۆ جێگایەك قسەکانی ترمان لەوێ بکەین.

کاژێر ١٠ ی شەو قطب زادە هات، گووتی بڕۆین ، پێش ئەوەی قوتابخانەی ڕەفا جێبهێڵین گووتی : ناخوندەکان هەوڵدەدەن کەنارگیرمان بکەن و ڕۆڵەکە لەئێمە وەرگرنەوە، منیش خەریکم یارییان لەگەڵ دەکەم ، بەلاٌم لەبیرت بێ، زۆرێك لەو کەسانەی ئێمە لێرە دەیانبینین، لەگەڵ ئەوانەی بەهاوڕێیەتی خومەینی لە دەرەوە هاتنەوە بەجۆرێکی تر سەیر دەکرێن ، دەبێت ئێمەش بەدەستی داخراو یاری بکەین، بۆ نمونە؛ من بەهیچ شێوەیەك حەزناکەم تۆ وەك شۆفێر لە پشتی سوکانەوە دابنیشیت، تۆ فەرماندەی پارتیزانەکانی ، لێرەدا دەبێت، وەك فەرماندەیەکی بەهێز و زۆر گرنگ ڕۆڵ بگێڕیت، هەتا ئەوانی تر بچوك بێنە پێش چاو ئەسڵەن خۆت بەکەم مەزانە.

کاتێك ئۆتۆمبێلێك هات، من و قطب زادە ببات دەرگاکانیان بۆ کردیتەوە هەردوکمان لە کوشنی دواوە وە دانێشتین، شۆفێرەکەش مامۆستایەکی زانکۆ بوو بەناوی دکتۆر (پەرویزی ساداتی) بەرەوە زەعفەرانیە بەڕێکەوت، ئیتر تێگەیشتم مەبەستی قطب زادە لەو کارانەی دەبێت ئەنجامی بدەم چییە

کوڕە قصابێکی قەدریجانی، فەرماندەی پاسەوان و پارتیزانەکانی خومەینی، لە کوشنی داوەوە دابنیشێت و دەبێت دکتۆرێکی زانکۆ شۆفێری بۆ بکات، وابیر بکاتەوە خەریکە یارمەتی شۆڕش دەدات مەبەستی قطب زادە ئەمە بوو بەدەستی داخراوەوە یاریبکە .

کاژێرێك دواتر، لە زەعفەرانیە چوینە ناو خانویەکی بەشکۆ، لە کۆلانی ئێران، هەریەك لە براکەی قطب زادە و ئەندازیار تەوەسلی کە دواتر بوو بە سەرۆك شارەوانی تەهران و عەباس زەمانی کە نازناوی ئەبو شەریف ی

بۆخۆی هەڵبژاردبوو، هەروەها محەمەد ڕەضا مەهدوی کێنی و براکەی لەگەڵ هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەندازیار چەمران و خاتونێکی عەبا بەسەر دەموو چاوی داپۆشی بوو لەوێ بوون ، هەرکە خانمە عەبا بەسەرەکە، بە لەهجە شیرینەکە پێی گووتم، جەعفەر یادی شەقامی فوش بەخێر ، زانیم خانم مەککرەی دوریانە و ناسیمەوە، لە ئامادەبوونی ئەو خۆشحاڵ بووم .

ئەوە شەوە دوریان قسەکەری کۆبونەوەکە بوو ، جگە لەو کاتانەی پرسیاری دەکرد، یان لێیان دەپرسی دەوەستا، ئیتر تەواوی کاتەکە سەرگەرمی قسەکردن بوو. دروستکردنی کۆمیتەکان و ژەهراوی کردنی ئاوی خواردنەوەی تەهران و دروستکردن و بڵاوکرنەوەی بارودۆخی ترس و تۆقاندن لەناو کۆمەڵگا ، گرنگترین ئەو بابەتانەبوون ئەو شەوە لەلایەن دوریان مەککرەییەوە خرانەڕوو .

ئەنجامدانی هەریەك لەو کارانە بە یەکێك سپێردرا ، دروستکردنی کۆمیتەکان، خرایە ئەستۆی مەهدوی کێنی و براکەی ، ئەرکی بەرنامە ڕێژی ژەهراوی کردنی سەرچاوە ئاویەکانی تەهران، بە ئەندازیار تەوەسلی بەهاوکاری زاواکەی مەهدی بازرگان کەسێك بوو بەناوی ئەندازیار حیجازی ئەڵبەتە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادەنەبوو سپێردرا، هەتا ئەگەر پێویستی کرد ئەنجامی بدەن ، دروستکردنی کەشی نائارامی و ترس و تۆقاندن و هەڵکوتانە سەر ماڵی هاوڵاتیان، بەتایبەتی سەربازان و ئەفسەرانی سوپا خرابویە ئەستۆی زەمانی واتە ئەبو شەریف .

کاژێر ٢ ی نیوەشەو، قطب زادە دەستی بەقسەکردن کرد و گووتی : ئێمە هەرا و هوریایەکی زۆرمان ناوەتەوە، گوایە خەرجیەکانی شۆڕش لەلایەن

کاسبکارانی و بازرگانەکانی تەهرانەوە دابین دەکرێت ، بەڵام ڕاستی یەکەی ئەمەیە، ئێمە بڕی شانزە ملیۆن دۆلارمان لە یەکێك لە وولاتە دۆستەکانی دەرەوە بە قەرز وەرگرتووە، ناچارین بەزووی بۆیان بگێڕینەوە، ئەگەرنا پێشنیاری دەرهێنانی نەوت دەخەنە بەردەممان، ئەمڕۆ لە خزمەتی ئیمامی سەربەرزدا بووم فەرموویان، بەڕێز مەهدوی کێنی یان هاشمی ڕفسەنجانی یان تەواوی بەڕێزەکانی تر، هەرچیّ زووترە و بەهەرشێوەیەك کە گونجاوە دەبێت ئەو بڕە پارەیە کۆبکەنەوە، هەتا نەچینە ژێر باری منەتی بێگانەوە ، لەبەرئەوە ئەرکی هەمووومانە زۆر زوو بۆ وێنە لەماوەی هەفتەیەکدا، بەهەرشێوەیەك بەگونجاوی دەزانن، ئەو بڕە کۆبکەینەوە .

هاشمی ڕەفسەنجانی گووتی : بەڕیکەوت ئیمام بەمنیشیان فەرمووە ، بەڵام ئێمە نازانین ئەو هەموو پارەیە بە چ ڕێگایەك دەتوانین بەدەست بهێنین.

قطب زادە گووتی : وابیردەکەمەوە بەڕێز ئەبو شەریف دەتوانێت کارێك بکات ، ئەڵبەتە ڕاستە شانزە ملیۆن دۆلار پارەیەکی کەم نییە ، بەڵام بەسوود وەرگرتن لەم ئالۆزی و پشێویانە، لەوانەیە بکرێت بە ڕۆشتن بۆ مۆزەخانەکان و هێنانە دەرەوەی هەندێ لە شت و مەکەکانی کێشەکە چارەسەر بکات ، ئەبو شەریف گووتی : بابەتی هێنانە دەرەوەی هەندێ لە کەل و پەلە شوێنەواری و مێژوویەکان لە مۆزەخانەکان، کارێکی هێندە ئاسان نیە کە بەڕێز قطب زادە بیری لێدەکەنەوە ، چونکە بە شێوەیەکی وورد و توند پارێزگاری لە مۆزەخانەکان دەکرێت، بەتایبەتی لەم چەند مانگەی دوایدا چاودێری و پاراستنەکان زۆر زیادی کردووە. تەنانەت باڵندەش ناتوانێت لەوێ نزیك ببێتەوە .

هاشمی ڕەفسەنجانی و مەهدوی کێنی هەیەکەو لەلای خۆیەوە پشتگیری قسەکانی ئەبو شەریفیان کرد. هەموویان باوەڕیان وابوو ئەم کارە ناتوانرێت بەئەنجام بگات. دەبێت بۆ پەیداکردنی شانزە ملیۆن دۆلار بیر لە ڕێگەیەکی تر بکرێتەوە .

دوریان مەگگرەی لە بێدەنگی و هێمنایەتی یەکی تەواو دابوو، وەستا هەتا هەموویان قسەکانیان تەواو کرد، لەو کاتەدا یەکێك لە تاك خاڵە سەرسوڕهێنەرەکانی خۆی گووت، کە مرۆڤ هەم لەزەتی لێ وەردەگرت و هەم توڕەش دەبوو کە بۆچی وەها شتێکی بەمێشکی خۆیدا نەهاتووە ، کاتێك هەمووان قسەکانیان تەواو بوو، دوریان بەدەنگی بەرز گووتی : هەتا ئەم ساتە من شاهید بووم، قطب زادە هەرئێستا بابەتی بڕین و دزیکردن لە مۆزەخانەکانی پێشنیار کرد، لەکاتێکدا ئێوە پێش وەخت زانیاری ووردتان لەبارەی پارێزگاری لە مۆزەخانەکان بەدەست هێناوە، دیارە پێشتر لێکۆڵینەوەی باشتان کردووە ، من دەمەوێت و پێداگرم لەسەری، هەتا بزانم ئەم بەڕێزانە ئەم هەموو زانیاریانەیان لەکوێ دەست کەوتووە و بۆ چ مەبەستێك بەدەستیان هێناوە ؟.

بەبیستنی ئەم قسانە، هەریەك لە هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف و مەهدوی کێنی ڕەنگیان بەڕووە وە نەما. هەرسێکیان هەوڵیان دەدا بەهەر شێوەیەك بێت، ئەو دەستە گوڵەی بە ئاویانداداوە پەردە پۆش بکەن ، بەڵام دووریان دەست بەردار نەدەبوو .

بە پرسیارە یەك لەدوای یەکەکانی، ئەو بەڕێزانەی زیاتر شەرمەزار دەکرد. لە کۆتایدا دوریان مەگگرەی بە توڕەییەوە هەڕەشەلێکردن گووتی، ئەگەر

ڕاستەوخۆ وەڵامێکی دڵنیاکەرەوەی پێ نەدەن ئەوا بابەتەکە لەگەڵ خومەینی دا باسدەکات، ئەمەش بە قازانجی ئەوان نابێت و لە هەموو کارەکان وەلادەنرێت .

ترساندنەکەی دوریان کاری خۆی کرد، ئەبو شەریف گووتی : ڕاستی یەکەی ئەوەیە لە دوای ڕووداوەکەی مەیدانی ژاڵە، ئێمە نەك لەبەر خاتری فرۆشتنی کەل و پەلەکانی ناو مۆزەخانە ، بەڵکو بۆ ئەوەی گورزێکی تر لە ڕژێمی شا بدەین، بەرنامە ڕێژیمانکرد لە کارێکی پارتیزانیدا، هەندێ لە کەل و پەلەکانی مۆزەخانە بگوازینەوە و شا و دارودەستەکەی تۆمەتبار بکەین، بە دزینی شوێنەوارە مێژوویەکان. زۆریش هەوڵماندا ، بەڵام نەکرا . دوریان دەستبەردار نەدەبوو گووتی : ئێوە بڵێن یەکەمجار چ کەسێك پێشنیاری وەها بابەتێکی کرد، چ کەسانێك و لە چ کاتێکدا، چونەناو ئەم کارەوە و هەتا کوێ چونە پێش؟ .

ئەمجارە نۆبەتی وەڵام دانەوەی هاشمی ڕەفسەنجانی بوو .

ڕەفسەنجانی گووتی : سەرەتای بیرۆکەکە هی یەکێك لە مامۆستاکانی زانکۆ بەناوی قائم مەقامی بوو وە پێویستمان بە نەخشەی مۆزەخانەکان بوو، توانیمان لە ڕێگای ناصر پاکدامەن ئەویش مامۆستای زانکۆیە، لەگەڵ هاوسەرەکەی هوما ناطق کچی ئەندازیار ناصح ناطق، ئەو نەخشانەمان دەستکەوێت

دوومانگ سەرگەرمی بەرنامە دارشتن بووین ، بەڵام لەکاتی جێبەجێ کردندا چوار کەس لە برادەران دەستگیرکران و هێشتا لە زینداندان ، ئێمەش ناچار بووین کارەکانمان بوەستێنین .

بە گومانی من دوریان ئەم شتانەی هەمووی دەزانی ، تەنها دەیویست دانپێدانانیان لێوەرگرێت و بە شێوەیەك لە شێوەكان قطب زادە زاڵ بكات بەسەریاندا، لەكاتێكدا بەپێ ئەزمونەكانی من، دەیتوانی زانیاری زیاتریان لێوەبگرێت ، بەلأم بابەتەكەی گۆڕی و گووتی: ئەم كارانەی ئێوە جێگای دەستخۆشیە ، بەلأم وادیارە كارەكەتان بەباشی هەڵنەسەنگاندەوە، بەهەرحاڵ ئەوەی ڕۆشت ڕۆشت، دەبێت لەبیرتان بێت ئەو كاتە ساواكێكی بەهێز بوونی هەبوو ، بەلأم ئێستا توانیمان بە ئاسانی لەكاریان بخەین. ئێستا دۆخەكە جۆرێكی ترە ، گومان ناكەم هیچ یەكێك لە كابەدەستەكانی دەوڵەت هێزی بەرەنگار بوونەوەی ئەم جۆرە كارانەیان هەبێت.

بەڕای من دەبێت پێشنیارەكەی قطب زادە جێبەجێ بكرێت، بەتایبەتی كاتێك یەكێك لە باشترین و بەهێزترین فەرماندەكانی پارتیزانی ئەو شانازیەی پێ بەخشیوین كە هاوكاریمان بكات. لەبەرئەوە ئەم بابەتە بۆ ئیمام باسكراوە كە بەڕێز شەفیعزادە فەرماندەی ئۆپراسیۆنەكە دەكات، دڵنیاشم سەركەوتوو دەبێت. ئێوەش دەبێت هەرچیەك ئەو دەیەوێت و لەبەردەستاندایە بۆی دابین بكەن .

ڕاستت دەوێت لەو كاتەدا وەها سەرم سوڕمابوو، هیچ كارێك و پەرچە كردارێكم لەدەست نەدەهات، جگە لە بێدەنگی، قطب زادە تەنانەت نەیگووتبوو بۆ كوێ دەچین و بابەتەكە چی یە، لەبەر ئەوە بە مەیلی خۆم و بەبێ بەرنامە لە ئەسفەهانەوە گەڕابوومەوە. ئێستا كراومەتە فەرماندەی ئۆپراسیۆن بۆ دانبەسەر مۆزەخانەكان و بردنی شتومەكەكانی ناوی، كەمێك خۆم بەئاگاهێنایەوە و بەو كەمە هۆش و ژیریەی لە

مەکگرەی دوریانەوە بەدەستم هێنابوو، لێوەی فێربووم کە نابێت بەبێ بوار بدەم لە ڕووبار، بە دڵنیاییەوە لەپشت ئەم دانیشتنە و قسەکانی ئەو، نەخشە و پلانێکی تر لەئارادایە ، بێدەنگی و بێباکی من، دوریان گووتەنی بەهێزی منی لەناو مێشکی ئەواندا دەچەسپاند .

قسەکردن لەبارەی بەشەکانی تری کاری ئۆپراسیۆنەکە لەگەڵ ئەواندا بێ ئاکام بوو ، چونکە کاتەکە گونجاو نەبوو، گەشتبووە کاژێر ٤ ی بەیانی و حکومەتی سەربازی باری نائاسایی ڕاگەیاندبوو

بڕیار بوو ئەوانی تر لەوێ بمێنینەوە، هەتا دونیا ڕوناك دەبێتەوە. جگە لە من و قطب زادە و دوریان مەکگرەی.

کاتێك دەهاتینە دەرەوە گوتم: لەگەڵ حکومەتی سەربازی چی بکەین ؟

دوریان لە ژێر عەباکەیەوە دەستی گرتم و گووتی : بیر لە حکومەتی سەربازی مەکەرەوە ئەوە جێبهێڵە بۆ من .

کاژێر نزیکەی چوار و سی خولەکی بەیانی لە خانووەکەی زەعفەرانیە هاتینە دەرەوە، بەفەرمانی دوریان مەکگرەی لەپشتی سوکانەوە دانیشتم و خۆیشی لەتەنیشتم دانیشت و عەباکەی لابرد و قژی بڵاوکردوە. قطب زادە و شۆفێرەکەی پێشوو کەگوتم مامۆستای زانکۆ بوو چوونە دواوە ، هێشتا بە تەواوی نەچوبوینە ناو شەقامی پەهلەوی، گرووپێك سەرباز فەرمانیان پێکردین بوەستین ، دوریان دەستبەجێ گووتی : شێت بازی نەنوێنیت بوەستە. پلەدارێك بڵند گۆیەکی بەدەستەوە بوو گووتی : دەستەکانتان بخەنە پشت سەرتان و دابەزن .

دوریان گووتی : ئەوەی کە گووتی ئەنجامی دەدەین ، هەموومان دابەزین. لەوکاتەدا سەربازێك لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو، لولەی تفەنگەکەی ئاراستەی ئێمە کردبوو ، پلەدارێکی تر هاتەپێشەوە و بەمنی گووت، ناسنامەکەت پێش ئەوەی من هیچ بلێم، دوریان کارتی مۆڵەتی تێپەڕبوونی شەوانەی نیشانی پلەدارەکە دا، ئەویش سەیرێکی کارتەکەی کرد و پرسی ئەم بەڕێزانە لەگەڵ ئێوەدان ، دوریان گووتی : بەڵێ .

ڕێزی سەربازی نواند و مۆڵەتی تێپەڕبوونی پێداین. ئەو سەربازەش نیشانەی لێگرتبووین هەستایە سەرپێ و ئێمەش درێژەمان بەڕێگاکەماندا .

دووبارە لە دونیای مات و واق وڕماوی خۆمدا نغرۆبووم، کە ئەم ژنە ئەم دوریانە کێیە ؟ ! لە پاریس هەتا ناو جەرگەی تەهران، لە دادگای پاریس هەتا ناو سوپای تەهران، لە هەموو جێگایەك نفوزی هەیە و فەرمان بەهەمووان دەکات.

بەو سانایە هێل و نیشان بۆ ئاخوندەکانی خومەینی دادەنێت . ئەم خاڵی پشکنینانە دوو جاری تر دوبارە بونەوە و بەهەمان شێوەی پێشوو کۆتایی پێدەهات. بەڕێنمایی دوریان چووینە ناو شەقامی دەوڵەت لە قولهەك لە کۆلانێکدا بەناوی داراب

لەبەرامبەر خانوەیەکی جوان و ڕازاوە وەستاین، قطب زادە و دوریان نزیکەی بیست بۆ بیست و پێنج خولە لەنێوان خۆیاندا بەزمانی ئینگلیزی دوان. دواتر دوریان پێ ی گووتم لەگەڵی دابەزم ، قطب زادە گووتی : پێنج بۆ شەش خولەك زیاتری نەماوە بۆ کاژێر ٦ ئیتر مەترسیەك نیە لە حوکمی

سەربازی . هەروەها گووتی؛ شەو لەگەڵ دوریان دەیبینینەوە. هێشتا ئێمە نەچوو بووینە ناو خانووەکەوە ئۆتۆمبێلەکەی قطب زادە کەوتەڕێ و ڕۆشت

دوریان دەرگاکەی کردوە و چوینەناو حەوشەیەکی گەورە، مەلەوانگەشی تێدابوو. دواتر چوینە ژوورەوە و دوریان جانتا و پێڵاوەکانی هەریەك بەلایەکدا فڕێدا و ئاماژەی بە قەنەفەکە کرد هەتا لەوێ دابنیشم ، خۆیشی بەرەوە تەلەفۆنەکە ڕۆشت. بێ زیادەڕۆی زیاتر لە کاژێر و نیوێك، لەگەڵ چەند کەسێکی جیاواز هەمووی بەزمانی ئینگلیزی قسەی کرد.

کاژێر حەوت و سی خولەك تەلەفۆنەکەی دانا و لەگەڵ گاڵتە و گەپ و خەندە و گێڕانەوەی یادەوەریەکانی پاریس و نوفل لوشاتۆ منی بردە چێشتخانەکە، ئەمجارە وەك خانمێکی خانەدان سەرگەرمی ئامادەکردنی نانی بەیانی بوو ، پێکەوە نانمان خوارد، لەو کاتەدا ئەم ژنە ماندوو نەناس و ئاڵۆزە ساتێك لە پێکەنین و خەندە نەدەوەستا ، لەدوای کۆکردنەوەی قاپ و شتومەکەکانی گووتی؛ هەردوکمان ماندووین، دەتوانین هەتا کاژێر ٢ ی پاش نیوەڕۆ بخەوین، دەستی منی ڕاکێشا و بەرەوە حەمامەکە پاڵی پێوەنام، گووتی : حەمام کردنێکی بەیانیان نیوەی ماندوبونەکەت دەڕەوێنێتەوە .

دوش و ئاوی گەرم لەو بەیانیە زستانیەدا، بۆ ڕاماڵین و بێ خەویەکەم بەڕاستی معجیزەی خولقاند ، کاتێك لە حەمام هاتمە دەرەوە، دوریان بەدەنگی بەرز هاواری کرد بێمە قاتی سەرەوە. بە پلەکانە فەرش ڕێژەکەدا چوومە نهۆمی دووەم، تەنها زورێك دەرگاکەی کرابوویەوە ، دوریانم بەڕووتی بینی هیچی لەبەردا نەبوو، لە حەمام هاتبووە دەرەوە و کرێمی لەلەشی دەدا. ویستم بگەڕێمەوە بانگی کردم ، بۆچی هێندە شەرمن و کەم

ڕویت، هیشتا نازانیت ئەگەر من وەك ئێوە پیاوەکان نەبوومایە نەمدەتوانی لەو هەموو ڕووداوانەدا لەگەڵتاندا هەڵبکەم .

گووتم : بۆچی ؟ بەلآم منیش شەرم و حەیای لادێ ی خۆمم هەیە .

دوریان پێکەنی و گووتی : ئەی بۆچی لەگەڵ پاتریسیا ئەم شەرم و حەیا لادێ یەت نەبوو.     گووتم : وادیارە دەبێت ئێستا فیلمی خۆم و پاتریسیا تەماشابکەم ، لەوکاتەدا زۆر بەتوندی پێکەنی و خاولیەکی تەڕی بۆ هاویشتم و سەرگەرمی لەبەر کردنی ڕۆبەکەی بوو، گووتی : نا تۆ کوڕێکی زۆر باشیت پاتریسیا بۆی باسکردم، چەندە تۆی خۆش دەوێت ، لەوانەیە ئەگەر پاتریسیا ئەم ڕازی دڵەی لەلام باسنەکردایە، ئەگەر کاتم هەبوایە منیش عاشقت دەبووم .

دەمزانی درۆ دەکات ، چونکە دوریان لەو ژنانە نەبوو کە بتوانێت قسەی ڕاست بکات. لەوانەشە لەبەر خاتری کارەکەی بوبێ، ژنێکی سەرەڕۆ بوو، تەنها حەزی بە شەڕوشۆڕ و دادوەری و ئاژاوە و بەلاّ دەکرد ، بەهەرحاڵ گووتی : لە ژوورەکەی تەنیشتی پشوو بدەم و هەتا کاژێر ٢ ی پاش نیوەڕۆ خەیاڵم ئاسودەبێت. دواتر سەرجێگاکەی لە خۆی ئالآند و منیش چومە ژوورەکەی تەنیشتی، ژوورێکی پاك و ڕازاوە بوو. تەواوی دیوارەکەی بە وێنەی سێکسی ڕووپۆشکرابوو. نەمدەزانی بەڕاستی ئەم خانووە هی دوریان خۆیەتی یان بەئەمانەت خستویانەتە خزمەتی .

کاژێر ١٢ ی نیوەڕۆ خەبەرم بویەوە. دوبارە دوریان سەرگەرمی پەیوەندی تەلەفۆنی بوو، سەرم کەمێك دەئێشا، دوای تەواو بوونی تەلەفۆنەکانی، دوریان پەرداخێك ویسکی بۆ هێنام، دواتر خەریکی پۆشینی جلەکانی بوو ،

ساتێك بیرم کردەوە، کە بەڕاستی ژنێکی جوانە، خۆیشی ئەمە دەزانێت ، لە کاتی گفتوگۆ و تەنانەت لە کۆبونەوەکاندا لەگەڵ ئەوانی تر وەك ( سەید ئەحمەد خومەینی ، قطب زادە ، بنی صدر ، کۆلۆنێل تامسۆن ی ئەمریکی یان میستەر ساندەرزی بریتانی ) زیاتر لە فەرماندەیەکی سەربازی دەچوو، وەك لە ژنێکی قەشەنگ و شۆخ و شەنگ. کاتێك لەگەڵ خومەینی دەبوو، ژنانە و بێدەنگ و هێمن ڕەفتاری دەکرد، وەك ئەوە وابوو یەکێك بێت لە مریدە پاك و بێ ڕیاکانی ئیمام ، لە یانەی ڕاسپۆتین ی پاریس، وەك ژنێکی ناو باڕ ڕەفتاری دەکرد ، بە ئاسانی بەڕووت و بێ بەرگی لە بەرامبەرم دەوەستا ، بەڵام کاتێك عەبا ڕەشەکەی دەدا بەسەریدا، لە حاجی خانمێکی شەست حەفتا ساڵە دەچوو، کە چەندە باش شارەزای ئاداب و ڕسومە .

ئەمانە بۆیە باس دەکەم ، چونکە لەو یادەوەریانەی کە ماومە، زیاتر لەگەڵ ئەودا سەروکارم دەبێت. بۆیە پێم خۆشە زیاتر لە تایبەتمەندیەکانی ئەم ژنە شارەزابن ، بەهەحاڵ ئەو ڕۆژە لەدوای ئەوەی وەك هەمیشە ماکیاژێکی گونجاوی کردبوو، پێکەوە نانی نیوەڕۆمان خوارد.

لەناکاو زۆر جدی بوویەوە و گووتی : سەیرکە جەعفەر، نزیکەی دوو مانگ لە ئاشنایەتی من و تۆ تێپەڕدەبێت ، بەڵام من زۆر زووتر لەمانە تۆم ناسیوە، تۆ لە پاریس منت ناسی، من لە دیمەشق بە شێوازی کاری تۆ ئاشنا بووم، تۆ پاتیزانێکی ڕاستەقینەیت. دەتوانیت ببیت بە پاڵەوانێك ، بەڵام ناچارم کەموکوڕی و عەیبەکانیشت بخەمە ڕوو وە پێشت دەڵێم بۆ داپۆشینی ئەم عەیبانەت دەبێ چی بکەیت . ئەویش ئەمەیە، کە پێت دەڵێم دەبێت زۆر ئاگاداری خۆت بیت، تۆ بەجەرگیت، زیرەکیت دەتوانیت بەخێرایی کاربکەیت ، بەڵام عەیبێکی گەورەت هەیە، ئەویش ئەوەیە نە

بڕوانامەیەکی بەرزت هەیە. نە خوێندەوارییەکی گونجاو، ئەمە لە هەموو جێگایەك بەزیان دەشکێتەوە لەسەرت ، هۆشت بکەرەوە تەنانەت ئەگەر بڕوانامەی دیپلۆمت هەبوایە، یان خوێندەوار بویتایە بەڕای من بۆ زۆرێك لە کارەکان گونجاو تر دەبویت لەو کەسانەی دەوروبەری ئەو پیرەپیاوەیان گرتووە ، بەلآم ئەوەی کەهەیە هەیە، ناتوانین کارێك ئەنجام بدەین، لەبەر ئەوە ئەم خاڵە لاوازیەت، کە نەخوێندەواریە، دەبێت بەکارەکانی ترت لەناوی ببەیت. بۆ نمونە؛ ئەو بابەتی دزینی کەل و پەلی شوێنەواریانەی لە مۆزەخانەی ئێرانی دێرین و مۆزەخانەی کوشکی گوڵستانن، دەتوانێت ڕاستەوخۆ چارەنوسی تۆ بگۆڕێت، ئێمە هەوڵدەدەین هەموو کارەکان بەناوی تۆ وە ئەنجام بدرێت، تۆ لەبەرچاوی خومەینی وەك پلان داڕێژەر و جێبەجێکاری ئەم ئۆپراسیۆنەوە بناسرێت ، کاتێك خومەینی تواناکانی تۆی پەسەند کرد، ئیتر دوژمنەکانت ناتوانن هیچ هەڵەیەك بەرامبەرت ئەنجام بدەن .

هەرکە دوریان لە قسەکانی بوویەوە، گووتم : قسەکانت هێندە ئاڵۆز و خێرابوون، ڕاستت دەوێت لە نیوەیان تێنەگەیشتم ، بەلآم ئەوبابەتی دوژمنانەم کەمێك نیگەرانی کردووم، من هێشتا کارێکم ئەنجام نەداوە و بابەتێکی وەها نەهاتووەتە پێش هەتا ڕەقیب و دوژمنێکم هەبێت .

دوریان گووتی : هەڵەی تۆ لێرەدایە، تۆ هێشتا لە دونیایی داخراوی خۆتدا ماویتەوە، لەکاتێکدا ئەوانی تر حسابێکی ترت بۆ دەکەن. زۆرێك لەو منالّ و پالآنەی چوونەتە دیمەشق بۆ بینینی خولی پارتیزانی، لە زمانی هاوڕێ سوریەکانت چیرۆکی ئازایەتی و لێوەشاوەیی تۆیان گوێ لێبووە، هەموویان ڕووداوی گوللەبارانکردنی ئەفسەرە سوریەکانیان بیستووە، لەبەر ئەمەیە لە

دونیای پارتیزانیدا تۆ وەك دێومزمەیەك وایت بۆیان ، ئەم پیاوە شێتەی ناوی خۆی ناوە ئەبو شەریف یەکێك بوو لە دەبەنگترین کەسەکانی دیمەشق، ئێستاش بووە بە مەترسیدارترین دوژمنەکانی حەزمتی ئیمام. بەخراپی نازانێت بۆ دەسپێکی کارەکەی، بە چەقۆی چێشتخانەش بێت سەری تۆ ببڕێت ، لەبەرئەوە، دەبێت زۆر ئاگات لەخۆت بێت. متمانە بەکەس مەکە، کەمترین قسەبکە و زۆرترین کار ئەنجام بدە. تۆ دەبێت لەبەر دەستی صادقدابیت، ئەم کوڕە گوێ ی لە قسەکانی ئێمەی نەگرت و ئێستا بەتەنیا ماوەتەوە بەتەنها تۆی هەیە . زۆربەی کارەکان ڕێکخراوە، لە بیرت بێت نیشانەی سەرکەوتن و دەرکەوتنی تۆ بەندە بەباش ئەنجامدانی ئۆپراسیۆنی هەردوو موزەخانەی ئێرانی دێرین و کۆشکی گوڵستان .

گووتم : سەیرکە خاتوو دوریان، ئێستا ئێوە من باش دەناسن، دەزانن من نۆکەر و بەردەستێکی باشم، ئەگەر پێم بڵێیت ئەوە بکوژە و ئەوە ببڕە، ئەوە بگرە، ئەم کارە بکە و ئەو کارە مەکە، باش و زۆر باشیش ئەنجامی دەدەم ، بەڵام لەوەی کە دابنیشم و خەریکی نەخشەدارشتن و پلانداناانیم ئا ئەوە لەدەستی من نایەت ، بۆ وێنە لەبارەی ئەم کاری مۆزەخانانەوە، من لە هەموو تەمەنمدا، بۆ یەکجاریش بێت، نە چوومەتە مۆزەخانە، ئیتر چۆن دەتوانم بڕۆمە ئەوێ و دزی بکەم ، لەو کاتەدا دوریان دای لە قاقای پێکەنین و گووتی : دیسان دەستت کرد بە شێت بازاڕیەکانت، وادیارە گوێت لە قسەکانی من نەبوو، پێمگووتی هەموو کارەکان من و هاوڕێکانم ئەنجامی دەدەین. دواتر هەمووی دەخەینە ئەستۆی تۆ، هەر ئەوەندە .

لەو کاتەدا زەنگی دەرگا لێیدا و دوریان بۆ کردنەوەی دەرگاکە چووە دەرێ، خولەکێك دواتر لەبەرامبەرم بە ناباوەڕی یەوە پێنج پیاوی مل پان و دوو

ژنم بینی، دوریان منی به ئەوان ناساند و هەرلەهەمان ژووری نانخواردن، هەمووممان لەدەوری مێزەکە کۆبوینەوە.  یەکێك لە ژنەکان ئێرانی بوو، بەناوی (سودابە)، لەتەنیشتم دانیشت و لەدوای کەمێك قسەی ڕەنگاوڕەنگ، گفتوگۆ بەزمانی ئینگلیزی لەنێوانیاندا دەستی پێکرد. لەکوێدا پێویستی بکردایە، سودابە یان دوریان ڕوونکردنەوەیان پێدەدام و بۆیان وەردەگێڕام. دوای نیو کاژێر لە قسەکردن، بۆم ڕوون بویەوە، کاری دزینی کەلوپەلە مێژوویەکان ئەم گروپە ئەمریکیە ئەنجامی دەدەن، نەك من و ئەبو شەریف و داروەدستەی ئاخوندەکان .

کۆبونەوەکە هەتا کاژێر ٦ ی دوای نیوەڕۆی خایاند. بڕیاردرا سبەی کاژێر ١٠ ی بەیانی دووبارە لەهەمان شوێن لەدەوری یەك کۆببینەوە ، ئەوان ڕۆشتن و دیسان من و دوریان بە تەنها ماینەوە لەوکاتەدا دوریان لە پێستی هەمیشەی خۆی دەهاتە دەرەوە، هەتا ببێت بە ئیسلامی پێی گووتم : لەبارەی ئەم پلان و دیدارانە، جگە لە خۆم و خۆت، تەنها یەك کەسی تر بۆهەیە ئاگادار بێت، ئەویش صادقی قطب زادەیە ، ئەو بەتایبەت پێداگری لەسەر دکتۆر ئیبراهیم یەزدی دەکرد، کە نابێت بەهیچ شێوەیەك تەنها ووشەیەکیش بزانێت ، دوای ئەم ئاگادارکردنەوە، دوریان تەلەفۆنی بۆ شوێنێك کرد و دواتر تەلەفۆنەکەی داخست و گووتی : دوای چەند خولەکێکی تر صادق دێت بۆ ئێرە.

گووتم : خانمی دوریان ئەتوان تەنها یەك پرسیار بکەم؟

گووتی : بلێ ، گووتم : ئایا خومەینی ئاگاداری ئەویە کە ئێمە دەمانەوێت، بە چ شێوە و ڕێگایەك ئەو شانزە ملیۆن دۆلارە دەستبخەین .

دووباره دوریان دای لەقاقای پێکەنین و گووتی : پێت دەڵێم، ئەگەر بەکەس نەڵێت ، ئەسڵەن بیرۆکەی سەرەتایی ئەم پلانە، لە کەللەی ئیمامەوە دەرچوو، ئەڵبەتە نەك بەم شێوەیە. ئەم ئیمامە لەو ئیمامانە نەییە کە هەتبووە، ئیمامی ڕاستەقینەیە دواتر دەستی بە پێکەنین کردووە .

دونیایەك کەهێشتا دوو ساڵ بەسەریدا تێنەپەڕیبوو، کە کەتبوومە ناویەوە بەڕاستی دونیایەکی سەرسوڕهێنەر و غافلگیر بوو بۆم ، بەڵام زیاتر لەوە سەرم سوڕمابوو، کەچۆن پیاوێکی وەك خومەینی، خاوەنی نازناوی ئایەتوڵا و کەسایەتیەکی ناودار، پێشنیازی بۆ وەها دزیەك کردبێت ، بەڕاستی ئەو ڕۆژانە بۆم باوەڕنەکراوبوو ، لەبەر ئەوەی دوریان ئەمەی گوتبوو، قسەکانیم زۆر بە ڕاست وەرنەگرت. دواتر قطب زادە گەیشت و ئیتر دەرفەتی قسەی زیاترم نەما .

هەرسێکمان لە ماڵ هاتینە دەرەوە. ئەمجارە من لەپشت سوکانەوە دانیشتم و قطب زادەش هاتە تەنیشتم، خانم دوریان زۆر بەتوندی خۆی بەعەبا ڕەشەکەیەوە پێچابویەوە، لە دواوە جێگای خۆی گەرمکرد ، قطب زادە پێی گوتم شوێنی مەبەست قوتابخانەی ڕەفاهە، دواتر مەیدانی بەهارستانە ، هەرکە گەیشتینە مەیدانی بەهارستان گووتی : لە شەقامی شا ئاباد بچۆرە کۆڵانی ظهیر الاسلام لەناوەڕاستی شەقامەکەدا فەرمانی پێکردم، بوەستم ، ئۆتۆمبێلێکی BMW ی سەوز لە پشتمانەوە وەستا، هەر لەگەڵ ئەوەی قطب زادە دابەزی، ڕاستەوخۆ دوریانیش بەدوایدا دابەزی و دەرگای پێشەوەی کردەوە و لەتەنیشتم دانیشت، ویستم ئۆتۆمبێلەکە بکوژێنمەوە، دوریان گووتی : مەیکوژێنەوە، هەرکە ئیمام و دکتۆر یەزدی و صادق

سوراربوون، بە خێرایی بەڕێ بکەوە ، بەلام بەجۆرێك BMW ەوکە بتوانێت بەدواماندا بێت، جێگای مەبەستیش هەمان خانووی کۆلانی ئێران لە شەقامی زەعفەرانیەیە .

ئەم وەستانە پڕ لە نیگەرانی و دلەڕوکێیە، نزیکەی بیست خولەکی خایاند، تا لە ئاکامدا سەرەتا دکتۆر یەزدی و دواتر خومەینی و قطب زادە، لە تاریکی شەودا خۆیانکرد بەناو ئۆتۆمبێلەکەدا هێشتا قطب زادە دەرگاکەی بەتەواوی دانەخستبوو، بە ئاماژەی باسکی دوریان، بەرەو زەعفەرانیە دەستم بە جولە کرد ، تەواوی ڕێگاکە خومەینی و دوریان پێکەوە قسەیان دەکرد، لەبارەی حکومەتەکەی بەختیار و ئەو پەیوەندیە تەلەفۆنیانەی لەگەلی هەیەتی. هەروەها دەربارەی مانەوە و نەخۆشی شا لەدەرەوەی وولات هەوال و زانیاری بە خومەینی دەدا .

کاژێر ٨ ی شەو لە زەعفەرانیەوە چوینە ناو کۆلانی ئێران، بۆ هەمان خانوو، براکەی قطب زادە دەرگاکەی لێکردینەوە، جگەلەو کەسی تر لەو مالەدا نەبوو ، بەلام چەند خولەکێك دواتر، کاتێك خومەینی لە نهۆمی دووەم لەسەر پالپشتێك دانیشتبوو، هەریەك لە مەهدی بازرگان و دکتۆر یەدولا سەحابی و ژەنەڕال مەدەنی لە هێزی دەریایی و سەید ئەحمەدی خومەینی خۆیان بەژووردا کرد. لە دەوری خومەینی ئەلقەیان بەست، میوانەکانی تر دروست پێنج خولەکی مابوو بۆ دەست پێکردنی قەدەغەی هاتوچۆ، واتە؛ کاژێر ٩:٥٥ خولەکی شەو ، (ولیام سالیڤان) بالوێزی ئەمریکا و دوو کەسی هاوڕێ ی یەکێکیان ئێرانی بوو، گەیشتن. لەگەل هاتنە ژوورەوەیان ئەوانی تر خۆیان کۆکردەوە، هەتا تازە گەیشتوەکان

جێگای دانیشتنیان هەبێت ، دواتر چایم بۆ بردن، قطب زادە ئاماژەیەکی کرد لەگەڵ براکەی بچینە دەرەوە .

کاتێك هاتینە دەرەوە، قطب زادە گووتی : هەتا بانگ نەکرێن نەیەنە ژوورەوە، لە دوای ئەو قسەیە ئیتر کەس مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی نەبوو .

من و براکەی قطب زادە لە هۆڵەکەدا دانیشتین، لەناکاو زەنگی دەرگا لێدرا، هەردوکمان شێواو و دەستەپاچە بووین، نەماندەزانی چی بکەین، براکەی قطب زادە گووتی : هەموو شتێك تەواوە و هەمووان ئامادەن، هەرکەسێك بێت نیازی وایە بێزارمان بکات. من ترسم لەوە هەبوو نەکا سەربازانی حوکمی سەربازی بن، بەرامبەرەکەشمان دەستبەردار نەدەبوو، بەردەوام زەنگی لێدەدا. دوو بۆ سێ خولەك دواتر قطب زادە هاتە دەرەوە و گووتی : ئەوە چی یە ؟ براکەی گووتی : زەنگ لێدەدەن نازنین چی بکەین، بیکەینەوە ، نەیکەینەوە ؟! ، قطب زادە تورە دەهاتە پێش چاو گووتی : ئاوڕی لێمەدەنەوە، بهێڵن ئەوەندە زەنگ لێبدات هەتا گیا لەبن پێیدا سەوز دەبێت ، گووتم : مەگەر دەزانی کێیە زەنگ لێدەدات .

گووتی : بەڵی ئایەتوڵا بەهەشتی یە .

زۆری نەمابوو لەسەرسوڕماویدا هەناسەم لە سینەدا گیربکات ، ئەگەر هیچ کەس نەیدەزانی، خۆمن لەدوای میوانداریەکەی، باغەکەی حاجی تراب دەمزانی کەچۆن سەرە داوی هەموو کارەکان لە ئێران لەدەست ئەودایە ، ئەو بوو فەرمانی کوشتنی ئایەتوڵا شەمس ئابادی دەرکرد، ئەو بوو ناڕەزایەتی مەزهەبی دژی ڕژێم کرد بە ڕێکخراو، ئەو بوو منی نارد بۆ

سوریا و لیبیا ، ئەو بوو شۆڕشی لە ئەسفەهانەوە دەست پێکرد و گەیاندیە تەهران، لەڕاستیدا ئەو بوو ئەو هەموو شتانەی هەتا ئێرە هێنا ، ئێستا چۆن دەبێت باوەڕبەوە بکرێت، لەبەردەم هەمووان جێگا بۆ باڵوێزی ئەمریکا هەبێت تەنها بۆ ئەو نەبێت.

کۆبونەوەکەی ئەو شەوەی نێوان خومەینی و ویلیام سالیڤان و هاوکارەکانی، هەتا کاژێر ٦ ی بەیانی بێ ئەوەی هیچ کەسێك بتوانێت بچێتە ژوورەوە یان بێتە دەرەوە، بەردەوام بوو.

هەر لەم کاژێرەدا بوو کۆبوونەوە بە کۆتاهات و لە تاریکی و لێڵی بەرەبەیانی زستان ، سەرەتا باڵوێزی ئەمریکا و هاوکارەکانی، دواتر مەهدی بازرگان و دوستەکانی و سەرئەنجام تیمی خومەینی کە ئێمە بووین لەیەك جیابووینەوە، هەر گروپەو بەلایەکدا بلاّوەمان لێکرد، تەنها گۆڕانکاریەك کە هەبوو، پەیوەندیکردنی سەید ئەحمەدی خومەینی بە گروپی ئێمە و زیاد بوونی دکتۆر یەزی، بۆ گروپی بازرگان بوو .

ئەمجارەیان خومەینی و سەید ئەحمەدمان گەیاندە قوتابخانەی عەلەوی. قطب زادە گووتی : چەند خولەکێك چاوەڕێ ی بین، کاتێك گەڕایەوە لەبەر چاوی دوریان سەد هەزار تومانی پێدام و گووتی : جارێ بانەمەت پێبێت، هەتا دوای. هەروەها ئەم ئۆتۆمبێلە لای تۆ دەمێنێتەوە و نابێت بەهیچ شێوەیەك سویچەکەی بەکەس بدەیت ، چونکە بە زووی ئۆپراسێونی مۆزەخانەکان دەست پێدەکات، بەناچاری نابێت چەند ڕۆژێك یەکتر ببینین، جێگا و شوێنت لای دوریان دەبێت.

تەنها ئەو پێت دەڵێت دەبێ چی بکەیت، نە کەسی تر. ئەگەر کارێکمان بەیەکتر هەبوو، جیاوازی نیە، چ من چ تۆ دوریان ئەو پەیوەندیەمان بۆ ڕێکدەخات ، یەکترمان ماچ کرد و من و دوریان کە کاژێر بە کاژێر گرنگیەکەی زیاتر دەبوو بۆم، بەرەوە ماڵەکەی بەڕێکەوتین. دووبارە دوریان لەبەرگە ئیسلامیەکەی هاتە دەرەوە. هەرکە چوینە ژوورەوە لە چاو تروکانێکدا خۆی ڕووتکردوە ، لەکاتێکدا بەرەوە حەمامەکە دەڕۆشت گووتی : دەبێت تۆ نانی بەیانی ئامادەبکەیت جەنابی فەرماندەی ئۆپراسیۆنی مۆزەخانە، سوپاکەت کاژێر ١٠ لێرەدەبن.

لەدوای نانی بەیانی لەوکاتەدا سەرگەرمی کۆکردنەوەی سفرەکە بووین ، میوانەکانی دوێنێ هاتنە ژوورەوە، دوای یەك دوو خولەك کار دەستی پێکرد . لەچاو تروکانێکدا سەر مێزی نانخواردن و دار و دیوار پڕبوون لە نەخشەی جۆراوجۆر ، قسەگەلێك دەستی پێکرد، کە بەڕای من هەرگیز تەواو نەدەبوون، بارودۆخی من لەبەر نەزانینی زمان بەڕاستی هەتا دەهات خراپ و خراپتر دەبوو ، هەرکارێك پەیوەندی بە منەوە هەبوایە، دوریان و سودابە بۆیان وەردەگێڕام. ئەوەش بڵێم زۆر کەم بوو ئەو بەشەی بۆیان وەردەگێڕام ، دەبوو ئەوەی پێم گووتراوە، دەجار دووبارەی بکەمەوە، هەتا فەرماندەی ئۆپراسیۆنەکە، کە کۆڵۆنێڵێکی ئەمریکی بەناوی (ویلیام بەیکەر) دڵنیابێتەوە کە ئاگاداری ئەرکەکانمم .

بەهۆی ئەوەی فەرماندەی ئۆپراسیۆنەکە ئەمریکی بوو، دەبوو سودابە بەدرێژایی چالاکییەکە لەگەڵم بێت، هەتا لەڕێگای بێ سیم ئاگاداری فەرمانی تازەبم ، کاژێر ٤ ی دوای نیوەڕۆ کۆبونەوە شەش کاژێریەکەی ماڵی دوریان مەگگرەی بەکۆتا هات.

دەمانچەیەکیان دابە سودابە و کۆلتێکی ئەمریکی و هەندێك یوزی ئیسرائیلیان خستە خزمەتی من ،، ئەو شەوە و تەواوی ڕۆژەکەی سبەی و شەوەکەشییان وەك مۆلەت پێدان، هەتا بەتەواوەتی پشووبدەین و دوو سبەی کاژێر ٦ ی بەیانی، لەمالی دوریان کۆببینەوە، هەتا ئۆپراسیۆنی مۆزەخانەی ئێرانی دێرین دەست پێبکات .

لە کۆتا ساتەکاندا، بەیکەر لیستێکی پێدام کە ئەمانی تێدا نوسرابوو ، سی و حەوت ڕەشاش ، یازدە کۆلت ، ٢٠ نارنجۆك ، سێ سەد هەزار تومان ، یازدە دەست جلی ئەفسەری هەریەك بە ئەندازەیەك کە لە تەنیشتیدا نوسرابوو، لەگەڵ هەندێك کەلەبچەی پلاستیکی و درێلێك و چەند دەمە برینەیەك، هەندێ شتی تر ، بەیکەر گووتی : ئەم لیستە بدە بە هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف، بەبێ هیچ ڕوونکردنەوەیەکی زیادە، داوایان لێبکە بەلایەنی کەمەوە لەماوەی پانزە ڕۆژ دا ئەمانە دابین بکەن و بهێنە خزمەتت .

ئەمە ئەو بەشەبوو فەرماندەی منی لە ئۆپراسیۆنی مۆزەخانەکاندا نیشانی لایەنی ئێرانی دەدا ، هێشتا میوانەکان لە ماڵ نەچووبونە دەرەوە، دوریان گووتی : من ئیتر تاقەتم چوو ، تۆ ئەگەر دەتەوێت حەمامێك بکەیت ، بڕۆبیکە من دەچم دەنووم، سبەیش کارێکمان نیە لەبەر ئەوە زوو هەڵمەستە.

منیش هێندە ماندوو بوو بووم، جگە لەو کارەی دووریان پێ گووتم، توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی ترم نەبوو ، لەبەرئەوە زوو چاوم چووە خەو. کاتێك بەئاگاهاتمەوە کاژێر ١١ ی شەو بوو، دوریان لە کەناری سیسەمەکەم دانیشتبوو، لەو کاتەدا تەنها ڕۆبێکی ناسکی لەبەردابوو، بە ئارامی خەریکی

خواردنەوەی ویسکی بوو. بە پەشۆکاویەوە ڕاپەڕیم و ویستم خۆم پۆشتەبکەمەوە، دوریان دەستی کرد بە پێکەنین و گووتی : جەعفەر تۆ نابی بە بەنی ئادەم مەگەر کچی چواردە ساڵیت شەرم لە خۆت و لەش و لارت دەکەیت، من ژنێکم و لە تۆ ئاسودە ترم، سەیرکە ئەم یەك دوو ڕۆژە تۆ من بەڕووتی بینی مەگەر هیچ ڕوویدا ؟.

بەپەلە گووتم: نا ... دیارە کە نا ، بەڵام شتێکی وەك ئەم جل پۆشین و نە پۆشینە عادەت و خووە، ئێوە وا خووتان گرتووە بەڕووتی و بێ بەرگی بەرێدا بڕۆن، ئێمەش وا خومان گرتووە خۆمان بپۆشین .

دوریان پێکەنی و گووتی : کەواتە جەنابی فەرماندە، زووتر خۆتان پۆشتە بکەنەوە هەتا ناموس و عادەت و خووەکەتان نەکەوێتە مەترسیەوە، ئەویش بەم نیوە شەوە .

کاژێرێك دواتر، دوریان نانێکی بەلەزەتی ئامادەکرد و پێکەوە خواردمان. هەندێ شەرابی فەرەنسیشمان خواردەوە، دوای چەند گفتۆگۆیەك لەبارەی ئایندەی کارەکانمان، دوریان چەند ڕێنمایەکی بەسودی پێدام. دواتر مەست و نیوە هۆشیار لەهەمان هۆڵ لەسەر قەنەفە نەرم و گران بەهاکان چاوم چووە خەو .

بەدەنگی زەنگی دەرگا، سەرەتا من، دواتر دوریان لە خەو ڕاچڵەکین. لەوانەیە دوو کاژێر بەسەر خەوتنەکەمان تێنەپەڕی بووبێت ، دوای کەمێك وەستان دوریان پێی گوتم: تۆ بڕۆ دەرگاکە بکەرەوە خۆیشی خەریکی کۆکردنەوەی پەرداخ و بتڵە خاڵیەکان بوو. کاتێك چوومە دەرەوە بۆ ناو حەوشەکە دونیا خەریك بوو ڕووناك دەبوویەوە، هەرکە دەرگام کردەوە،

بەسەر سورمانیەکی زۆرەوە ( ئایەتولا بەهەشتی و دکتۆر مفەتح ) م بینی، هێشتا سلام و عەلەیکمان تەواو نەبوو ، ئەو بەرێزانە هاتنە ژوورە و بەرەو ناوەوە رۆشتن، وا دیار بوو زۆر باش ئاشنای خانووەکەن. چەند ساتێك دواتر هەمووومان لە هۆڵەکە کۆبوینەوە. دوریان هێشا رۆبە تەنك و ئاسکەکەی لەبەردابوو هەموو لەشی بە جوانی دیار بوو ، دوریان هەردوکیانی ماچ کرد و دەستی کردە ملی بەهەشتی، چەند خولەکێك پێکەوە قسەیانکرد ، لەوکاتەدا کە من سینیەك چا و قاوەم بۆ بردن، بەهەشتی زۆر بە تورەی و دەنگی بەرزەوە قسەی دەکرد و دەیگووت : ئەم پیرە پیاوە خەڵەفاوە خەریکە یاری بە منیش دەکات، هێشتا تۆزی عەباکەی نەتەکاندووە دەیەوێت دەستی تەرمان پێدا بهێنێت ، وابرپارە ئەمرۆ کاژێر چوار کۆبونەوەی دوقۆڵیم هەبێت لەگەڵی، هاتووم هەتا لەگەڵ تۆ پرس و راوێژبکەم، بەم شێوەیە ناکرێت کاربکەین.

ئەم سێ کەسە کچانیەش کە کەس نازانێت سەری خاوەنەکانیان لە چ ئاخورێکدا بەجێماوە، دەوری ئەم پیرەپیاوەیان داوە، هەربەراست بەرامبەرەکەمان باوەری کردوە بووە بە ئیمام و پێلاوی بۆ دادەنێن. پێری شەو لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکا کۆبوەتەوە، هەواڵەکەی بەمن گەیشت منیش رۆشتم، هەتا شتێکم لە کۆبونەوەکە دەست بکەوێت، دڵنیابووم کە لەوێن ، بەلام نزیکەی بیست خولەك زەنگم لێدا دەرگایان نەکردوە.

دوریان قسەکانی بەهەشتی بری و رێك و راست گووتی : منیش لەو کۆبونەوەیەدا بووم، بە هەڵکەوتیش نەبوو. بەرنامە رێژی بۆ کرابوو، هیچ پێویستی نەدەکرد تۆ لەوێ بیت. چەند جار دەبێت من قسەکانی پێشووت بۆ شی بکەمەوە، دوای هەفتەیەك دیسان باس بکرێتەوە، ئێرەش خەریکە

دەبێت بە عێراق و پاریس، کۆبونەوەکەی پێرێ شەو چەند تەوەرێك بوو، بەشێکی ئیمام دەیویست ڕووبەڕوو لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکا ڕێکەوتن بکەن لەسەری و ڕیکەوتن. باشتر تۆ لەوێ نەبویت، ئەگینا ئەو پیر پیاوە نەدەچووە ژێربار ، بەڵام هەموو قسەکانی باڵوێزی قبولکرد .

قسەکانی دوریان وەك ئاوێك بەسەر ئاگردا بکەیت وابوو. ئەو دەیگووت و بەهەشتی و مفەتح سەراپا گوێیان بۆ ڕادەگرت .

لەکۆتایدا بەهەشتی گووتی : کەواتە ئاوایە. دوریان ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە ، باشە ئەگەر ئێستا بابەتەکە بە مەیلی ئێوە، مەبەستم تۆ و مفەتح نەبێت، دەتوان چ کارێك بکەن. لەوکاتەدا بەهەشتی پێکەنی و گووتی : لێرە شتانێك هیی ئەومن ڕووبدەن، ئەگەر بەهەڵکەوتیش بێت و مەبەستی لێ ی شا و ساواك بێت ، سەیرکە دوریان خودی خومەینی کێشەیەك نییە، من لەم سێ دیاریە ئەوروپیە نیگەرانم کە زۆر خراپ دەیانەوێت چارەنوسی هەموو شتێك بگۆڕن .

دوریان زۆر بە ئارامی گووتی : سەد جار گوتم هەموو شتێك بە جدی مەگرە ، دیسان دوبارەی بکەمەوە . هەمووومان پێکەوە پێکەنین، ئیتر بەهەشتی شوێنەواری توڕەیی و نیگەرانی یەکەمجار بە ڕوخساریەوە نەما و گوتی : بەڕاست، دوریان بڕیار بوو ئەمڕۆ ئامانەتیەکانمان پێبدرێت، ئامادەدەبن ؟.

دوریان گووتی : بەڵێ، وابزانم ئەمڕۆ هەتا نیوەڕۆ ئامادەدەبن. دەڕۆن یان دەمێننەوە ؟

بەهەشتی گووتی : دەمێنینەوە هەتا ئامانەتیەکان وەردەگرین، بەم بارودۆخەی تێی کەوتوین، دیار نیە ئاخیر و عاقبەتی کارەکە چی لێدێت ، ئەگەر سوپا دەست بە کودەتا بکات، هەموومان لەناو دەچین.

گفتوگۆ سیاسیەکانی نیوان ئەم سێ کەسە بەردەوام بوو، هەتا ئەو کاتەی ماتۆڕسوارێك هات. لە کاژێر دە و سی خولەکی بەیانی، سەد و حەفدە پاسپۆرتی ئەمریکی دایە دەست دوریان ، دوریان پاسپۆرتەکانی لە پیرە پیاوی ماتۆڕسوار وەرگرت و هاتە هۆڵەکەوە. دوای ئەوەی یەك یەك پاسپۆرتەکانی لەگەڵ لیستەکەدا بەراورد کرد، ڕادەستی بەهەشتی کرد و گووتی : ئەمەش ئەمانەتیەکان، بە دارودەستەی بازرگان و هەم بە جەبهەی میللی و مەلاکانیش بڵێ، ئەگەر تەنها یەك دانەیان بکەوێتە دەست کاربەدەستەکانی شا، ئەوکات دەبێت فاتیحەی شۆڕش بخوێنین.

کاتێك بەهەشتی و دکتۆر مفەتح ڕۆشتن، دوریان بە تەلەفۆن پەیوەندی کرد بە هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف، گووتی : بەڕێز شەفیع زادە، واتە من حەزدەکات کاژێر ٧ ی ئێوارە بتان بینێت . جیگای دیداریش ماڵی دوریانە بوو .

دوبارە من و دوریان بەتەنها ماینەوە، لێم پرسی ئەم پاسپۆرتانە بۆ چی بوون ؟ ئەگەر بەکەڵك دێت بۆچی نابێت منیش دانەیەکم هەبێت.

دوریان گووتی : ئێستا نۆبەی تۆیە، سنوری عادەتەکانی من ببەزێنیت ، دەزانی من عادەتم نیە وەڵامی کەس بدەمەوە ، بەڵام لەگاڵتە دەرچێت، لەبەر ئەوەی حەزدەکەم ڕۆژ بە ڕۆژ زانیاریەکانت بەرەو پێشەوە بچێت وەڵامت دەدەمەوە .

ئەم دارودەستەی خومەینی و بازرگان و جەبهەی میللی یە باوەڕناکەن پیاوی ئایندەی ئێرانن، دەترسن کودەتایەك باوکیان لە گۆڕ دەربهێنێت. وادەزانن ئەگەر پاسپۆرتێکی ئەمریکیان پێبێت، لە دوای هەڵهاتنیان لە ئێران دەتوانن لە هێمنایەتی تەواو دابن . گووتم: خۆ ئەوان ئەمریکی نین، لە دووره وە لاف و گەزافی ئێرانی بوونیان لێدەدەن.

دوریان پێکەنی و گووتی : چی بکەین ئەم منالە داماوانە دڵیان بەمە خۆشە .

گووتم : واتە ئەمریکیەکان هێندە بە ئاسانی پاسپۆرت دەدەن ؟.

دوریان وەڵامی دامەوە ، سەیرکە تەنها شتێك دەبێت لێرەدا بیزانیت ئەمەیە، ڕاستە ئەم پاسپۆرتانە ئەمریکین و لە باڵوێزخانەوە هاتوون ، بەڵام جۆرە پاسپۆرتێکە ئەگەر بیدەیت بە دەست پۆلیسێکی ئاسایی ئەمریکیەوە، بەهۆی ژمارە سریاڵەکانی ناویەوە دەزانێت ساختەیە.

بەم جۆرە هەڵگری ئەم پاسپۆرتە ڕووبەڕووی FBI و CIA دەبێتەوە. ئیتر لێرەوە بزانە چارەنوسی هەڵگری ئەم پاسپۆرتە بەرەوە کوێ دەڕوات . ئێستا دەزانیت بۆچی تۆ ناتوانیت ببیت بەخاوەنی دانەیەك لەمانە .

گووتم : ئەگەر ئەسڵەکەیم بوێت دەبێت چی بکەم.

دوریان دای لە قاقای پێکەنین و گووتی : جەعفەری ئەزیزی من ، هیچ ڕێگە چارەیەك شك نابەم، جگەلەوەی دەبێت هاوسەرگیری لەگەڵ مندا بکەیت، لە جێگای جعفەر ببیت بە جیفری ، تۆ حەز بە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی ڕووت و بێ بەرگ ناکەیت، هەروەها شانبەشانی پیاوی

بێگانەش بڕوات ، لەبەرئەوە بیری لێمەکەرەوە ، هەر لەگاڵتە دەرچێت، ئەڵبەتە دەکرێت کارێکت بۆ بکەین ، بەلاَم نەك ئێستا و لەم بارودۆخەدا، کەواتە دانبەخۆتدا بگرە.

هەتا کاژێر ٧ ی ئێوارە، بەر لە گەیشتنی شێخ عەلی ئەکبەری هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف، هەلێکی دور و درێژ بوو، هەتا باشتر لە پێشوو خانم دوریان مەکگرەی بناسم، هەتا کاژێر ٧ ی ئێوارە، لەوانەیە زیاتر لە سی جار تەلەفۆنی بۆ کرابێت، لەهەموو جێگایەکەوە لە قوتابخانەی عەلەوی ، شورای شۆڕش، باڵوێزخانەی ئەمریکا و کەنەدا و بەریتانیا، دووجار لە واشنگتن و جارێکیش خومەینی، فەرمانی بەهەموویان دەکرد، ئەم کارە بکەن نا ئەوکارە بە فازانج نیە مەیکەن، ئەو تەلەفۆنانەی جیا لە ئێرانیەکان بۆی دەهات، بەهۆی نەزانینی زمان هیچ تێنەدەگەیشتم ، بەلاَم بە زمانی جەستە تێدەگەیشتم، هەمان جوڵە بوو لەکاتی فەرمانکردن بە فارسی زمانەکان ئەنجامی دەدا.

کاژێر شەش و سی خولەك، دوبارە دوریان چووە ناو بەرگە ئیسلامیەکەیەوە و عەبای پۆشی و چاوەڕێ ی گەیشتنی میوانەکان بوو. لەبەرامبەر هاشمی ڕەفسەنجانی و عەباس زەمانی(ئەبو شەریف) دوریان جۆرێکی تر بوو، بۆ وێنە؛ وەك ئەوەی من فەرماندەبم و فەرمان لەمن وەردەگرێت، لەکاتێکدا من وابیرم دەکردەوە، لەوانەیە فەرماندیم بۆ ئەبو شەریف بسەلێنین ، بەلاَم لەبارەی هاشمی ڕەفسەنجانی، کە لە کۆبونەوەکانی پێشوودا بە نامادەبوون یان نەبوونی من، شاهیدی بینینی هێز و توانایی دوریان بووە ، ئیتر ئەم نمایشانە دەتوانێت چ مانەیەکی هەبێت ، جگە لەوەی قبوڵی بکەم هەمووان لە ناویشیاندا خودی خۆم کارئەکتەرێك بووین هەرچیەك دوریان بیویستایە

و بگوتبایە دەبوو هەر ئەوە نمایش بکەین، بە بێ ئەوەی پەیوەندیەکی لۆژیکی لە نێوانیاندا هەبێت ، بەهەرحاڵ ئەو شەوە شەوی نیشاندانی هێز و توانایی فەرماندەی من بوو. بە پێچەوانی کۆبونەوەکانی پێشووترەوە، هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف وەها ڕێزیان لێدەگرتم، هەندێجار خۆم پێکەنینم دەهات. پێش ئەوەی ئەو لیستەی کۆلۆنێڵ بەیکەر پێ ی دابووم، بەوان بدەم. هاشمی ڕەفسەنجانی سەری قسەی کردەوە و گووتی : من زۆر خۆشحاڵم بەڕێز شەفیع زادە، کەسێکی زۆر بەجەرگ و مسوڵمانی وەك ئەبو شەریف، بە هاوکاری خۆی بۆ ئەم کارە پڕمەترسیە هەڵبژاردووە.

لەم دوو سێ ڕۆژەی ڕابردوودا، بەڕێز ئەبو شەریف، چەند چالاکیەکی سەرەتایی پەیوەندیدار بە ئۆپراسیۆنەکە ئەنجامداوە، وام پێباشترە خۆی زیاتر ڕوونکردنەوە بدات .

من بەتاسەوە بووم هەتا بزانم، مانای ئەم قسانە چیە ، دەبێت ئەم چالاکیە چی بێت، خۆ هێشتا من شتێکم لەوان داوانەکردووە ، بەلام هەرچۆنێك بێت بیرم کەوتەوە، نابێت زۆر قسە بکەم، دەبێت زۆرتر ببیستم و هێمن و لەسەر خۆبم، بە بێ ئەنجامدانی بچوکترین پەرچەکردار، چاوەڕێی ڕوونکردنەوەکەی ئەبو شەریف بووم ، لەوکاتەدا ئەبو شەریف جانتاکەی دەستی کردەوە، لەناویدا صندوقێکی بچوکی دەرهێنا و گووتی : ئێمە سەر و گیانمان لە پێناو ئیمام و شۆڕش فیدا دەکەین ، لەبەر ئەوە لەدوای کۆبونەوەکەی ئەو ڕۆژە، بیرمانکردەوە کە دەبێت کارێك ئەنجام بدەین، هەتا ئەو شانزە ملیۆن دۆلارە جۆر بکەین، لە ژێر چاودێری ئایەتوڵا مەهدەوی کێنی، چەند کارێکمان ئەنجامداوە.

ئەبو شەریف ئەو صندوقەی لە جانتاکەی دەریهێنابوو، دەستی درێژ کرد بۆ لای من، منیش بە ئاماژەی سەر فەرمانم بە دوریان کرد صندوقەکە لە ئەبو شەریف وەرگرێت ، دواتر دوریان صندوقەکەی کردەوە و کۆمەڵێك خشڵی تێدابوو، هەمووی هەڵڕشتە سەر مێزەکە ، نازانم دوریان بۆچی ئەم کارەی کرد ! بەلاّم من واتێگەیشتم، ئەم کارەی وەك نارەزای دەربڕینێك ئەنجام داوە. منیش پێکەنینێکی لالێوم بۆ کردن و گووتم : باشە کەواتە ..... ؟

ئەبو شەریف بە شپرزەیی یەوە گووتی : ئەگەر ئێمە دەست و بردمان نەکردایە، خەڵکانی تر دەیانبرد. ئێمەش بیرمان کردەوە بۆچی بەشێك لەو شانزە ملیۆن دۆلارە بەم جۆرە پەیدانەکەین.

دوریان سودی لە بێدەنگیەکەی من وەرگرتوو گووتی : سەیرکەن پێشتر ئاگادار کراونەتەوە، کە نابێت لەخۆتانەوە و سەربەخۆیانە هیچ کارێك ئەنجام بدەن. وەکو ئەنجامیشتان داوە من چاوەڕێم هەتا بزانم چۆن و لەکوێ ئەمانەتان هێنانەوە ؟.

ئەبو شەریف ڕوونی کردوە ، لەبەرئەوەی هەموو تاغوتەکان ڕایانکردوە، یان لە سەروبەندی هەڵهاتندان، ماڵەکانیان ڕووبەڕووی دزی و تالاّنی بووەتەوە. ئێمەش بە پێشنیاری ئایەتولاّ مەهدەوی کێنی، بیرمانکردوەوە کە کار لەسەر کەسە دیار و دەست ڕۆشتوەکان بکەین. ئەمانەشمان لە دوو ماڵ واتە ماڵی (سیناتۆر محەمەد علی مسعودی و مەحمودی خیامی) بەدەست هێناوە .

دوریان ڕووی لەمن کرد و گووتی : تازە هەرچۆنێك بێت کارەکە ئەنجام دراوە، دەبێ ئێستا چی بکەین.

دوای کەمێك بێدەنگی، گووتم : لە گۆشە نیگایەکی بچوکەوە هەموو شتێك وەك دەڵە دزیەك دێتە پێش چاو، من نازانم چی لەمانە بکەین ، بەلاّم تکاتان لێدەکەم با ئەم بابەتە لەنێوان خۆماندا بمێنێتەوە. ئێوە کەوتوونەتە رێ بۆ دزی شەوانە، ئەڵبەتە بەرێز ئەبو شەریف پارتیزانن و پارتیزانیش تەنها فەرمان جێبەجێ دەکەن، ئەو ئایەتوڵایەی ئەم فەرمانەی دەرکردوە هەڵەی کردوە من ئیتر پێم خۆش نییە کاری لەگەڵدا بکەم، پێشی رابگەیەنن، بەم زبڵ و خاشاکە ناتوانین قەزی وولاّتێك بدەینەوە ، نازانم چەندی تر لەوێ دزراوە و چەندی لێرەیە و ئەوی تری لە چ جێگایەکە .

هاشمی رەفسەنجانی بێدەنگی شکاند و هاتە گۆ و گووتی : بەو ئیمانەی کە لە ئەبو شەریفدا دەیبینم، گومان ناکەم جگە لەمە شتی تر هەبێت.

دوریان گووتی : بە دڵنیایەوە وایە ، بەلاّم بەرێز شەفیع زادە مەبەستیان ئەوەیە، ئەگەر بەبێ فەرمانی ئەوان، جارێکی تر کارێکی وەها ئەنجام بدرێت، لەوانەیە بەزیان بشکێتەوە بەسەرماندا .

ئەبو شەریف گووتی : من جگە لە نیاز پاکی هیچ مەبەستێکی ترم نەبووە ، بەلاّم ئێستا دەبێت چی بکرێت ؟ لەکۆتایدا راست بێت یان هەڵە کارەکە ئەنجامدراوە.

لەوکاتەدا لیستی داواکاریەکاریە رێکخراوەکەی کۆڵۆنێل بەیکەرم بە ئەبو شەریف دا و گووتم : کاری پارتیزانێکی باش کە دەبێت ئێوەبن، ئامادەکردنی ئەمانەیە ئەویش لەماوەی پانزە رۆژدا .

دوریان گووتی : ئەی چارەنوسی ئە خشلاّنە چی لێدێت .

گووتم : پەیوەندی بە من و بەرنامەکەی منەوە نیە،ماڵی دزیە و هەمان ئایەتولاَ مەهدوی کێنیە با بیباتە خزمەتی حەزرەتی ئیمام، هەتا ئیمام حەلاَڵی بکات و دواتر برینێکی پێ سارێژ بکەن.

هاشمی ڕەفسەنجانی گووتی : گومانم وایە، ئیمامیش جگە لە نارەزای دەربڕین، هیچ کارێکی تر ناکەن، بەهەرحاڵ هەڵەیەکە و ڕوویداوە، وابیردەکەمەوە باشترە خانم دوریان مەککرەی، کە لەگەڵ بنەماڵەی ئیمام پەیوەندی دۆستانەیان هەیە، ئەو ئەرکە بگرنە ئەستۆ و لەکاتێکی گونجاودا کارەکە بۆ ئیمام ڕونبکەنەوە .

من ئیتر بەدوای بابەتەکەدا نەچووم و هێشتم ئەوان درێژە بە گفتوگۆکانیان بدەن ، بەلاَم ئاکامەکەی ئەوە بوو خشڵەکانیان بۆ بەجێهێشتن .

کاتێك ئەو دوانە ڕۆشتن دوریان عەباکەی لابرد و هات بەرەو لای من، خۆی هەڵدایە باوەشم چەندجارێك ماچی کردم و گووتی : جەعفەر تۆ ناوازەیت، بەڕاستی دەستت خۆش بێت، کارەکانت شاکاربوو ، بێباکیت لەبارەی وەها گەنجێکی بێرەنج ، تورە بونەکانت ، ئەو ئەدەب کردنانەت کە پارتیزان چەك دەدزێت نەك خشڵ ، لە کۆتایشدا لە هەمووی گرنگتر حەلاَڵ کردنی ماڵی دزی . ئەمانە بوونە هۆی ئەوی جێ پێ ی خۆت لەفەرماندەیدا قایم بکەیت .

گووتم : بەڕایی تۆ دەبێت ئەمانە ئێستا نرخەکەیان چەند بێت ؟.

دوریان گووتی : نزیکەی بیست بۆ بیست و پێنج ملیۆن دۆلار ، بەڵام وابزانم ئەم گێژ و نەزانانە ئەمەیان نەزانی بێت .

سەرئەنجام ڕۆژی چاوەڕوانکراو گەیشت، ڕۆژی ئەنجامدانی ئۆپراسیۆنی مۆزەخانەی ئێرانی دێرین و کۆشکی گوڵستان .

کاژێر ٦ ی بەیانی، هەموومان لەماڵی دوریان مەککگرەی کۆبوینەوە. کۆڵۆنێڵ ولیام بیکەر چاودێر و فەرماندەی ڕاستەقینە بوو .

کاژێر ٧ ی بەیانی ژمارەمان گەیشتە ٣٦ کەس، ١١ کەسی ئەمریکی و ٢٥ ئێرانی، بە فەرمانی کۆڵۆنێڵ بەیکەر، هەموویان جل و بەرگی سەربازی و ئەفسەری سوپای ئێرانیان لەبەرکرد. کاتێك لە پۆشینی جل و بەرگەکانیان لێبوونەوە، لەڕاستیدا ئەگەر من بەچاوی خۆم گۆڕینی جل و بەرگەکانیانم نەدیتبا، بچوکترین گومان نەدەکرد لەوەی کە ئەمانە سەرباز و ئەفسەرانی سوپای شاهنشاهی نین، بە فەرمانی بەیکەر بەسەر دوو گروپدا دابەش بوون پێداویستیەکانیان خرایە بەردەست. هەموویان بە بێ تەل و دەمانچەی کۆڵت تەیار کرابوون، لە دوای ئەوەی سەرباز و ئەفسەرەکان، چەکی یوزی و ژــ٣ یان وەرگرت، بەهەریەکەیان ناسنامەیەکی سەربازی و کارتی حکومەتی نیزامیان پێدرا. بۆ هەر گروپە و کۆڵۆنێلێکی ساختە، بەناوی خوازراوە وە وەك فەرماندە دەسنیشانکرابوون .

من و سودابە و ئەمریکیەکانی تر، تەنها کەسانێك بووین جل و بەرگی سەربازیمان لەبەردانەبوو. ئەو بێ تەلانەشی پێمان بوو، جیاواز بوو لە هی ئەوان، لەگەڵ ئەوەشدا لەسەر دوو فریکانسی جیاواز کاری دەرکرد .

لەدوای کارە سەرەتاییەکان، کۆتا کۆبونەوە لە هۆڵی نانخواردن، بە ئامادەبوونی هەمووان ئەنجام درا بێئەوەی من هیچ شتێك لە گفتوگۆکانیان تێبگەم، ماوەیەك گوێیان بۆ قسەکانی بیکەر گرت ، گوێ ی من سودابە بوو. لە تەواوی ماوەی چالاکی یەکە ئەو بوو فەرمانی لە بەیکەر وەردەگرت و دواتر بەمنی ڕادەگەیاند .

کاژێر ۳۰ : ۰۸ بەیانی، من و بەیکەر و سودابە و ئەمریکیەکانی تر، کۆتا کەسانێك بووین ماڵئاوایمان لە دوریان کرد و بە جێمان هێشت. من و سودابە سواری ئۆتۆمبێلێکی مارسیدرس بنز بوین، بەیکەر و ئەمریکیەکانی تر چونەناو سێ ئۆتۆمبێلی تر و بەڕێ کەوتین. هێشتا لە کۆڵانی داراب نەگەشتبوینە وێستگەی قەنات لە شەقامی دەوڵەت قلەهەك، لەڕاستیدا زۆری نەمابوو لەترسی ئەوەی کە بینیم دڵم ڕابوەستێت، لەهەر دوولای شەقامە باریکەکەی دەوڵەت، دوو کاروان زیل و جیپی سەربازی لەمبەر و ئەوبەرەوە وەستا بوون. بە ترس و لەرزەوە گووتم : وا دیارە کەوتوینەتە تەڵەوە.

سودابە بە پێکەنینەوە گووتی : نا هاوڕێکانی خۆمانن، هەتا دوو بۆ سێ خولەکی تر بەڕێ دەکەون ، ئێستا کەمێك بچۆ پێشەوە و چاوەڕێ بە، هەر کات ئەم لایەیان بەرەو قولهەك بەڕێکەوتن، تۆش لە پشت سەریانەوە بەڕێکەوە و ئەم مەودایە بپارێزە هەتا دەگەینە جێگای مەبەست.

ناچار نزیکەی سەد مەتر لە دوری کاروانە سەربازیەکە لە کەنار جادەکە وەستام ، سودابە بە بێ تەل لەگەڵ بیکەر قسەیکرد. خولەکێك دواتر کاروانەکە بەڕێکەوتن، سەرەتا جیپێکی ئەمریکی و دواتر جیپێکی ڕوسی و بەدوایدا پێنج زیلی سوپا تێپەڕین، دواتر بە ئاماژەی سودابە منیش بەڕێکەوتم ، هێشتا نەگەیشتوبینە سێ ڕێیانی قولەهەك و جادەی کۆن، لەناکاو چادری کۆتا زیل کە لەپێش منەوە دەڕۆشت لادرا، بەچاوێکی ناباوەڕییەوە زیاتر لە ٢٥ بۆ ٣٠ کەسی چەکدارم لە ناو زیلەکەدا بینی، بە دیتنی ئەوان، بە خۆش باوەڕی و ساویلکە و نەزانی پێکەنیم، تازە تێگەیشتم چالاکی دەستبردن بۆ مۆزەخانەکان بەو ئاسانیە نیە کەمن بیرم لێدەکردەوە. ڕێکخراوێکی فراوان و بەرنامە ڕێژیەکی تەواو لەپشت ئەم کارەوەیە ، لەوانەیە ڕاهێنانێکی زۆریشیان بۆ ئەنجامدانی کردبێت. ئەو وێنایەی من بۆ دزی و دزی سیاسی و پارتیزانی هەمبوو، زۆر جیاواز بوو لەگەڵ ئەوەی لەبەرامبەر چاوەکانم دیتم .

لەجادەی کۆنی شەمێرانەوە بەرەو ناوەندی شار ڕۆشتین، ئەگەر ترافیکیش سور بوایە پۆلیسی هاتوچۆ، ئۆتۆمبێلەکانی تری بۆ دەوەستاندین هەتا کاروانە سەربازیەکە تێپەڕبێت، ئەم کارەی ئەوان گرفتی بۆ هاوکاری من و ئەمریکیەکانی تر لەگەڵ کاروانە سەربازیەکە دروستدەکرد ، چونکە ترافیك سوربوایە کاروانەکە تێدەپەڕی و مۆڵەتیان نەدەدا ئێمە بەدوایان کەوین، ئەمەش دوری دەخستە نێوانمانەوە ، بەلام هەرچۆنێك بێت، جگە لەم بابەتە هیچ کێشەیەکی ترمان بۆ نەهاتە پێش، هەتا گەیشتینە جێگای مەبەست .

کاتێك له یەکتربڕی شەقامی فیردەوسی و مەیدانی تۆپخانه و شەقامی سپەه تێپەڕین، لەلایەن خەڵکی خۆپیشاندەرەوە چەند بەرێکیان تێگرتین، ئەگەر لەو ڕۆژگارەدا ئەم کارە ئەنجام نەدرابا جێگای سەرسوڕمان بوو .

ڕێك له کاژێر ١٠ ی بەیانی، کاروانەکەمان له بەرامبەر مۆزەخانەی ئێرانی دێرین وەستا. دەستبەجێ بیکەر و یەکێك له هاوکارەکانی، له ئۆتۆمبێلەکەیان دابەزین و پەیوەندیان به من و سودابەوە کرد. هەرکه سواری ئۆتۆمبێلەکەی ئێمه بوون، له چاوتروکانێکدا، هەموو سەربازەکانی ناو هەر پێنج زیلەکه هاتنه خوارەوە. به فەرمانی بەرپرسەکانیان هەر چەند سەربازێك و بەرەو لایەك ڕۆشتن ، ١٠ کەس لەوان ڕویان له شەقامی سپەه کرد ، ١٠کەسی تریان بەرەوە شەقامی سەبت ، ١٠ کەسی تر بەرەوە شەقامی وەزارەتی دەروەوە و شارەوانی گشتی وولات، ١٠ کەسی تر بەرەوە شەقامی قوام السلطنه ڕۆشتن ، ئەوانی تر گەمارۆی دەوروبەری مۆزەخانەکەیاندا و چەند خولەکێك دواتر بەشێوەیەکی گشتی هاتوچۆی ئۆتۆمبێل ڕاگیرا .

بەیکەر و سودابه بەردەوام به بێ تەل قسەیان دەکرد، بەئاسانی دەتوانرا هەست بەوەبکەین هەردوکیان لەسەر فریکانسێکی تایبەت قسەدەکەن. دوای ١٠ خولەك کۆڵۆنێل بەیکەر و سێ ئەمریکی تر لەگەڵ کۆڵۆنێلێکی ساختەی فەرماندەی گروپ و هەندێك ئەفسەر له قادرمەکانی مۆزەخانەی ئێرانی دێرین چوونه سەرەوە، لەبەرامبەر دەرگای چوونه ژوورەوەی مۆزەخانەکە، چەند کەسێکی ئێرانی به جل و بەرگی ئاساییەوە، سەیری کارە سەرەتایەکانی گروپەکەیان دەکرد، وەك بڵێیت لەچاوەڕوانی ئەنجامدانی ئەوکارەدان ، دەستبەجێ هەموویان چوونه ناو بینای مۆزەخانەکە.

ئێستا جگەلە من و سودابە و هاوڕێ بەیکەر ئەو سەربازانەی گەمارۆی ئەو دەوروبەرەیان دابوو کەسی تر لە گروپەکەی ئێمە لەوناوەدا نەدەبینرا. بۆ ماوەیەك، واتە نزیك بە ۳۰ خولەك هیچ جموجولێکی نۆێ لەو دەوروبەرەدا ڕوینەدا ، جگە لەوەی هاوڕێ بەیکەر و سودابە بەشێوەیەکی بەردەوام، بە بێ تەل پەیوەندیان بەیەکەوە دەکرد. لە ناکامدا سودابە بە ڕوویەکی خۆشەوە ڕووی کردە من و گووتی : دەبینیت ئەمریکەیەکان چ معجیزە گەلێك دەخولقێنن ! کورەکانی کۆشکی گولستان سەرکەوتوانە کارەکەیان ئەنجامدا. هەر ڕاستی ڕاستی ئەمانە شاکارن ، دواتر بێ ئەوەی مۆڵەتی ئەوم هەبێت وەلامی بدەمەوە سودابە گووتی : یوزیەکەت هەڵبگرە و بڕۆ ژوورەوە چاوەڕێت دەکەن .

گووتم : بەو ئاسانیە ؟

گووتی : خەیاڵت ئاسودەبێت هەموو شتێك بە پێ ی پلانەکە دەڕوات .

چەکە یوزیەکەی دروستکراوی ئیسرائیل ی تەنیشت دەستم هەلگرتوو خەریك بوو دادەبەزیم، سودابە بەبیری هێنامەوە کە بێ تەلەکەم بیرنەچێت، لە کوێدا توشی گرفت بووم پەیوەندی پێوەبکەم .

ئێستا سالانێك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێدەپەڕێت، دەبێت ئەمەش بڵێم ڕاستتان دەوێت، تەنانەت لەوکاتەشدا کە ئەزموونی ئەمڕۆم نەبوو، ئەو کارەم بە ڕەزامەندی و ئارەزووی خۆم ئەنجام نەدا هەرجۆرێك بیرم لێدەکردەوە، دەمگووت ئەم کارە دزی یە، بۆ من کوشتن ئاسانترە لە دزی کردن هۆکارەکەی خۆشم نازانم ، بەهەرحاڵ سەرکێشی یەك بوو گرفتار بووبووم پێوەی، ڕێگای دووەمیشم شك نەدەبرد.

کۆڵۆنێل ولیام بەیکەر، کە ئێستا منیش وەك ئەمریکیەکان ئەو بە بەیلێ بانگدەکەم، لەودیو دەرگای مۆزەخانەکە چاوەڕێ ی منی دەکرد. چوومە ژوورەوە، ڕاستەوخۆ دەستی گرتم بەرەو نهۆمی دووەم بردمی. بەپەلە بەرەو ژوورێك ڕۆشتین لەسەر دەرگاکەی نوسرابوو بەڕێوبەری گشتی، هەرکە دەرگام کردەوە، دیمەنێکم بینی جێگای باوەڕ نەبوو بۆم، نۆکەسیان بە دەم و دەست بەستراوی و بە چاوێکی نیگەرانیەوە لەسەر زەوی پاڵخستبوو، دوو کەسی تریش بەبێ جوڵە لەتەنیش مێزی بەڕێوبەری گشتی خەڵتانی خوێن بووبوون، بێشك مردبوون ، هیچ گومانێکم نەبوو، کە ئەو یازدە کەسە واتە هەم ئەو نۆ کەسەی دەست و قاچیان بەسترابوویەوە بەخسیر کرابوون، هەم ئەو دوو کوژراوەش لە فەرمانبەرانی مۆزەخانەکەن. هێشتا لەسەر سوڕماوی و نیگەرانیدابووم، دەنگێك لە بێ تەلەکەوە هات سودابە گووتی : بەداخەوە ئەم ڕووداوە هاتووەتە پێش ، بەلاّم بەیکەر دەڵێت شتێك نییە جێگەی نیگەرانی بێت، هەموو شتێك بەخواستی خۆمان دەچێتە پێشەوە. لە ئێستاوە کاری تۆ گواستنەوەی دەستبەسەر و کوژراوەکانە بۆ جێگایەك، کە دواتر دەزانیت ، ئەگەر پێویستت بەیارمەتی هەیە بڵێ ؟

گووتم : بەڵێ پێویستم بە چەند کەسێکە لە پارتیزانەکانی خۆم، کە وەك ئەم گوێرەکانە نەبن ، گووتی کەسێکی تایبەتت لە مێشکدایە ؟

گووتم : بەڵێ ، بەلاّم سەرەتا پێم بڵێ بزانم چەند کاتم لەبەر دەستدایە ؟

گووتی : یەك خولەك بۆستە هەتا بپرسم .

کەمتر لە سی چرکە نەخایاند سودابە پەیوەندی پێوەکردمەوە،

گووتی ؛ له ئێستاوه هەتا خۆرئاوابوون کاتت هەیه بەڕای تۆ بەسه ؟

گووتم ؛ زۆریشه ، بەڵام لەبیرت بێت، من لێره بەتەنها نامێنمەوه هەتا بکەومه بۆسەی کاربەدەستانی دەوڵەتی شا .

سودابه گووتی ؛ بەلایەنی کەمەوه من و بیست بۆ سی کەس ناچارین بمێنینەوه، خەیاڵت ئاسودەبێت.

گووتم: دەبێت هەرئێستا لەگەڵ دوریان قسەبکەم .

گووتی ؛ لێگەڕێ بۆ دوایی .

گووتم ؛ دواترێك له ئارادا نییه. من پێویستم به پارتیزانەکانی خۆمه، ئەوانیش له دوریان فەرمان وەردەگرن، لەبیرت بێت له ئێستاوه ئەوەی فەرمان دەکات منم. سودابه به ئاوازی دەنگیدا دیاربوو که نیگەرانه گووتی ؛ تکا دەکەم توڕه مەبه، ئێستا بۆت ڕێکدەخەم.

گووتم ؛ دەبێت بزانم بۆچی بەڕۆژی ڕۆشن دەرگای مۆزەخانه داخراوبوو ؟.

گووتی: مۆزەخانه هەمیشه ڕۆژی پێنج شەممان پشووه، چ بگات بەم ڕۆژانه که سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوه .

گووتم لەبیرت بێت من یوزی یەکم پێیه و فریویش ناخۆم، کوشتن له ناو خواردنەوه ئاسانتره لەلام هەموو ئەم ئەمریکیانه دەنێرم بۆ جەهەنەم، ئەمەش بەم کۆڵۆنێل درێژه ئەمریکەیه بڵێ .

سودابە دەپاڕایەوە و گووتی : جەعفەر تکات لێدەکەم توڕە مەبە، من دەزانم چەند نیگەران و تورەیت، ئەمە تەنها ڕووداوێك بووە. برادەرانی کۆشکی گوڵستان کارەکەیان بەبێ هیچ ڕووداوێك بەسەرکەوتوویی ئەنجامداوە ، بەلآم ئێرە وایلێهات تەنها تۆزێك دانبەخۆتدا بگرە.

چەند ساتێك پێشتر کۆلۆنێل بەیکەر چووبووە دەرەوە، کاتێك گەڕایەوە بە توڕەیەوە لولەی یوزیەکەم ڕووکردە بەیلێ و هاوارم کرد، دەستەکانت بەرزکەرەوە، هێندە بەڕەقی ڕەفتارم لەگەڵ بەیکەر کرد، هیچ چارەیەکی تری نەبوو جگەلەوەی بە بێ تەلەکەوە دەست بەرزبکاتەوە، لەبەر خۆمەوە دەمنەڕاند و هەرچۆنێك بێت تێمگەیاند کە بێ تەلەکەش بخاتە سەر مێزەکە .

بەیکەر خەریك بوو بێ تەلەکەی دەخستە سەر مێزەکە، لە بێ تەلەکەوە دەنگێك هات، سودابەبوو گووتی : تاچەند چرکەیەکی تر، تەلەفۆنە ڕەنگ خۆڵەمێشیەکەی سەر مێزی بەڕێوبەری گشتی زەنگ لێدەدات دوریان قسەت لەگەڵ دەکات .

گووتم : ئاگادارت دەکەمەوە فێڵێك لەکاردا نەبێت ، چونکە ئێستا کۆلۆنێل بەیکەر بارمتەی منە .

گووتی : گاڵتە دەکەیت !.

گووتم : هەتا ئێستا گاڵتەم لەگەڵ کەس نەکردووە !.

گووتی : هەرئێستا دێمە سەرەوە.

گووتم : هەركەسێك بێتە سەرەوە تەقەی لێدەكەم، تەنانەت تۆش، سودابە كە ئیتر بەڕاستی ترسابوو بە دەنگێكی لەرزۆكەوە گووتی : ئەگەر كۆڵۆنێل بەیكەر نەتوانێت لەگەڵ ژێردەستەكانی قسەبكات و فەرمان نەكات بەسەریاندا هەموومان دەكەوینە داوەوە .

گووتم : ئەڵبەتە جگە لە من ، هەروەها ئەگەر دوریان پەیوەندی نەكات من كاری خۆم دەكەم ، هەر لەو ساتەدا زەنگی تەلەفۆنە خۆڵەمێشیەكە لێیدا و هەڵم گرت، دوریان بوو گووتی : سوپاست دەكەم كە متمانەت بەمنە جەعفەر بڵێ بزانم چی بووە دەتوانم چیت بۆ بكەم ؟.

گووتم : ئەمانە دوو كەسیان كوشتووە. نۆ كەسیشیان دەستبەسەركردوە، چالاكی چاودێری و گواستنەوەی كوژرا و دەستبەسەرەكانیان خستۆتە ئەستۆی من، قسەكان پەكناگرێتەوە دەبێت من ئەوان لێرە ببەمە دەرەوە و دواتریش دەڵێن هەتا خۆرئاوابوون كاتت هەیە. ئەمانە تەنانەت هەموو گێل و نەزانێك دەزانێت بەمانای دانیشتن بەدیار دەستگیركرانەوە دێت. من بەیكەرم بە بارمتە گرتووە هەتا لەگەڵ تۆدا قسەبكەم .

دوریان بە پەشۆكاویەوە گووتی : بۆچی بەیكەر ؟ ئەگەر ئەو نەبێت هەموو كارەكان تێك دەچێت ، بهێڵە لەگەڵ بیكەر قسەبكەم .

گووتم : تۆ متمانەت بەو هەیە ؟.

گووتی : دیارە كە متمانەم پێ ی هەیە !.

گووتم : كەواتە تەلەفۆنەكەی پێدەدەم .

نزیکەی دوو بۆ سێ خولەك پێکەوە قسەیانکرد، لەو ماوەیەدا سەرنجم خستبووە سەر بیکەر، کاتێك قسەکانیان تەواو بوو بەیکەر تەلەفۆنەکەی لەسەر مێزەکە دانا و ئاماژەیەکی کرد، هەتا هەڵی بگرم ، لەوکاتەدا دوریان پێکەنی و گووتی : سەیرکە جەعفەر ئەگەرچی تۆ هەندێ ڕۆڵی پارتیزانیت نواندووە ، بەلاّم بەیکەر دەڵێت تۆ تەنها کەسێکی مێشکت کار دەکات، لێرە بەدواوە تەنها پشت بەتۆ دەبەستێت. حەزی لە گورج و گوڵی و شێوازی کارکردنتە ، هەتا کاژێرێکی تر منیش دێم بۆ لات ئەڵبەتە چالاکیەکە بەباشی ئەنجام دراوە ، بەلاّم دەرکردنی کەل و پەلی ناو مۆزەخانەکە بە ڕۆژی ڕووناك کارێکی مەحاڵە، دەبێت چاوەڕێ بین هەتا دونیا تاریك دەبێت، سودابە نەیزانیووە ئەمەت بۆ ڕوون بکاتەوە، بەیکەر و ئەمریکیەکان و نزیکەی پەنجا کەسێکی تر هەتا خۆرئاوا بوون لەوێ دەمێننەوە

گووتم : تۆ بەڵێن لەسەر ئەمانە دەدەیت ؟

گووتی : چ بەڵێنێك لەوە باشتر و چاکترە کە خۆشم خەریکم دێم بۆ لات .

گووتم : هیوادارم ، تەلەفۆنەکەم داخست و بە زمانی فارسی داوای لێبوردنم لە بەیکەر کرد، ڕوخساریم ماچ کرد و ئەویش بە خۆشحاڵی و خەندە ڕووەوە چەند جارێك دای بە پشتمدا و دەیگووت : ئۆکەی ،جفری. ئۆکەی، جفری .

دوای ئەوەی بیکەر لە ژوورەکە چووە دەرەوە دیسانەوە زەنگی تەلەفۆن لێی دایەوە، هەڵم نەگرت چەند چرکەیەك دواتر سودابە بە بێ تەلەکە گووتی : دوریانە هەڵی گرە .

هەڵم گرت، دوریان گووتی : هێندە دەسەپاچە بووم هەر نەمپرسی کام یەك لە کوڕەکانت دەوێت .

گووتم : خۆشم لە بیرم چوو. بەئەرك نەبێت تەلەفۆنێك بۆ قطب زادە بکە و پێ ی بڵی چایچی و ئەحمەد ی و جەمشید نعمانی و تەقەوی نیا بنێرێت بۆ ئێرە .

دوریان بە پێکەنینەوە گووتی : یارانی لیبیا .

گووتم : دروست تێگەیشتی، تەنها ئەوانە پیاوی کارن ، بەڵام ئەگەر تۆ بتەوێت کەمێك لە ڕووی لایەنەی بەرامبەرمان کەم بکەیتەوە، خراپ نییە بە ئەبو شەریف بڵێیت نزیکی خۆرئاوابوون سەرێك لەم ناوە بدات .

دەنگی پێکەنینی دوریان بەرز بوویەوە و گووتی : تۆ شەیتانێکی گەورەیت ، مێشکت باش کاردەکات چاوەڕێ بە دوای نیو کاژێری تر دەتبینمەوە .

دوای نیو کاژێر دوریان مەککرەی گەیشت. وەك هەمیشە شۆخ و شەنگ و دڵڕفێن بوو، لەناو هاوڕێکانی و کوژرا و دەستبەسەرکراوەکان و لەبەر چاوی بیکەر بۆ ماوەیەك باوەشی پێداکردم ، تەنانەت لیوەکانیشی ماچ کردم .

کاژێر نزیکەی ١ ی دوای نیوەڕۆ بوو چایچی و ئەحمەدی و نعمانی و تەقەوی نیا بە جل و بەرگی فڕۆکەوانییەوە گەیشتن. ساتی هاتنە ژوورەوەیان شادی بەخش بو بۆ من .

بێئەوەی هیچ گرنگی یەك بدەین بە دۆخی ئەو کەسانەی کە بۆ چەندین کاژێر، بە دەم و دەست بەستراوی لەسەر زەوی ڕاکشابوون، بەبێ گوێدانە

ئەو دوو تەرمەی بە شێوەیەکی سامناك لەلای مێزەکەوە کەتبوون و بێ ئەوەی هیچ کاریگەری لەسەر دەرون و ڕۆحیەمان دروست بکات، دەستمان کرد بە ماچکردن و لە ئامێزگرتنی یەکتری و هەواڵپرسی ، ئەوانم بە بەیکەر ناساند ، دواتر هەمووماڹ بە ئامادەبوونی دوریان کۆبونەوەیەکی نیو کاژێریمان ئەنجامدا . هەتا بزانین چۆن چۆنی بەرنامە دارێژی بۆ گواستنەوەی کوژرا و دەستبەسەرەکان بکەین .

بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، کۆڵۆنێل بەیکەر گوێ ی بۆ سەرەنج و پێشنیارەکانی ئێمە دەگرت ، تەنانەت دژی یەك ڕا و بۆچونی ئێمە نەوەستایەوە. لەدوای کۆبوونەوەکە دەستمانکرد بە ئامادەکاریە سەرەتاییەکان بۆ کارەکە، سەرەتا بە داپۆشینی تەرمەکانمان دەستمان پێکرد . لەکاتی کارەکەدا بە برادەرانم گووت ؛ وابڕیارە کەمێك ئەبو شەریف چاوترسێن بکەین ، لەبەرئەوە کاتێك ئەم دێوە بێ شاخ و دەمە هات دەبێت هەموو کارەکان بە توندوتیژی ئەنجام بدەن، دوریانیش هاتە ناو بابەتەکەوە و بەپێکەنینەوە برادەرانی هاندەدا .

کاژێر ٤ ی دوای نیوەرۆ، سودابە بە بێ تەل ئاگاداری کردینەوە کە کابرایەکی ڕیشنی لاوازی سەر و سیما ناشرین، هەواڵی دوریان مەکگرەی دەپرسێت، هەمووماڹ دەستمانکرد بە پێکەنین، گوتمان دیارە ئەبو شەریفە ، چونکە لەناو ئەوکەسانەی دەوروبەری خومەینییان دابوو، ئەبو شەریف لەهەموویان سەر و سیما ناشرینتر بوو .

دوریان گووتی : من دەچمە خوارەوە و کەمێك لە چاوەڕوانیدا دەیهێڵمەوە، وەك ئەوەی بڵێی جەنابی فەرماندە زۆر گرفتارن .

دیسان هەموومان دەستمان کرد بە پێکەنین، دوریانیش بە خراپی نەدەزانی لەم یاریە گاڵتە ئامێزەدا ڕۆڵێکی هەبێت ، ڕۆشت هەتا کەمێك بە ئەبو شەریف ڕابوێرێت، نزیکەی بیست خولەکی خایاند هەتا دەنگ لە بێ تەلەکەوە هات.

دوریان گووتی : بەڕێز ئەبو شەریف لێرەن .

گووتم : دە خولەکی تر پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە و دامخست ، لەدوای دوو سێ جار دوبارەکردنەوە ، لە کۆتایدا ئەبو شەریف لەگەڵ دوریان هاتنە سەرەوە، هەرکە چاوی بە نۆ کەسی دەستبەسەری دەست و پێ بەستراو و دوو تەرمی داپۆشراو کەوت، ئەبو شەریف سەراپا ترسی لێنیشت دەست و پێ ی کەوتە لەرزین و قوڕگی گیرا .

ئەمەش لێرەدا بڵێم، ئەوکەسانەی بەتایبەتی ئەبو شەریف ئەو ڕۆژانە لە دەوروبەری خومەینیدا بوون، چ مێزەر بەسەرەکان چ ئەوانی تر، پڕوپاگەندەی ئەومیان دەکرد دەورەی پارتیزانیان لە ئۆردوگاکانی فلسطین تێپەڕاندووە. ئەو زانیاری و فێرکاریانەی وەریانگرتبوو زۆر جیاواز بوو لەوەی ئێمە لە سوریا و لیبیا بینی بوومان ، لەڕاستیدا، وەك ئەوە وابوو، ئێمە خولێکی سەربازی لە جۆری ڕوسیمان تێپەڕاندبێت، ئەوانیش خولێکیان بینی بوو کە یاسر عەرەفات بۆی ڕێکدەخستن، لە ئاستی منداڵ بازاڕیدابوو، زیاتر لایەنی نمایشی هەبوو، هەتا لەبەرامبەر فێرکردنیان هەر یەکێکیان بڕێك پارە وەربگرێت.

بۆ ئەوەی ڕادەی ژیری و هەست و نەستی ئەبو شەریفتان نیشان بدەم، کە دواتر بوو بە فەرماندەی سوپای پاسدارانی خومەینی، ئەوەندە بەسە بڵێم

هەرکە هاتە ژوورەوە و بینی نۆ کەسی دەم و دەست بەسراو و دوو تەرمی داپۆشراو لە بەردەستماندایە، خۆی بە پێ ی خۆی هاتە مۆزەخانە ئێرانی دێرین، بەمنی دەگووت ئەو کەلوپەلانەی فەرمانتان کرد بوو ئامادەی بکەین، هەتا چەند ڕۆژێکی تر دەهێنینە خزمەتان .

لەو کاتەدا بە بەتوندی و تورەییەوە وەڵامم دایەوە، گووتم : لەسەرەتاوە دەمزانی ئەم منداڵ و پاڵانەی تەهران، ئازایی و بوێری ئەم کارە پیاوانەیان نیە. دووبارە تێنەگەیشت پیدانی وەها لیستێك بۆ ئەوە بوو، ئەو بەرپێزانە بەکاری ترەوە سەگەرم بکەین، بیانرێرین هەتا بە هێڵەك ئاومان بۆ بهێنن ، ئاو هێنانێك کە دەبوو ئەبو شەریف جارێکی تر چاوەڕێ ڕوودانی بکات، ئەویش لەهەمان ڕۆژ و هەمان کاژێر.

نزیکەی نیو کاژێر ئەبو شەریف و تەقەوی نیا، لەگەڵ دەستبەسەر و کوژراوەکان لەهەمان ژوور مانەوە.

من و دوریان، ئەحمەد ی و چاپچی و نعمانی بە دوای بەیکەر کەوتین، بە پێشنیاری من بڕیار درا چالاکیەکی تری ساختە، لە ژێر چاودێری چاپچی بەسەر ئەبو شەریفدا بدەین ، بۆیە داوامان لە ئەبو شەریف کرد، هەتا کاژێر ٨ ی شەو، واتە کەمتر لە سێ کاژێر خانوویەك دوو دەرگای چوونە ژوورەوەی هەبێت و پێنج ژووری تێدابێت، لە نزیکی بنکەیەکی سەربازی ئامادە بکات، کە تاڕادەیەك کارێکی مەحاڵ بوو .

کاتێك ئەبو شەریف گوێ ی لەم داواکاریە بوو، زۆری نەمابوو خۆی بدات بە دەستەوە. فەرمانەکانی دواتر زۆر لەمە بێبەزەیانەتر بوو .

جگەلە هاشمی ڕەفسەنجانی، مۆڵەتمان نەدا پەیوەندی بەکەسی ترەوە بکات. چایچی بێ تەلێکی پێشکەوتووی پێ بوو، لەگەڵ ئەبو شەریف لە مۆزەخانەکە چوونە دەرەوە ، چونکە خەریك بوو وردە وردە دونیا تاریك دەبوو، ئێمەش سەرگەرمی ئامادەکاری بووین بۆ ئەنجامدانی سەرەکیترین بەشی ئۆپەراسیۆنەکە، نیو کاژێر دواتر، لە ژێر ڕۆشنایی ئەو ڕاپۆرتانەی سودابە بە بێ تەل پێ ی ڕادەگەیاندین، دیسان هاتوچۆ لە هەردوو شەقامی سەبت و قوام السلطنە ڕاگیرا. ئێمەش توانیمان بەپەلە دەستبەسەر و کوژراوەکان، بگوازینەوە بۆ ناو یەکێك لە زیلەکان ، ئەمریکیەك جل و بەرگی ئەفسەری سوپای لەبەرکرد و لە پشتی سوکان دانیشت. ئەحمەدیش لە تەنیشتی.

من و دەستبەسەرەکان و دوریان و سودابە و نعمانی، لە دوای زیلەکەوە سوار بوین ، تەقەوی نیاش سواری مارسیدر بنزەکە بوو، جیاواز لە ناڕاستەی ئێمە بەڕێکەوت، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبوو پارێزگاری لە مەودای نیوان بێ تەلەکان بکات، بۆ ئەوەی لەکاتی گەیشتنی ئێمە بە جێگای دیاریکراو، ئەوانیش پەیوەندی بە گروپەکەمانەوە بکەن.

کاژێر شەش و سی خولەك، چوینە ناو گەراجێکی کۆن لە سێ ڕیانی ئەمین ، بەفەرمانی دوریان بێ ئەوەی دابەزین، لەچاوەڕوانیدا ماینەوە. ئەم وەستانە نزیکەی نیو کاژێری خایاند. کاژێر حەوت و چەند خولەکێك دیسان بەرەوە جێگایەکی نادیار بەڕێکەوتین، نزیکەی کاژێر ۸ ی شەو بوو، چایچی بە بێ تەل پەیوەندی پێوەکردم و گووتی : هێشتا ئەبو شەریف نەیتوانیوە کارەکە ئەنجام بدات ، چەند جێگایەکی دۆزیەوە و ڕۆشتین ، بەڵام بە هیچ شێوەیەك گونجاو نەبوو بۆ کارەکەی ئێمە.

دەمزانی ئەبو شەریف گوێ ی لەدەنگمە، بە توڕەییەوە وەڵامم دایەوە گووتم : ئەم بێ نرخی لێنەهاتووانە هیچ کارێکیان لەدەست نایەت، کاژێرێکی تر کاتتان پێدەدەم هەتا کارەکەتان بە ئەنجام دەگەیەنن، ئەگەر نا بەشی دووەمی پلانەکە جێبەجێ بکە، لەماوەی ئەم کاژێرەدا هەر پانزە خولەکێك جارێك، لە ئاکامی کارەکان ئاگادارم بکەرەوە، دواتر پەیوندیەکەم پچڕاند .

هەمووومان، بەتایبەتی چایچی بەباشی دەمانزانی، ئەمکارە کاریگەریی دەبێت، لە بچووککردنەوە و بە کەمزانینی ئەبو شەریف و داروودەستەکەی ، ئەگەرنا دۆزینەوەی وەها شوێنێك کە جێگای متمانە بێت ئەویش لەو بارودۆخ و ماوەکەمەدا شتێکی مەحاڵە. ئەم جۆرە یاریانە، تەنها بە کەڵکی کوڕە دەورە بینراوەکانی ئۆردوگا فلسطینیەکان دەهات، ئەگەر نا لە پلانێکی پارتیزانیدا، دۆزینەوەی وەها پەناگەیەك، لە جێبەجێکردنی پلانەکە قورستر بوو.

بۆچی ؟ چونکە جێبەجێکردنی بەرنامەی تاڵانکردن و گواستنەوەی کەلوپەلی مۆزەخانەکە، کاژێرێك یان ئەو پەڕی حەوت بۆ هەشت کاژێری دەخایاند ، بەڵام کاتێك بۆ پەناگەیەکی ئارام و بێ مەترسی بگەڕێیت، قسە لەسەر مانەوەیە بۆ ماوەی چەندین هەفتە، کە دەبوو بیر لە لایەنی ئارامی و ئاسایشی بکەیتەوە ، ئامانجی ئێمە تەنها بۆ بچووککردنەوە و بەکەم سەیرکردنی ئەوان بوو ، چونکە ئەوان، عەقڵ و ئەزموونێکی وەهایان نەبوو لەو کارەشدا سەرکەوتووبووین ، هەروەها لەبەر ئەوە، چایچیمان لەگەڵ ئەواندا نارد، هەتا بەهۆی ئەوەوە زانیاریمان لەبارەی شێوازی کارکردن و پەیوەندیە تەلەفۆنەکانیانەوە دەست بکەوێت ، لێی گەڕێن، بابگەڕێینەوە سەر سەردێڕی سەرەکی یادەوەریەکان، پێشنەوەی دەوڵەت قەدەغەی

هاتوچۆی شەوانە ڕابگەیەنێت، لە شەقامە چۆڵەکانی تەهران پارس، چوینە ناو خانویەکی جوان، بەبێ هیچ گرفتێك، تەرمەکانمان بردە ژێر زەمینی خانووەکە، دەستبەسەرەکانیشمان لە ژورێکدا بەندکرد .

ئەحمەدی گووتەنی ئەو کارەی ئێمە تێیدا پسپۆڕی بووین، لەو ساتەدا دەستی پێکرد. ئاومان بەهەریەك لە دەستبەسەرەکاندا، بەنۆبەت ئەوانمان دەبر بۆ تەوالێت، دواتر نانی ئێوارەمان پێدان کە بسکویت و چا و نان و پەنیر بوو.

دواتر بە دەم و دەست و قاچ بەستراوی، ئەوانمان خستە ژێر چاودێر ئەمریکییەك و تەقەوی نیای تازە لە ڕێگا گەیشتوو. ئەوانی ترمان بۆ بڕیاردان لە چارەنوسی دەستبەسەرەکان و بەردەوامی دان بەکارەکانی پەیوەندیدار بە ئۆپەراسیۆنی مۆزەخانەکە، ڕۆشتینە ژورێکی تر ، ئەسڵەن بڕیار نەبوو، دوریان بەشداری لە ئۆپەراسیۆنەکەدا بکات ، بەڵام بەهۆی ڕوداوەکەی بەیانی یەوە، ناچار بوو، بێتە ناو چالاکیەکەوە، وەك فەرماندەیەکی ڕاستەقینە ڕەفتاری دەکرد. ئەو ڕەفتارەی هەمووەمان زۆر بەتوندی پێویستیمان پێی بوو .

کاژێر ١١ ی شەو، سەرەڕای ئەوەی قەدەغەی هاتوچۆ ڕاگەیەنرابوو، قطب زادە و سەید ئەحمەدی خومەینی و کەسێکی تر هاتن بۆ ماڵەکەی تەهران پارس، بە بێ درەنگ قسە لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکەوە دەستی پێکرد ، بەشداربوانی کۆبونەوەکە ئەمانە بوون ( من ، کوڵۆنێل بەیکەر ، دوریان ، سودابە ، سەید ئەحمەدی خومەینی ، قطب زادە) هەروەها ئەو کەسەی لەگەڵ سەید ئەحمەد هاتبوو. کۆڵۆنێل بەیکەر ویستی قسەبکات ڕووم لە

قطب زاده کرد و گووتم : لەوانەیە هەمووتان ئەم بەڕێزە بناسن ، بەلأم من وەها فێربووم، هەتا کەسێك نەناسم، لەگەڵی ناچمە هیچ کۆبونەوەیەکەوە و کاری لەگەڵ ناکەم، پرسیارەکەم ئەمەیە ئەم کەسە کێ یە ؟ بە چ هۆکارێك دەبێت لەوەها کۆبونەوەیەکی گرنگ ئامادەبێت، تیشکی چاوەکانی دوریان و قطب زادە وەك ئەوە وابوو، لەکاتی خۆیدا قسەمکردوە، سودابە خەریکی وەرگێڕانی بوو بۆ بەیکەر، سەید ئەحمەد وەلأمی دامەوە و گووتی : ئەوان بەڕێز ( کۆلۆنێل تەوەکولی )ن جێگای بڕوا و متمانەی هەموومانە .

لەوکاتەدا، بەشێوەی تورەی و تۆران، لەسەر مێزی کۆبونەوە هەستام و گووتم : نە ئەوان دەناسم و نە پێشتریش بینیومن، نە ئامادەم بە بوونی ئەوان، لەم کۆبونەوەیەدا یەك وشە لەبارەی کارەکانەوە بڵێم

تەوەکولی ڕەنگ بە ڕوویەوە نەما، دەست و دەمی دەلەرزی، تەنانەت پێکەنینە درۆینەیەکانیشی نەیدەتوانی ئەو بارودۆخەی تێی کەوتبوو، بشارێتەوە. ئەو کاتەی ویستم لە ژوورەکە بێمەدەرەوە کۆلۆنێل بەیکەر لە جێگای خۆی هەستاو بەرەوە لای من هات، دەستی بە قسەکردن کرد و دوریان بەپەلە بۆی وەردەگێڕام، دەیگووت : تۆ لەسەر حەقی، هەڵەکە لە منەوە بوو، پێمنەناساندی. کۆلۆنێل لەم چالاکیەدا، زۆر هاوکاری کردین، دابینکردنی زیل و پێداویستیە سەربازیەکانی تر و جلوبەرگی سەربازی ئەو بۆی دابینکردین، ئەم خانووەش هەرئەو بۆی ئامادەکردوین. لەناو سوپادا نفوزێکی زۆری هەیە ئەگەرچی بەرەسمی کارێکی ئەوتۆی لە ئەستۆدا نییە.

دوریان دەستی گرتم، دوبارە لەسەر مێزەکە دانیشتم. ئەگەرچی کۆلۆنێل تەوەکولی ڕەنگی پەڕی بوو گووتی : بە گوێرەی ئەوەی، ئێوە پارتیزانێکی

کارامەن، مافی خۆتانە ، چونکە شۆڕش و شۆڕشگێڕان پێویستیان بە وەها ڕێکخستن و نیزامێك هەیە.

منیش داوی لێبوردنم کرد لەوەی ڕەفتارم توند بووە بەرامبەری ، خوشحاڵترین کەسی کۆبونەوەکە دوریان و قطب زادە بوون، ئەو کۆبونەوەیە، هەتا بەرەبەیان درێژەی کێشا، کۆلۆنێل بەیکەر گووتی : بەگشتی ١٦ سندوق لەهەردوو مۆزەخانەکە هێنراونەتە دەرەوە، پڕن لە کەلوپەلی سوك و گران بەها بەپێ ی بۆچونی کارناسان، کە چەند مانگێك لەوە پێش لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە، نرخەکانیان زیاتر لە ٤٠٠ ملیۆن دۆلارە .

دواتر، بڕیاردرا لەبارەی بەردەوامی لەسەر چالاکیەکیەکان. بەیکەر پێشنیاری کرد لەبەر ئەوەی کاری بڕین و تالآنکردنی مۆزەخانەکە بەنهێنی نامێنێتەوە، بەزووی ئاشکرا دەبێت. پێویستە خومەینی بەیاننامەیەك دەربکات و کارەکە بخاتە ئەستۆی شا و لایەنگرانی. لە بەیاننامەکەدا زیاتر فەرەح پەهلەوی و ئەشرەف پەهلەوی و شەهرام پەهلەوی نیا بکاتە ئامانج .

هەروەها بیکەر پێشنیاری کرد، هەتا کاتی گواستنەوەی ١٦ سندوقەکە بۆ دەرەوەی ئێران، دەبێت سندوقەکان لە ژێر چاودێری من و گروپە کەمدا بێت .

دواتر بابەتی بارمەت و کوژاوەکان هاتە پێشەوە، هەندێکیان لەنێوانیاندا سەید ئەحمەدی خومەینی بڕوای وا بوو، بەو بارودۆخەی تێیکەوتووین، دەبێت ئەو نۆ کەسە هەر ئەمشە و لەناوبرێن. دواتر هەموویان لە جێگایەدا بشارینەوە.

من و کۆلۆنێڵ تەومکولی و دوریان، دژی ئەمکارە بووین. بەتایبەتی من حەزم دەکرد، ئەوان بەزیندوی بمێننەوە، بۆئەوەی ئەگەر توشی گرفتێك یان ڕووداوێك بوین، وەك بارمتە سودیان لێوەربگرین. لە کۆتایشدا ڕازی بوون بە پێشنیارەکەی من ، بەڵام بابەتی تەرمەکان شتێکی تر بوو، جگە لە دەردی سەر هیچ سودێکی بۆ ئێمە نەبوو ، بەیکەر دەیگووت : بە ئاگاردار بوون لە بارودۆخەکە، لەوانەیە دەوڵەت هەواڵی مۆزەخانەکان بلاّونەکاتەوە، بەلاّم هەرچۆنێك بێت، ئەم دەستبەسەرانە خێزان و بنەماڵەیان هەیە. ئێستا چەندین کاژێرە لە چاوەڕوانی و نیگەرانیدان و بەشوێندا گەڕانیان گرفتمان بۆ دروستدەکات ، لەبەر ئەوە، هەرچی زووترە، دەبێت هەم تەرمەکان لەناو ببرێن ، هەم هەرچی زوترە چارەنووسی دەستبەسەرەکانیش ڕونببێتەوە .

لەئاکامدا دوریان بابەتی تەرمەکانی چارەسەرکرد و گووتی : ئەگەر هادی غەففاری، فەرمانێك لە خومەینیەوە وەربگرێت، ئێمە تەرمەکان بە ئۆتۆمبێلی فریاکەوتن، هەتا نزیکی دەرگای چونە ژوورەوەی گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا دەبەین، لەوێش هادی غەففاری تەرمەکان بەناوی شەهید و کوژراوی دەستی هێزە چەکدارەکانی دەوڵەتەوە بناسێنێت و بەخاکیان بسپێرێت .

بەڕاستی پێشنیارەکەی دوریان شاکار بوو. پێشنیارەکەی وەك خۆی جێبەجێکرا، لەدوای خۆپیشاندانەکەی بەرامبەر ژاندارمری، کەهەر لەو ڕووداوەدا ژەنراڵێکی سوپای شاهنشاهی تێدا کوژرا تەرمەکان ڕادەستی هادی غەففاری کرا، ئەویش بەناوی شەهید و کوژراوی دەستی فەرمانده‌کانی شا ، پێشکەشی کۆمەڵگای کردن .

کاژێر ٨ ی بەیانی، لەداوی بەکۆتاهاتنی کۆبونەوەکە، بڕیاردرا من و بیکەر و دوریان بچین بۆ وەرگرتنی ١٦ سندوقی چالاکیەکە، دەبوو، قطب زادەش ئۆتۆمبێلێکی فریاکەوتن بنێرێت بۆ گواستنەوەی تەرمەکان، لەداوی ئەوە جگە لە دەستبەسەرەکان و پارتیزانەکانی من، نەدەبوو کەسی تر لەو خانووەدا بمێننەوە، لەبەرچاوی هەموویان بە پارتیزانەکانم گووت ؛ هەرکەسێکی نەناسراو ویستی بێتە ژوورەوە مۆڵەتی تەقەکردنتان پێدراوە .

کاتێك من و بەیکەر و دوریان خانووەکەمان بەجێ هێشت، تەنها سودابە و نعمانی و تەقەوی نیا و ئەحمەدی لە خانووەکەدا مانەوە.

ئەحمەدیم وەك فەرماندە لەبری خۆم دانا، لە جادەی چل و پێنج مەتری نارمەك بە ئاڕاستەی قولهەك ڕۆشتین و لەوێوە خۆمان گەیاندە ماڵی دوریان. هەر شانزە سندوقەکە لەوێ بوو. بە ئاگاداری و وریایەکی زۆرەوە، سەرگەرمی وەرگرتنی سندوقەکان بووم . کێشیان زۆر قورس نەبوو، بەڕای من دەکرا، هەر شانزە سندوقەکە لە یەك سندوقدا کۆبکرانایەتەوە ، بەلاَم وەها پێچرابوونەوە کە هیچ گومانێکم لەوە نەبوو، دوێنێ هەندێك شوێنەوارناس و کەسی بەئەزمون لەبواری پێچانەوەی شوێنەواری لەناو ئەو سوپا ساختەیەدا بوون .

لەو ڕۆژگارەدا، سەروکارێکم لەگەڵ ئەو شتانەدا نەبوو، هەموویان جگەلە شتانێکی بێکەڵکی وەك دەفر و گۆزەی شکاو چەند پارچە ئاڵتونێکی سواو وێران و چەند دەفتەرێکی خەت خەت و چەند وێنەیەك هیچی تر نەبوون، نەتەنها شانزە ملیۆن دۆلار، بەڵکۆ بەهیچ شێوەیەك بایەخی ١٦ هەزار تومانیش نەبوو .

با لێرەدا ئەمەش بڵێم شێخ محەمەد منتظری، ڕاسپێردرا ئەم کەلوپەلانە بگوازێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات، بەهۆی ئەو پەیوەندیەی لەگەڵ عبدالسلام جلود پیاوی ژمارەی دووی لیبیا هەیبوو، لەرێگای فڕۆکەخانەی مهرئابادەوە، هەر شانزە سندوقەکەی بە فڕۆکەی لیبی نارده دەرەوەی ئێران و بۆ لیبیای ڕەوانەکرد. لەم دوایانەدا لەکاتی سەفەرکردنم بۆ لیبیا، لەو هاوڕێیانەی لەوێ هەمبوو، گوێم لێ بوو، هەندێ لەو کەل و پەلانە براون بۆ خودی قەزافی، هەندێکی تریان بیلی کارتەر برای جیمی کارتەر کە ڕاوێژکاری قەزافی بوو، گواستبویەوە بۆ ئەمریکا.

شتێکی تر ماوە بیڵێم، ئەڵبەتە هیچ بەڵگەیەکیشم لەبەردەستدانییە بۆ ئەم قسەیەم ، بەڵام دڵنیام لە چالاکیەکەی مۆزەخانەکان زیاتر لە شانزە سندوق، لە کەلوپەلی مۆزەخانەکان لەلایەن ئەمریکیەکانەوە دزراون، ئەوان بەهۆی فڕۆکەکانی خۆیانەوە، لەو ڕۆژانەدا لەگەڵ کەلوپەلەکانی خۆیاندا ئەوانیشیان گواستوەتەوە بۆ دەرەوەی ئێران.

دوای وەرگرتنی هەر شانزە سندوقەکە، لەکاتی ماڵئاوایدا بیکەر پیرۆزبایی لێکردم و هیوای بۆ خواستم، بەو تواناو ووزەیەی کە هەمە، داوی سەرنگوم بوونی دەوڵەتەکەی شا، بە پلە و پایەیەك بگەم .

کاتێك بەیکەر لەماڵەکەی دوریان چووە دەرەوە، بە دوریانم گووت ئیتر ئەو نابینمەوە ؟

دوریان پێکەنی و گووتی ؛ هەرکاتێك بتەوێت ، مەگەر نازانیت، بەیکەر هاوسێ ی دیوار بە دیوارمانە و پاراستنی منی لە ئەستۆدایە ، دواتر دوریان باسی ڕووبەڕووبونەوە توندەکەی منی بەرامبەر بە کۆلۆنێل تومکولی کرد

پاشان گووتی ؛ وەرە بڕۆین بخەوین، ئەگەرنا ئەم ماندبوونە بەزیندویمان ناهێڵێتەوە، هەتا شاهیدی ڕووخانی دەوڵەتەکەی شا بین .

گووتم: منیش حەزم لەخەوە ، بەڵام حەزدەکەم، سەرێك لە خانووەکەی تەهران پارس بدەم بۆئەوەی هەم خۆم خەیاڵم ئاسودەبێت، هەم برادەرانیش کەمێك پشووبدەن .

دووریان گووتی: لەوانەیە هەندێ کار بێتە پێشەوە، لێرەبین باشترە. بەدڵنیایەوە ئەوان بەنۆبەت پشووی خۆیان وەردەگرن، من و تۆش کاژێر ٤ ی دوای نیوەڕۆ دەچین بۆ ئەوێ .

وەك هەمیشە، خۆم دابەدەست قسەکانی دوریانەوە، بەخێرایی چوومە حەمام و هەتا ماندوێتی و چڵکی لەشم ڕامالّم، سەرگەرمی خوشوشتن بووم، لەناکاو دەرگای حەمام کرایەوە، دوریان تەلەفۆنەکەی لەدەستدابوو، بۆی هێنام و گووتی: ئیمام دەیەوێت قسەت لەگەڵدا بکات .

دەستبەجێ بەلوعەکەم گرتەوە، دوریان خاولیەکی بۆ هەڵدام و خۆم وشککردەوە و دەستم بە قسەکردنکرد لەگەڵ خومەینی ، پیرۆزبایی لێکردم و هیوای خواست من و پارتیزانەکانم کە کۆڵەکەی ئیسلامین بەزووی سەردانی بکەین .

پاش ئەوەی تەلەفۆنەکەم داخست، دوریانی دای لە قاقای پێکەنین و ئاماژەی بە ڕووتیەکەی من کرد و گووتی ؛ بینیت تۆش ڕووت بویتەوە و شەرمیشت نەکرد. لەوکاتەدا بیرم هاتەوە، لەو هەموو ماوەیەدا، کە سەرگەرمی تەلەفۆن بووم، بەڕووت و بێ بەرگی لەبەرامبەر دوریاندا

وەستاوم. گووتم : بوهتان ناچێتە ژێر گڵەوە، دەرگاکەم داخست . کاتێك گەڕامەوە بۆ ژووری نوستنەکەم، دوریان بەڕوتی لەسەر سیسەمەکەم ڕاکشابوو. بەشێوەیەك بوو دڵڕفێن و قەشەنگ، هەرکە باوەشی بۆ کردمەوە، ئیتر ئارامم لێبڕاو بەخێرایی چوومە باوەشیەوە، جیا لەو هەموو ترس و خەیاڵەی لەو ژنە قەشەنگ و گوماناویە هەمبوو، پەیوەندی عاشقانەمان دەستی پێکرد.

لەگەڵ دوریان بەرەو ماڵەکەی تەهران پارس بەڕێکەوتین. بێ تەلەکە دەنگێکی لێوەهات و چایچی بە دەنگێکی نیگەرانەوە گووتی : لەهەر شوێنێکن خێرا خۆتان بگەیەنە تەهران پارس !.

گووتم : لەڕێگادایین، تا نیو کاژێری تر دەگەینە ئەوێ ، بەڵام بڵێ چی بووە؟

چایچی گووتی : نیو کاژێر لەمەو بەر هادی غەفاری لەگەڵ شێخ عەلی ئەکبەری ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف بۆ وەرگرتنی ئەو دوو ئامانەتیەی بە پەردەوە پێچرابوونەوە هاتن بۆ ئێرە، هەموو شتێك ئامادەبوو ، بەڵام لەناکاو ڕووداوێك ڕوویدا، دەبێت بە خێرایی خۆتان بگەیەنە ئێرە .

پێداگیریەکانی من و دوریان، لەسەر ڕونکردنەوەی زیاتر لەبارەی ڕووداوەکەوە، بێ سود بوو. تەنانەت بۆ ساتێك وا گومانمان برد، نەبادا خانووەکەی تەهران پارس ئاشکرابوبێت، خۆپارێزی چایچی لە ڕوونکردنەوەی زیاتر، لەوانەیە لەبەر ئامادەبوونی کاربەدەستانی حکومەتەکەی شا بێت، لەو دەوروبەرەدا ، بەڵام هەردوکمان ئەم گومانەمان وەلا نا و دوریان گووتی : لەوانەیە ئەبو شەریف پەنێکی دابێت ، واش دەرچوو .

کەمتر لە نیو کاژێر خۆمان گەیاندە خانووەکەی تەهران پارس، هێشتا ئۆتۆمبێلە فریاکەوتنە ڕەنگ سپی یەکە لە حەوشەکەدا بوو. برادەران چاودێریان لێدەکرد، ئەحمەدی زیاد لە پێویست توڕەبوو بوو بەبێ ئەوەی ڕوونکردنەوەیەك بدات، من و دوریان بەرەو ژووری نانخواردن برد. یەکەمین دیمەنێك کە بینیم تەرمی سێ کەس لە دەستبەسەرەکان بوو، لەسەر زەوی کەوتبوون و هێشتا خوێنیان لەبەر دەڕۆشت .

چایچی بە یوزی یەکەی، غەفاری و ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف خستبووە ژێر چاودێریەوە. کەشێکی ترسناك باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا بوو، بە بێ ویستی خۆم و بەخێرایی یوزیەکەم لەدەستی چایچی وەرگرت و دوای ئەوەی زللەیەکی توندم لە بنەگوێی وەشاند، بەدەنگی بەرز هاوارم کرد، بێ نرخی و لێنەهاتوویی ئێوەی هیچ و پوچی بێ ناموس، کاری ئێمەی گەیاندوەتە ئێرە. ٢٤ کاژێرە ڕۆشتوون جێگایەکی هێمن و بێ ترس پەیدابکەن، ئێستا سێ ترمی ترتان بۆ زیاد کردم ، قسەیەکی کاریگەر بوو ڕەنگی بەڕوویانەوە نەهێشت. هەتا ئەبو شەریف ویستی دەمی بکاتەوە بە پشتە دەستی ڕاستم کە یوزیەکەم پێگرتبوو، دام بەناو دەمیدا . کەسی دووەم لێدانی دواتری نوشی گیانی کرد، هاشمی ڕەفسەنجانی بوو، دەستبەجێ خوێن بە دەم و ددانیدا هاتە خوارەوە. تەقەوی نیا و نعمانیم بانگکرد و گووتم : دەست و پێ ی ئەم سێ کەسەش ببەستنەوە و بیانخەنە ژێر زەمینەکەوە .

ئەم فەرمانەم، لەماوەی پێنج خولەکدا ئەنجامدرا. گرنگ بوو ئەم کار بەخێرایی ئەنجام بدرێت، هەتا لەکاتی گونجاودا ڕاستی ڕووداوەکەمان بۆ دەرکەوێت .

کاتێك ڕووبەڕووی ڕووداوێکی غافلگیر دەبیتەوە ڕاستەوخۆ ڕووداوێکی تر دروستبکە، هەتا لەکاتی گونجاودا زانیاری لەسەر ڕووداوی یەکەم بەدەست بهێنیت . ئەمەش لە وانەکانی لیبیا فێری بووم

ئێستا نۆبەتی وەستان لەسەر چۆن چۆنی ڕوودانی کوژرانی ئەو سێ دەستبەسەرە بوو ، کۆبونەوەیەکم سازکرد، هەرسێ کوژراوەکە کارمەندی بەشی ئاسایشی مۆزەخانەی ئێرانی دێرین بوون، لەبەرئەوەی کە چەند خولێکی جۆراوجۆریان دیبوو، بە شێوەیەك پەتەکانی دەستیان کردبویەوە، لەکاتی گواستنەوەی تەرمەکان بۆ ناو ئۆتۆمبێلە فریاکەوتنەکە هەوڵیانداوە دەست و قاچی ئەوانی تریش بکەنەوە و هەڵبێن، ڕووبەڕوو بونەوەیەك لەنێوان ئەوان و تەقەوی نیا و سودابە دا ڕوویداوە ، بەڵام لەناکاو ئەبو شەریف خۆی کردووە بە ژووردا، یوزیەکەی لە نعمانی دزیوە و تەقە لەهەر سێکیان دەکات و دەیانکوژێت .

دوریان نیگەرانی دەنگی دەست ڕێژەکە بوو ، بەڵام هەر چونێك بێت چل خولەك بەسەر ڕووداوەکەدا تێپەڕی بوو، هێشتا سەرەنجی کەسی بەلای خۆیدا ڕانەکێشا بوو ، بەڵام بەڕای هەردوکمان مانەوە لەم خانوەدا بۆ چەند ڕۆژێکی تر، هیچ بە قازانجمان نابێت. دەبێت بیر لە پەناگەیەکی تر بکەینەوە ، بە پێشنیاری دوریان، تەلەفۆنم بۆ قوتابخانەی عەلەوی و خودی خومەینی و قطب زادە کرد، دوای گێڕانەوەی ڕووداوەکە و خستنە ئەستۆی ئەبو شەریف و هاشمی ڕەفسەنجانی و دروستکردنی کەشێکی نیگەرانی و ترس لە ئاشکرا بوونی پەناگەکەمان، داوام لە خومەینی کرد هەرچی زوو تر قطب زادە بنێرێت بۆ یارمەتیمان، کاژێرێك دواتر قطب زادە بە

خۆشحاڵی و دەم بە خەندەوە گەیشت ،  گووتی : ئەو گورزەی کە وەشانتان ئەو پیرەپیاوەی باش نیگەرانکرد.

تازە تێدەگات لەگەڵ ئەم گوێرەکانەدا ناتوانێت بە هیچ کوێ بگات، کارێکی باش بوو ، ئێستا با بچین ئەو سێ منالە دەست بەستراوە ببینین، هەتا بزانین کەیفیان چۆنە .

لەوکاتەدا قطب زادە لە خۆشیدا پێیەکانی ئەرزی نەدەگرت، هەرکە چوینە ژێرزەمینەکە، قطب زادە خۆی بە نیگەران نیشاندا و داوای لەمن کرد، بەفەرمانی ئیمام، ئەوان ئازاد بکەم. منیش داوی نیشاندانیی ڕێزێکی زۆر بۆ قطب زادە، گووتم : لەبەرئەوەی بابەتێکی گرنگە مۆڵەت بدەن جارێکی تر پرسیار لە حەزرەتی ئیمام بکەم. پانزە خولەك ئەوانم لەو بارودۆخەدا هێشتەوە و دواتر ئازادمکردن.

دروست لەکاتی خۆرئاوابوون، هادی غەفاری و پێنج تەرم، لەگەڵ دوو لە برادەران لە خانووەکەی تەهران پارس چونەدەرەوە،  بۆ ئەوەی کاروباری شەهیدەکان ڕێك بخەن .

هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف بۆ ئاشت بوونەوە لەوێ مانەوە. لەدوای ئەوەی بەرامبەری کردم هاشمی ڕەفسەنجانی هەرگیز چاوپۆشی لەوکارەی من نەکرد ، ئەگەر من ئەمڕۆ ئاوارە و دەربەدەر و هەڵهاتووم، لەبەر خاتری ئەو کینەیەیە کە ڕەفسەنجانی بەرامبەرم هەیەتی، ئەڵبەتە ئەو ڕووداوی تیرۆرکردنە ناکامەکەشی کە لەلایەن ئێمەوە بەرنامە ڕێژی بۆ کرابوو، لەبیر نەکردووە لە کاتی خۆیدا ئەویشتان بۆ باسدەکەم .

خراپ نییە ئەم ڕاستیەشتان بۆ بگێڕمەوە، یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی کوشتنی قطب زادە ئەم هاشمی ڕەفسەنجانیە بوو ، تەنانەت من بەچاوی خۆم دیتم، دوای ڕەمی کردنی قطب زادە ئەوکەسەی لەبەرچاوی محەمەدی ڕەی شەهری گوللەی کۆتایی نا بە ناوچەوانی قطب زادە، هەر ئەم ڕەفسەنجانیە بوو .

ئەو شەوە، دوای کەمێك گفتوگۆ، کە زیاتر لایەنی ئاشتەوای هەبوو، پێداگیری کرا لەسەر هاوکاری لەنێوان هەردوولا ، هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف لە ئێمە جیابوونەوە، قطب زادە مایەوە ماوەیەکی زۆر بوو، هەلێکی وەها مان بۆ نەهاتبووە پێش، هەتا کەمێك پێکەوە قسەبکەین .

قطب زادە مزگێنی ئەوەی پێداین، خومەینی بڕیاری داوە پێنج سەد هەزار دۆلار بخاتە سەر ئەژمارە بانکیەکەی دوریان مەککرەی و سەد هەزار دولاریش بۆ ئەژمارە بانکیەکەی من لە پاریس .

لەوکاتەدا هەردووکمان پرسیمان بۆچی ؟

قطب زادە گووتی : پاداشتی سەرکەوتنی ئۆپراسیۆنی مۆزەخانەکەیە ، دوریان قاقای پێکەنینی بەرزبوویەوە و بە قطب زادەی گووت : فێربە، تەمەنێکە کار بۆ تۆ ئەکەم، یەك سەنتت پێ نەداوم ، بەلاّم لە بەرنامەیەکدا، ئەسلّەن بڕیار نەبوو بەشداربم، جیفری پێنج سەد هەزار دۆلاری بۆ پەیدا کردم .

قطب زاده به شێوەیەکی دوور لە گاڵتە، درێژەی بەقسەکانیدا و لەبارەی دروستبوون و زیاد بونی ناکۆکی، لەنێوان سەید ئەحمەدی خومەینی و یەزدی و بنی صدر دوا.

داوای لە دوریان کرد زیاتر ئاگاداری ماڵباتی خومەینی بێت و ڕێنمایی و ئامۆژگاریان بکات ، هەروەها گووتی : واهەست دەکەم خومەینی لەدوای ڕووداوە ئابڕووبەرەکەی ئایەتوڵا زادەکان لە پاریس، ئیتر ئەو کەیف و سەفایەی پێشوی بەمن نەماوە، لەهەموو دەرگایەکم داوە، هەتا زیاتر لەگەڵی بەتەنها بمێنمەوە ، بەڵام کاتێك هەلێك دێتە پێشەوە کە بەتەنها دەمێنینەوە، هەوڵدەدات بە هەر بەهانەیەك بێت، یەکێك لەو ڕیشدارانە بهێنێتە ژوورەوە هەتا نەتوانم قسەی لەگەڵ بکەم .

دووریان گووتی : ئاگاداری هەموو ڕووداو بابەتەکانم، هەتا جێگای خۆت دەکەیتەوە لێرە، ناچارین ئەم جۆرە شتانە بەشێوەیەکی کاتی قبوڵبکەین. بە بیرت دەهێنمەوە تۆش لە پاریس، کەم گاڵتەت بەمانە نەکردووە، مەبەستم یەزدی و بنی صدر و تەنانەت مەهدی بازرگان و سنجابیش ، هەرجۆرێك بێت، خۆ ئەمانیش ئاژەڵ نین، دیارە کە پەرچەکرداریان دەبێت. تۆ دەبێت هەتا ئەو جێگایەی دەتوانیت، پەیوەندی ببەستیت لەگەڵ چینە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی ئێراندا، بەنی صدر بەو هەموو نەفامییەوە، ڕۆشتووە بەلای زانکۆکاندا، دکتۆر یەزدیش داروددەستەکەی مەهدی بازرگان پشتگیری دەکەن. تۆش ناتوانیت پشت ببەستیت، بە کچە شۆخ و شەنگەکانی پاریس. کەواتە بڕۆ بەلای بازرگان و دوکاندار و بازاڕیەکانەوە جێگای تۆ دەبێ ئەوێ بێت .

دوای ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی دوریان، قطب زادە پێ ی گووتم ؛ بۆ یەك چرکەش لە دوریان دورناکەویتەوە، تەنها بە فەرمانی ئەو کارەکان ئەنجام بدە ، چونکە بەزووی کاری گرنگیان پێت دەبێت.

ئەو شەوە هەموومان، هەتا بەرەبەیان لە ماڵەکەی تەهران پارس ماینەوە. زۆرترینی کاتەکەمان لە دۆزینەوەی پەناگەیەکی نوێدا بەڕێکرد ، چونکە دوریان لەسەر ئەو باوەڕەبوو، لەدوای ڕووداوەکەی دوێنێ، هیچ دوور نییە هاشمی ڕەفسەنجانی و ئەبو شەریف، وەك سەرچاوەیەکی نەناسراو، لای پۆلیس هەواڵمان لێبدەن و ئاگاداریان بکەنەوە و کارەکە بەگشتی خراپ بکەن .

لە ئاکامدا، بەرەبەیان بە هاوکاری قطب زادە توانیمان خانویەك لە تەهرانی نوێ بدۆزینەوە، بە خێرایی و بەبێ ئەوەی سەرەنجی کەس بەلای خۆماندا ڕابکێشین، دەستبەسەرەکانمان بۆ جێگای تازە لە تەهرانی نوێ گواستەوە. چایچیمان کرد بە سەرپەرشتیاری برادەران، دوای نیوەڕۆ لەگەڵ دوریان گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، لەگەڵ چایچی بڕیارمان وابوو، هەر یەك کاژێر جارێك بە بێ تەل لە بارودۆخەکە ئاگادارمان بکاتەوە .

ئەو شەوە، دوریان بەتەنها جێ ی هێشتم، بەو جۆرەی کە بەیانیەکەی بۆی گێڕامەوە، سەرەڕای ئەوەی ماندوو شەکەت و بێخەو بووە، تەواوی شەوەکەی لە جێگای حەوانەوەی ماڵباتی خومەینی لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکانی ئیمام گوزەراندووە ، کاتێك دوریان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ماندوو هیلاکیە، چەند کاژێرێك لەلای تەلەفۆنەکە دانیشت و سەرگەرمی گفتوگۆ بوو، لەگەڵ ئەم و ئەو چ لەناوەوەی وولات چ لە دەرەوە ، لەکۆتایدا، کاژێر

یازدە و سی خولەکی بەیانی تەلەفۆنەکەی داخست و لە باوەشم دا ڕاکشا و گووتی : ئەگەر ڕووداوی تازە نەیەتەپێشەوە، لەم یەك دوو ڕۆژەدا کاری شا و دەوڵەتەکەی تەواوە و لەکۆتایدا لە DC یەوە بڕیارەکە دەرچووە . دوریان هەرکاتێك بیویستایە لەبارەی واشنگتن و دەوڵەتی ئەمریکاوە بدوێت، تەنها دەیگووت DC ، بەڕواڵەت هەمیشە کۆتا قسەکان DC دەیکات دوریان لەباوەشمدا ڕاکشابوو، هەستم دەکرد حەزدەکات قسەم لەگەڵدا بکات لەلای من بوو ، بەلاّم هەندێ کات، وەها بیروهۆشی بەرەو جێگایەکی تر دەڕۆشت، تەنانەت لەبیری دەچوو چایم بۆ تێکردووە، هەتا بیخواتەوە. لەهەندێ جێگادا، زیاد لە پێویست بەناخی خۆیدا دەچووە خوارەوە و بیری دەکردەوە.

جۆرێك بیرم دەکردەوە، دەیەوێت قسە لەگەڵ کەسێکی تردا بکات کەسێك متمانەی پێ ی هەبێت، ئەو کەسەش لەوکات و شوێنەدا جگە لەمن دەکرا چ کەسێکی تر بێت ؟.

هەوڵمدا لەو دۆخەدا دەریبهێنم، پرسیارم لەبارەی DC یەوە کرد، لەوەی ئەگەر شکست بهێنێت ئەوکات دەبێت چارەنوسمان چی بێت ؟ بۆچی ئەمریکا لە دژی شا وەستاوەتەوە؟ لەکاتێکدا هەمیشە بە ئێمەیان دەگووت نۆکەرانی ئەمریکا ، لە کۆتایدا دوریان دوو پەرداخ ویسکی و سەهۆڵی هێنا و بێدەنگی شکاند و گووتی : چوزانم ! لەوانەیە شکست بهێنین، ئەم جۆرە کارانە هەمیشە بەسەرکەوتن کۆتایی نایەت. دەزانی ! جەعفەر، ئەم دونیایەی من و تۆ هاتوینەتە ناویەوە، بۆی هەیە هەموو شتێك ڕووبدات. تەنانەت لەوانەیە من و تۆش ببینە قوربانی، بۆ نمونە تۆ وابیر دەکەیتەوە،

شا و ڕژێمەکەی چ خراپەیەکیان بۆ من هەبووە، کە من هێندە تینووی خوێنیانم ...؟ هیچ ! بەڵام بابەتەکە پەیوەندی بە من و تۆ وە نیە.

واتە پەیوەندی بە هیچ کەسێکەوە نیە . ئەم شا یە مەگەر پیاوێکی خراپە. دونیا دەزانێت، ئەم پیاوە پایەیەکی گرنگی ئاشتیە لە دونیادا. نۆکەری ئەمریکاش نییە، ئەمریکیەکانیش زۆر خۆشیان دەوێت ، چونکە هەر جۆرێك بێت، زەحمەت و ماندوبونەکانی ئەوانی کەم کرۆتەوە لە ناوچەکەدا ، بەڵام ئێستا دەبێت بڕوات، دروست وەك من و تۆ، ئەگەر پێویستی کرد سەرمان لە لەشمان جیا دەکەنەوە. لەکاتێکدا هاوڕێ و دۆستیانین.

لەو کاتەدا، زۆر لە قسەکانی دوریان تێنەدەگەیشتم. هەر لەبەرئەوە پرسیم ئێستا دوا فەرمانی DC چی یە و تۆ چۆن بیردەکەیتەوە ؟.

لەوکاتەدا بۆ یەکەمین جار، دوریان هەموو ویسکی ناو پەرداخەکەی خواردەوە و گووتی : چوار پلان لە بەردەست دایە بۆ جێبەجێکردن. هەرکامێکیان جێبەجێ بکرێت، بەسە بۆ لەناو بردنی ڕژێم ، ئەگەر یەکەمیان سەرنەکەوت، دووەمیان. ئەگەر دووەمیان سەرنەکەوت. سێیەمیان ، سێیەمیشیان نەبوو لە ئاکامدا چوارەمیان هەر سەردەوکەێت !.

پریسم : من و تۆ هیچ ڕۆڵێکمان دەبێت لەم پلانانەدا ؟

گووتی : هەر ئەم کارانەی من و تۆ ئەنجامی دەدەین، لەچوارچێوەی ئەو پلانانەدایە !.

گووتم : سەیرکە ئەسڵەن من سەر لە قسەکانی تۆ دەرناکەم، ئەگەر دەکرێت بەشێوەیەکی تر بیڵێ هەتا منیش تێبگەم .

دوای ئەوەی، دوریان دوبارە پەرداخەکەی پرکردوە لە ویسکی، لەتەنیشتم دانیشت و دەستی دەهێنا بە قژمدا و گووتی : خەرمانێك گەنم بهێنە پێش چاوی خۆت ، هێنات ؟

گووتم : بەڵێ !

گووتی : بۆ ئەوەی ئەم خەرمانە گڕبگرێت، دەبێت پشکۆیەك هەبێت ، ئێستا ئەم خەرمانە ئێرانە ، پشکۆکەش هەمان نمایشکردنی فیلمی هاتنەوەی ئیمامە و دابەزینیەتی لە فڕۆکەخانەی مهرئاباد، لەم دوو سێ شەوەدا لە تەلەفزیۆنەکان نیشان دەدەرێت ، ئەمە واتە دەرکردنی فەرمانی DC .

گووتم : ئەوکات بە نمایشکردنی ئەم فیلمە، چۆن چۆنی فاتیحەی ڕژێمەکەی شا دەخوێنرێت ؟ دوریان پێکەنی و گووتی : چوار پلان پێشبینی بۆ کراوە ، یەکێکیان لە بنەکەکانی پۆلیسەوە یەکێکی تریان لە هێزی ئاسمانی، یەکێکی تر لە بازاڕ و دوکانەکانی تەهران، ئەوی تریان لە مەشهەد ، دواتر بێ ئەوی من داوای ڕوونکردنەوە بکەم، درێژەی پێدا و گووتی : بیری لێبکەرەوە، بۆ نمونە ئەگەر لە زیارەتگای ئیمام ڕەضا خوپیشاندانێك ڕوویدات، لەناکاو قەبری ئیمامەکەتا بتەقێتەوەو هەندێ لە پیاوانی سوپاش لەو دەوروبەرەدا بن، کەهەن چی ڕوودەدات ؟.

وەها ترسم لێنیشت، لە جێگای خۆم هەستام دەستم بەر پەرداخە ویسکی یەکەی دوریان کەوت، ڕژا بەسەر سیسەمەکەدا و پرسیم ، واتە دەتانەوێت گۆڕی حەزرەت تێك بدەن ؟.

دوریان بە پێکەنینەوە گووتی : چ گرفتێك لەم کارەدا هەیە؟ دواتر لەبری ئەوە، بەشێوەیەکی جوانتر و مۆدێرنتر نۆژەنی دەکەینەوە !.

قسەکانی دوریان وەك ئەوە وابوو، چەکوشێك بدەن بەسەرمدا، ئەمڕۆ زۆر دوستانە دانی پێدادەنێم سەرەڕای ئەو هەموو کارەی کردبووم، لە کوشتن، ئەشکەنجەدان، دزیکردن، بارمتە گرتن و ڕەمی کردنی ئەفسەرانی سوری، ئیتر ئامادە نەبووم تەنها یەك هەنگاوی تر لەم ڕێگەیەدا هەڵبهێنم، ئەوکات من دەرمارگیری ئاینی و لادێیم هەبوو.

حەزرەتی ڕەضا بۆ من پەناگە و جێگایەکی پیرۆز بوو. تەقاندنەوەی وەها جێگایەك و کوژرانی حەوت بۆ هەشت هەزار زیارەتکاری بێ گوناە، جگە لە نەفرینکردنی خۆم هیچ کاردانەوەیەکی ترم نەبوو بۆی .

پلانەکەی تریان تەقاندنەوە و سوتاندنی بازاڕ و دوکانەکانی تەهران بوو. ئەویش لەماوەیی تەنها شەوێکدا ، ئەم پلانانە وەها تورە و هەستیاری کردبووم، ئامادەبووم بە دەستەکانی خۆم خومەینی بخنکێنم ، بەلاّم هیچ زیانێك بە حەزرەتی ڕەضا نەگات. دوریان ئاگاداری هەستیاری من بوو هاوسۆز بوو بۆم، بێ ئەوەی ئاماژە بە دوو پلانەکەی تر بکات گووتی : ئەمانە هەمووی لە پێناو شەرعیەتدان بە شۆڕشە، لەهەر جێگەیەکی دونیا شۆڕش بکرێت، دەبێت کۆمەڵە کارێکی وەها ئەنجام بدرێت.

مەگەر ڕووداوەکەی سینەما ڕەکس ی ئابادان[14] جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەمانەدا ؟.

گووتم : واتە .... ، قسەکانی بڕیم و گووتی : نازانم ، بەڵام لەوانیە .... نا بەدڵنیاییەوە....

دانی پێدادەنێم، لە هەموو تەمەنمدا هەرگیز وەها دۆخێکی خراپم بۆ نەهاتووەتە پێش، نە لەوە و پێش نە لەوە و پاش ، تەنانەت ئیتر گوێم لەقسەکانی دوریانیش نەبوو، ئەو قسەی دەکرد و منیش بێ ئەوەی بتوانم بیربکەمەوە تورە و تورەتر دەبووم. لەکۆتایشدا نەمزانی چۆن خەوم لێکەوت. ئەویش خەوی دوای نیوەڕوان، دوای ئەو شپرزەی و تورەبوونانە، کاژێر ٤ ی ئێوارە بەدەنگی دوریان بەئاگا هاتم ، بەڵام ئەو لە تەنیشتم نەبوو، دوریان ڕۆشتبوو ، بە بێ تەل بانگی دەکردم، بە ماندویی و چاوی خەوموە وەڵامم دایەوە

— لەکوێ یت ؟

— من لێرەم لە قوتابخانەی عەلەوی، پێویستە تۆش زۆر خێرا خۆت بگەیەنیتە ئێرە، زۆر زوو ، چونکە پەیوەندی بە ژیان و چارەنوسەوە هەیە.

— هیچ ڕوویداوە ؟

---

[14] لە کۆتایی مانگی تەموزی ساڵی ١٩٧٩ سینەما ڕەکسی شاری ئابادان ئاگری تێبەردرا ، نزیکەی ٣٧٧ کەس بەزویندوی سوتان ، کەسێك بەناوی حسێن تکبعلی زادە وەك تومەتباری سەرەکی ڕووداوەکە دەستگیرکرا. دوای دادگایی کردن ئازاد کرا . وەرگێڕ.

– هێشتا نا  زوو خۆت بگەیەنە .

دواتر پەیوەندیەکەی داخست، تازە هاتبومەوە هۆش خۆم، لەدوای ئەو گفتوگۆیەو ئاگاردابوون لە پلانی تەقاندنەوەی گلگۆی حەزرەتی ڕەضا. بەهیچ شێوەیەك ئارەزووی ڕۆشتنم نەبوو ، بەڵام کارێکیشم لەدەست نەدەهات، هەرچۆنێك بێت کازێرێك دواتر هاوڕێ لەگەڵ دوریان و قطب زادە لەژوورەکەی خومەینی ئامادەبووین، تەنانەت ئەوان، منیان بۆ دیدار لەگەڵ خومەینی ئاگادار نەکردبووەوە ، خومەینی دوای سوپاسکردنێکی تایبەت، گووتی ؛ من لێرە متمانەم بەهیچ کەسێك نییە. بەبێ هۆ تۆیان لێرە پەراوێزخستووە، هەرئێستا لەگەڵ ئەم بەڕێزانە و میوانەکان دەچیت بۆ لای شێخ خالخالی، خۆتان و سەربازەکانتان دێن بۆ ئێرە، لێرە زۆر پێویستمان بە بوونی تۆ هەیە.

نەمزانی بۆچی دوریان و قطب زادە هەواڵێکی وەها گرنگیان لەمن شاردۆتەوە، ئەمە هەمان ئەو شتەبوو هەرسێکمان ئارەزوومان دەکرد، ئێستا بەم ئاسانیە هاتوەتە بەردەستمان، بۆیە بەبێ دواکەوتن، ئامادەی خۆمم نیشاندا. لەگەڵ قطب زادە هاتینە دەرەوە، دوریانیش لە تەنیشت خومەینی مایەوە .

چەند خولەکێك دواتر، قطب زادە یەك لەشکری لەدەوروبەری خومەینی کۆکردەوە و بەناوی وەرگری دەستبەسەرەکان، بەمنی ناساند، ئیتر تێگەیشتم بابەتەکە بەو ئاسانیەش نییە کە بیرم لێدەکردەوە .

( شێخ مەلا شەهاب ئیشراقی ، شێخ صادق خالخالی ، شێخ جەعفەر سبحانی ، لاهوتی ، هادی غەفاری ، ئیبراهیم یەزدی ، هاشم صباغیان ، دکتۆر موعین فەر ، میناچی هەورەوەها ئەبوو شەریف ) ئەمانە ئەو کەسانەبوون، کە دەبوو دەستبەسەرەکانینا ڕادەست بکەم. ئەم بەرێزانە هێندە پەلەیان لێکردم هەتا بەخێرایی بچین بۆ تەهرانی نوێ و دەستبەسەرەکانینا ڕادەست بکەم، تەنانەت هەلی ئەوەیان پێ نەدام، چاوەڕێی هاتنە دەرەوەی دوریان بکەم، لە ژوورەکەی خومەینی.

لەکۆتا چرکەکاندا ویستم سواری ئۆتۆمبێلەکەبم، قطب زادە چرپاندی بەگوێمدا و گووتی : جەعفەر زوو بگەڕێوە، ئەگەر لەبەرچاوی تۆ ڕوداوێك هاتەپێشەوە، هەوڵمەدە خۆتی تێوەبگلێنی .

دەبوو هەستم بەوە بکردایە، ئیتر ژیانی دەستەبەسەرەکان کۆتایی هاتووە ، بەڵام ئەگەر ئامانج لەناوبردنی ئەوان بوایە، دەکرا ئەم فەرمانە بە پارتیزانەکانم بکرایە، بۆ ئەنجام دانی، یان تەنها ئەبو شەریف بەس بوو بۆ ئەمکارە. لەبەر ئەوە هەستم کرد، ئەم ماستە مویەکی تێدایە ، لەم دوایانەدا ئەبو شەریف بۆی گێڕامەوە ، ئەڵبەتە ئەو کاتەی ئەویشیان لە پۆستەکەی دورخستبووەوە و ئاوارەی هەندەران بوو ، لەبەرئەوەی ئەم بابەتە پەیوەندی بە یادەوەریەکانمەوە هەیە، بارمتەکان ئیتر ڕۆڵێکیان نەما

لەزمانی ئەبو شەریفەوە بۆتانی دەگێڕمەوە ، ئەو شەوە، دوای ئەوەی دەستبەسەرەکانیان لە پارتیزانەکانم وەرگرت، ئێمە ماڵەکەمان بەجێهێشت. نوێنەرەکانی خومەینی، هەتا نیوەشەو چاوەڕێدەبن، واتە کاتی قەدەغەی هاتووچۆ، ئەوکاتە دەستبەسەرەکان، دەبەن بۆ مەیدانی ئەسپسواری فەرەح

ئاباد، لە نمایشێکی ساختەدا، دەست و قاچیان دەکەنەوە و ئازادیان دەکەن. بەڵێنی ئەوەیان لێوەردەگرن، کە هیچ شتێك لەبارەی تاڵانکردنی مۆزەخانەکەوە بۆ کەس نەگێڕنەوە. لەکاتی هەڵهاتنی دەستبەسەرەکان، لەپشتەوە دەست ڕێژیان لێدەکەن. هەر شەش کەسەکەیان دەکوژن، ئەو دەست ڕێژیەش لەلایەن ئاخوندەکانەوە ئەنجامدراوە ، بەڵام گوللەی کۆتایی دەسڕۆکە لەمل و چاکەت و پانتۆڵ لەبەرەکان، ئەنجامی دەدەن، دیارنیە چۆن و چ کەسێك لەو نیوەشەوە تاریکەدا وێنە لە ڕووداوەکانی کۆتایی دەگرێت. دواتر ئەم وێنانە دەبێتە، کارتێکی بەهێز، بۆ فشار خستنەسەر دارو دەستەکەی مەهدی بازرگان، واتە یەزدی و موعین فەر و میناچی و هاشمی صباغیان .

بەرەبەیانی ئەو ڕۆژە، تەرمی ئەو شەش کەسە، لەگەڵ ڕووداوەکەی دوشان تەپە بەناونیشانی یەکەمین شەهیدەکانی دەستی سوپا و ڕژێم، لەهەموو شەقامەکانی تەهراندا بانگەشەیان بۆ دەکرێت. و ئەم ڕووداوە تەهران دەخرۆشێنێت ، بەهەرحاڵ ئەو ڕۆژە، دوای ئەوەی کەسەکانی ژێردەستی خۆم واتە چایچی و ئەحمەدی و نعمانی و تەقەوی نیا و سودابە م بانگرد، کاری نوێم پێڕاگەیاندن. پاش ئەوەی خانووەکە و دەستبەسەرەکانم ڕادەستی نوێنەراکانی خومەینی کرد. تەنها بێ تەل و هەندێ چەکی ئەمریکی و کەمێك کەل و پەلی پاشماوەی ئوپراسیۆنەکە مایەوە، هەموویم دابە سودابە هەتا بیان گەڕێنێتەوە بۆ کۆلۆنێل بەیکەر .

کاژێر ٨ ی ئێوارە، کارە پڕ دڵەڕاوکێ و نوێ یەکەمان لای خومەینی دەستی پێکرد. ئێستا تەلەفزیۆن مەراسیمی هاتنەوەی خومەینی بۆ تەهران پەخش

دەکات،  ئەو پیرە پیاوەش دەرگای لەسەر خۆی داخستووە و سەرگەرمی تەماشاکردنی هاتنەوەی خۆیەتی .

چوار ڕۆژی تەواو، ڕۆژانی داوتریش من بەبەردەوامی لە خزمەتی خومەینی دا بووم، ئاگام لەوە نەبوو لەدەرەوە چی دەگوزەرێت و چی ڕوودەدات. ئەوەی بەدەستی من و پارتیزانەکانم دەگەیشت، یان هەواڵی تایبەت بەسەرکەوتنی شۆڕش بوو، یان ئەو ڕاپۆرتانە بوو، کە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان پەخشیاندەکرد.

ڕاستت دەوێت، زۆر بەکەمی هەلی ئەوەمان بۆ دەرەخسا گوێیان لێبگرین و تەماشایان بکەین. هەرجۆرێك بێت، لەماوەی ئەو چوار ڕۆژەدابووە، شۆڕش سەرکەوت و حکومەتەکەی بەختیار ڕووخا و دەورەی حوکمداری خومەینی و یارانی دەستی پێکرد .

ئەوی ڕواڵەتی دەرەوەی شۆڕشیان پێکدەهێنا ئەوانەبوون، کە خەڵکی لە تەلەفزیۆنەکانەوە دەیانبینی ، بەڵام خەڵك بێ ئاگابوون لە دیوی ناوەوەی شۆڕش و ئەو ڕووداوانەی لە بن دەستی خومەینی ڕویاندەدا، تەنها ئێمە لێ ی بەئاگابووین .

بۆئەوەی قسەکانم پشت ڕاست بکەمەوە، ئاماژە بە نمونەیەك دەکەم ، هەمان ئەو شەوەی خانووەکەی تەهرانی نوێمان ڕادەستکرد و گوازراینەوە بۆلای خومەینی، ڕووداوەکەی هێزی ئاسمانی دوایی دیمەنی هاتنەوەی ئیمام پەخشکرا. گوایە فرۆکەوانەکان دەستیان بە شۆڕش کردووە و ڕووبەڕووی گاردی شاهنشایی بوونەتەوە و چونەتە ناو جبەخانەی بێ پاسەوانەوە.

دوای ئەوەش خەڵکی هەموو بوون بە چەکدار  ئەمە ڕووکاری دەرەوەی بابەتەکە بوو .

کاژێر ١٠ ی بەیانی، کۆڵۆنێڵ تەوەکولی منی هێنایە کەنار و گووتی : هەرچۆنێك بووە، ئیمام ئاگادار بکەنەوە، چەند خولەکێك تەشریف بهێنێت بۆ جێگای حەوانەوەیان .

خومەینی، لەگەڵ هەندێ لە ئەندامانی پەرلەمانی دەوڵەتەکەی شا سەرگەرمی گفتوگۆ بوو. لەو جۆرە کاتانەدا من دەچوومە ژوورەوە، خومەینی خەریکی قسەکردن دەبوو، یان گوێ ی بۆ قسەی کەسانی تر ڕادەگرت ، ئەگەر دەستی ڕاستی ببردایە بۆ گوێ ی، ئەمە بەواتایی ئەوە بوو بچم بچرپێنم بە گوێ یدا و مەبەستەکەی پێبڵێم، ئەگەر ئەم کارەی نەکردبا، ناچار دەبوو کەمێکی تر چاوەڕێ بکەم .

بۆ گەیاندنی پەیامەکەی کۆڵۆنێڵ تەوەکولی، چومە ژوورەوە. ئیمام خومەینی دەستی ڕاستی نەبرد بۆ گوێ ی منیش هاتمە دەرەوە ، تەوەکولی دەستبەجێ هاتەلام  گوتی چی بوو ؟ گووتم : ئیمام سەرقاڵە .

گووتی : هەرچۆنێك بووە پێ ی بڵێ بەناونیشانی ( مالك ئەشتەر ) کۆڵۆنێڵ تەوەکولی ئەم پەیامەی ناردووە .

دیسان چوومە ژوورەوە، هەرکە خومەینی چاوی پێمکەوت دەستی ڕاستی بردە لای گوێ ی ڕاستی چوومە پێشەوە و بە هێواشی گووتم : کوڵۆنێڵ تەوەکولی بەناوی مالك ئەشتەر، دەیەوێت حەزرەتی ئیمام بۆ چەند

خولەکێك، تەرشریف بێننە جێگای حەوانەوەکەیانەوە ، خومەینی ملی وەرگێڕا و گووتی : تا چەند خولەکێکی تر .

دواتر، ئیمام لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی، لە ژووری دیدارەکان هاتنەدەرەوە. چوون بۆ ژووری تایبەتی حەوانەوەکەیان، تەوەکولی لەوێ چاوەڕیانی دەکرد. نزیکەی سێ بۆ چوار خولەك بە چپە لەگەڵ خومەینی قسەی کرد. دواتر هەمووەمان چووینە ژورێکی تر، دیسان لەو بابەتانە بوو کە غافلگیریان دەکردم، تا ئەو جێگایەی من دەمزانی و پێیان گوتبووم، جگە لە کەسە زۆر نزیکەکانی خومەینی و ماڵباتەکەی، کەسی تر مافی ئەوەی نەبوو، بچێتە جێگای حەوانەوەکەیانەوە، تەنانەت کەسانی هاوشێوەی مەهدی بازرگان، بەهەشتی، منتظری، مفتح و مطهری ، بەلأم لەوکاتەدا دوریانرمەکگرەیم بینی، لەگەڵ کۆڵۆنێڵ بەیکەر و ژەنراڵێکی هێزی ئاسمانی، لەجێگای خۆیان هەستان، هەتا ڕێز بۆ خومەینی بنوێنن، ئیمام دەستی خستە ناو دەستی بەیکەر و دوریان، هەتا ئەوکاتە نەم دیبوو خومەینی دەستبخاتە ناو دەستی ژنێکی نامحرەم ، بەلأم هەرکە ڕووی کردە ژەنراڵە ئێرانیەکە، ژەنراڵی سێ ئەستێرە کەوت بەسەر قاچی خومەینیدا، سەرەتا قاچی و دواتر دەستی ماچکرد. ئیمامیش پێدەکەنی، دوای چەند ساتێك، دەستی خستە ژێربالی ژەنراڵەکەی هێزی ئاسمانی بەرز کردەوە و لە پێکەنین کەوت و گووتی : سوپاست دەکەم ژەنراڵ (ئازەر بەرزین) خودای گەورە پشتیوانی مسوڵمانێکی بە تەقوای وەك تۆ بێت ، ئەم سەکەوتنەی ڕۆژی خودا، لەئەنجامی کارە دڵسۆزەکانی تۆیە بە ئیسلام .

بۆ ماوەی نیو کاژێر گفتوگۆ لە نیوان خومەینی و کۆڵۆنێڵ بەیکەر و ژەنراڵ ئازەر بەرزین بەردەوام بوو ، لەکۆتایدا، دوریان مەکگرەی، کە لەم دوایانەدا

بۆی گێڕامەوە، چەکێکی بەبڕی یەك ملیۆن دۆلار بە خومەینی داو ئەویش ڕادەستی ئازەربەرزینی کرد.

لەم یادەوەریانەدا، پێشتر باسی ژەنڕاڵ ئازەر بەرزینم کردبوو ، ئەوکاتەی لە نوفل لوشاتۆ بووین، توانیمان سود لەیارمەتیەکانی وەربگرین، بۆ بەرنامەڕێژی نمایشی ڕێ ڕۆشتنی سەربازی فرۆکەوانەکان، لەبەرامبەر خومەینی .

لەوماوەیەی ئەوان سەرگەرمی گفتوگۆ بوون، تەنانەت بۆ یەك چرکەش، لە بیرکردنەوەی چارەنوس و بەراوردکرنی خۆم لەگەڵ ئەو جۆرەکەسانە، غافڵ نەبووم. ئەو تاوانانەی، لەو یەك دوو ساڵەدا ئەنجامم دابوون کەم نەبوون. دەستم بە دزی و دەستبەسەراگرتنی ماڵ وموڵکی خەڵکی و کوشتن و ئەشکەنجەدان و دەستدرێژی پیس بوبوو ، بەلام هەرجۆرێك بێت نەخوێندەوار بووم، من لە سوپاکەی شا دا نەگەشتبوومە پلەی ژەنڕاڵ، بیر و بۆچونی لادێ ی و مەزهەبیم هەبوو، مێشکم باش کاری نەدەکرد. بەلام ئەم بەرێز ژەنراڵە چی ؟ خۆ ئەو خوێندەوار بوو ، پارەدار بوو، خاوەن پلە پایە و ناوبانگ بوو. بۆ دەبێت ئەو لەمن شێت تر بێت ! ، تەنها لەبەرئەوەی حەوت یا هەشت ڕۆژ، ببێت بە فەرماندەی هێزی ئاسمانی حکومەتەمەی خومەینی. دواتریش لە هاتووچۆکردنی دەرەوە ببێت بە دەلاڵی چەك و تەقەمەنی بۆ ئیمام، ئەو ڕۆژانە هاوشێوەی ئازەر بەرزین زۆر بوون ، سیناتۆرەکان ، ئەندام پەرلەمانەکان ، پارێزەرانی دادگاکان ، ژەنراڵەکان ، بازرگانەکان ، زۆر کەسانی تر دەهاتن ، ئەگەر ئەم یەکەیان یەك ملیۆن دۆلاری وەك پاداشت وەرگرت، ئەوانی تر پارەیان دادەنا ، ڕاست دوو یان سێ ڕۆژ دوای سەرکەوتنی شۆڕش، لەسەر سفرەی نانی ئێوارە، شێخ

مەلا شەهابی ئیشراقی، هەواڵی بە ئیمام دا کەلەم یەك دوو ڕۆژەدا، بازرگانەکانی تەهران سێ سەد و هەشتا و شەش ملیۆن تومان پارەیان پێشکەش کردووە. لەماوەی ئەو دوو سێ ڕۆژەدا، بەشی خومەینی سێ هەزار و هەشت سەد و شەشت ملیۆن پارەبوو ، ئەمەش لەکاتێکدا بوو، بەگووتەی سەید محمودی دوعایی، خومەینی پارەی ۱۸ مانگی کرێ ی خانووەکەی نەجەف قەرزار بوو.

کاتێك دیسان خومەینی هاتە دەرەوە، هاوڕێیەتیم کرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ بەهەشتی و موجتەهید شەبەستری و فلسفی واعظ کۆبێتەوە، ئیمام بەهێواشی چرپاندی بە گوێمدا و گووتی : بێ ئەوەی پێویست بکات کەس بزانێت ، سەید ئەحمەد کاری پێتانە و بۆی ئەنجام بدەن .

ڕاسپاردەکەی خومەینی، جارێکی تر منی لە فکر و خەیاڵ دەرهێنا و خۆشحاڵی جێگای گرتەوە ، شۆڕش سەرکەوتبوو، خومەینی ئیمامی مەزن بوو، سەید ئەحمەد قائم مەقام و هەمەکارە بوو. بەڕواڵەت هەموو بەرنامەکانی خومەینی ئەو دایدەنا، ئەوەی سەید ئەحمەد دەیویست بۆی ئەنجام بدەم، زۆر بەئاسانی دەیتوانی بە خۆم بڵێت، ئیتر بۆچی لەڕێگای باوکی یەوە داوای ئەنجامدانی دەکرد. دیارە هەم کارێکی گرنگە و هەم خۆشم بوو بووم بە کەسێکی زۆر گرنگ .

هەموومان، بارودۆخی ئەو ڕۆژانەی وولاتیان لەبیرە، هەموو شتێك ئاڵۆز و شپرزە و شێواو بوو. لەهەمان ئەو ساتەدا، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان بە فەرمانی ئایەتوڵا طاڵەقانی، خرانە خزمەتی شۆڕشگێڕانەوە. دەستبەجێ

چوار جۆر کار لەدەوری خومەینی وەك؛ حەسادەت ، ململانێ ، ڕێگری ، هەوڵ و کۆشش بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی زیاتر ، دەستیان پێکرد.

لەکات و شوێنی خۆیدا لەبارەی ئەو ململانێ و دابەشکاریانەوە دەدوێم ، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەم بەشەی یادەوەریەکانەوە هەیە دەبێت بیڵێم ئەوەیە ، ئەگەرچی ئەو ڕۆژانە ناوەندی هەموو هەواڵەکان خودی خومەینی خۆی بوو، هەموو فەرمانەکانیش هەر لەلایەن ئەوەوە دەردەچوو، ئێمە کە لەوێ بووین کەمتر لەهەمووان گوێمان لەڕاستیەکان دەبوو.

هەموو خەڵك هەرکارێك دڵیان بیویستایە بەبێ ڕێگری لە شارەکاندا ئەنجامیان دەدا ، چونکە ئەم کارانە بەشێوەیەکی گشتی لە چوارچێوەی سیاسەتی کاری خومەینیدا بوو، دوای ئەوەی ڕووی دەدا خومەینیش پشتگیری لێ دەکرد ، ئەم سیاسەتە سەردێڕە سەرەکیەکەی لە نوفل لوشاتۆ و هەمان کۆبونەوە دیارەکەی ڕەمزی کلارك ، تامسۆن ، دوریان مەکگرەی و ساندەرزی بریتانی داڕێژرابوو. هەر جۆرێك لە توند و تیژی و کوشتار، بە گووتەی خۆیان تورەیی و هەڵچونی شۆڕشگێڕان ڕێگە پێدراو بوو، لەم جۆرە پلانەدا هەتا کوژرانی یەك ملیۆن کەسیان پێش بینی کردبوو .

هەرچونێك بێت، ئەو ڕۆژە هێندە بەرنامە و گرفتاری هاتە پێشەوە کە من و سەید ئەحمەد هەلی ئەوەمان بۆ نەڕەخسا هەتا گفتوگۆیەکی تایبەت پێکەوە ئەنجام بدەین. کاژێر یازدە و سی خولەکی شەو هەموومان ڕۆشتین بۆ نانخواردنی ئێوارە، یەزدی و قطب زادەش لەوێ بوون .

شێخ مەلا شەهابی ئیشراقی زاوای خومەینی، ڕاپۆرتی پارە بەدەست هاتوەکانی خوێندەوە. قطب زادە داوای لە خومەینی کرد، هەتا منیش

لەگەڵیدا بچم بۆ دەستەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن. خومەینی داواکەی قطب زادەی ڕەتکردەوە و گووتی : ئەم جەعفەرە هێز و بازووی منە، دەبێت لێرە بمێنێتەوە ، ئەم یەکەمین بەرهەڵستیەی خومەینی بەرامبەر بە قطب زادە منی خۆشحاڵکرد ، بەلام دواتر دوریان و قطب زادە بۆیان گێڕامەوە بەمەبەست ئەم پێشنیارەیانکردوە، هەتا ڕادەی متمانە و هۆگری خومەینی بەرامبەر بە من بزانن.

لەدوای چوار شەوی پڕکار، ئەو شەوە من و دوریان بڕیارماندا بگەڕێینەوە بۆ ماڵەکەی خۆمان، هەتا پشوویەك بدەین. لە کاژێر ٢ ی نیوە شەو سەید ئەحمەد ڕووکردە من و گووتی : ئێوە چەند خولەکێك بمێننەوە کارم پێتانە .

دوریان گووتی : کەواتە منیش دەمێنمەوە هەتا کارەکەتان تەواو دەبێت. بەم جۆرە قطب زادە و یەزدی و ئەوانی تر ڕۆشتن. دوریانیش چووە ژورێکی تر، من و سەید ئەحمەد بەتەنها ماینەوە ، لەوکاتەدا جبە و عەبا و مێزەرەکەی سەری لابرد. لەبارەی یادەوەریەکانی پاریس و نوفل لوشاتۆ دوا و لەناکاو بێدەنگ بوو. دواتر گووتی : تۆ ئەو ناپیاوە کەنەدیە ڕۆجەرز جۆنز دەناسیت ؟

گووتم : نا !

گووتی : ئەو کوڕە بالابەزە بێ توکەی لە نوفل لوشاتۆ، لەگەڵ فڕۆکەکەی خۆمان هات بۆ تەهران .

گووتم : دەزانیت من سەرم لەم جۆرە کارانەدا نییە ، بەلاّم ئەگەر ببیبنم لەوانەیە بیناسم . لەو کاتەدا سەید ئەحمەد لە جێگاکەی خومەینی واتە باوکیدا دانیشت و گووتی : دڵنیام دەیناسیت ، چونکە چەند جارێك بینیومە دەمەقاڵێتان بووە لەسەر وێنەگرتن و ئەم جۆرەکارانە. هەم لێرە و هەم لە نوفل لوشاتۆ .

گوتم : نازانم من بەناوی ئەوان ئاشنا نیم .

سەید ئەحمەد گووتی : سەیرکە، ئەو بابەتەی دەمەوێت لەگەڵتانی باس بکەم، تایبەتی و خێزانی یە ، جگە لە من و باوکم و تۆ هیچ کەسی تر زانیاری لەبارەیەوە نییە ، لەبەرئەوە هەتا بەکۆتاهاتنی کارەکە نابێت کەس هیچی لەبارەوە بزانێت .

گووتم : وابیر دەکەمەوە لەم ماوەیەدا نهێنی پارێزی خۆم هەتا ڕادەی پێویست نیشانداوە .

سەید ئەحمەد گووتی : هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە، حەزرەتی ئیمام گووتیان، ئەم کارە تەنها بەڕێز جەعفەر دەتوانێت ئەنجامی بدات .

گووتم : من لەخزمەتتانداm . سەید ئەحمەد گووتی : هەر بەو جۆرەی کە گووتم، ئەم بابەتە تایبەتی و خێزانی یە، ئاشکرا بوونی دەبێتە کارتێکی فشار بە دەست دوژمنەکانی ئیمامەوە ، لەبەرئەوە پێویستە هەرجۆرێك بێت، بابەتەکە بە بێدەنگ و هەرا دیزە بە دەرخۆنە بکرێت. ڕاستیەکەی ئەمەیە، دوای ئەو ڕووداوەی شوقەکەی شەقامی فوش کە بە دەستگیرکرانمان کۆتایی پێهات ( فاتی ) [1] کەوتووە بە ڕقدا و هێشتا ناکۆکە

لەگەڵم ، چونکە ژنە، کەم عەقڵە، لەوانەشە لەبیری تۆڵەکردنەوەدا بێت ، یان بیەوێت من و باوکم بترسێنێت  نازانم چۆن پێت بڵێم ، بەڵێ، بەکورتی ئەو ناپیاوە ڕۆجەرز جۆنز، زۆر خراپ عاشقی فاتی بووە.

ئەم بابەتەش ئێمەی نیگەرانکردووە، ئەڵبەتە فاتی زۆر ڕووی پێنادات ، بەلاٌم خۆ هەر دەبێت چارەسەرێك بدۆزینەوە و لەم نیگەرانیە بێینە دەرێ

گووتم : وەلاٌ مادام بابەتێکی وەها هاتە پێشەوە، بەرامبەرەکەمان دەناسم. ئەو دەمەقاڵێ و پێکهەڵپژانەی نێوانمان هەر لەسەر ئەم بابەتانەبوو ، جارێکیان خاتوونێك لەگەڵ فیروزەی کچی بنی صدر و کچەکەی سەید مەهدی ڕۆحانی، لەپاریس چوون بۆ بازاڕ بۆ شت کڕین، ئەم ناپیاوەش دوایان کەوتبوو، هەر لەوکاتەدا ئیقبالْ ئەحمەد پێ ی گووتم ئاگاداری ئەو پیاوە بم  دیار بوو سەید ئەحمەد یەکەمجاری بوو وەها هەواڵێك ببیستێت، گووتی : بەکورتی من و باوکم بڕیارمانداوە بەشێوەیەك ئەم پیاوە لەسەر ڕێگای خۆمان لادەین .

گووتم : ئەم پیاوە زیاتر لە دوو مانگە لە دەوروبەرمان دەسوڕێتەوە، هێنانەدەرەوەی کارێکی ئاسانە وەك ئەو حەوت هەشت هەزار ئەفغانیەی لەدەرەوە فڕێدراون، ئەمیش لەدوای لێدانێکی باش وەدەری دەنێین .

---

١- فاطمە طباطبایی ، هاوسەری ئەحمەدی خومەینی خوشکی صادقی طباطبایی . وەرگێڕ.

سەید ئەحمەد دەستبەجێ گووتی : ئا هەموو ئەو ڕێگایانەمان تاوتێ کردووە، تەنها ڕێگا لەناو بردنیەتی والسلام .

گووتم : ئەگەر مۆڵەت بدەیت ئەم شەو بیری لێبکەمە هەتا پلانێکی بۆ دابڕێژم، لەوانەیە بەبێ ئەوەی دەستمان بە خوێنی پیس بێت کارەکە چارەسەربکەین ، ئەمەم گووت و هەستام ، چونکە دەمزانی دەمێکە دوریانم لە چاومڕوانیدا هێشتووەتەوە .

لەکاتی خوداحافیزی، سەید ئەحمەد پاکەتێکی ڕەنگ زەردی دایە دەستم، هیچ گومانم لەوە نەبوو وەك جاران هەندێك پارەیان خستۆتەناویەوە بۆم، ئەوان باش شارەزایی خاڵی لاوازی من بوون.

هەرکە سواری ئۆتۆمبێلەکە بووم، هەتا بەرەوە ماڵ بکەوینە ڕێ. دوریان گووتی : ها چی یە بۆ هێندە توڕە و بێزار دیاریت ؟ دیسان پێشنیاری کوشتنیان پێداویت؟ .

گووتم : تۆ لەکوێ دەزانیت ؟!

گووتی : بەهەڵکەوت ئەمەیانم نەدەزانی ، بەڵام ڕەفتاری توڕەیی تۆ، وانیشاندەدات هەواڵی ئەم جۆرەکارانە لەئارادا بێت. لەوانەشە ئەم پاکەتە پارەی تێدابێت، دواتر بە پێکەنینەوە درێژەی پێدا ، ئەگەر وابیر دەکەیتەوە، بابەتەکە کەسی و تایبەتیە یە دەبێت زوتر پێم بڵێت ، چونکە گەیشتینەوە ماڵەوە قطب زادە لەوێ یەو، لەوانەیە نەکرێت لەبەرامبەر ئەودا قسەبکەین. گووتم : بەڵام قطب زادە خوداحافیزی کردو ڕۆشت !

گووتی: بەڵێ، بەڵام وا بڕیارە ئەم شەو کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵیمان هەبێت.

گووتم: بەیانی کاتێك بەیکەر و ئازەر بەرزین ڕۆشتن، خومەینی پێی گووتم، سەید ئەحمەد کاری تایبەتیان پێت هەیە ، بۆی ئەنجام بدەن. ئێستا ئیمام زادە فەرمانی کردووە ڕۆژنامە نوسێکی کەنەدی سەرنگوم بکەم .

دوریان بە پەشۆکاویەوە گووتی : ڕۆجەرز جۆنز ؟ !

گووتم : بەڵێ، بەڵام تۆ چۆن دەزانیت ؟

دوریان بەجۆرێك کە پێشتر هەرگیز بەو جۆرە نەمبینیی بوو، سەری ڕاوەشان گووتی : من بابەتی پەیوەندی هاوسەرەکەی سەید ئەحمەد لەگەڵ ڕۆجەرز جۆنز لە پاریسەوە ئاگاداریم، دوای ئەوکارە پیسەی شوفەکەی فوش، خوشکەکەی ئیمام موسی صدر کەدەکاتە پوری فاتی، لەسەر ڕووداوەکەی ئیمام موسی، گوایە سەید مەهدی ڕۆحانی گوتویەتی : خومەینی و سەید ئەحمەد هاوکاری قەزافییان کردووە بۆ ئاشرین کردن و ناو زڕاندنی ئیمام موسی صدر، ئەم بابەتەش فاتی بەرەو جیابوونەوە و تۆڵەسەندنەوە هانداوە.

ڕۆجەرزی نازەنینی ئێمەش لەم کارەوە گلاوە ، بەڵام ئەوە بزانە بەگووتەی ئێوە ئێرانیەکان، تەنانەت نابێت تاڵە موویەك لەسەری ڕۆجەرز کەم بێتەوە هەوڵدەدەم سبەی هەتا کاتی خۆرئاوابوون، ڕۆجەز بنێرمە دەرەوەی ئێران .

ئێستا ئیتر نۆبەتی من بوو، سەر لێشێواو گێژ ببم هەر لەبەرئەوە پرسیم ، مەگەر ڕۆجەرز لەگەڵ تۆ لەپەیوەندیدایە و هاوکارتە ؟.

گووتی : سەیرکە جەعفەر ، ڕۆجەز نە ڕۆژنامەنوسە و نە پەیامنێر، تەنانەت کەنەدیش نییە کارمەندی CIA یە.

بابەتی کوشتنەکەشی هیچ پەیوەندیەکی بە دۆستایەتیەکەی لەگەڵ فاتی خانم نییە ، مەسەلەکە لە جێگایەکی ترەوە سەرچاوە دەگرێت ، ئەم منداڵە جارێکی تریش لە ڕووداوەکەی چیکسلۆڤاکیا بڕیاربوو، لەناو ببرێت. دیسان فریای کەوتم، دەمەوێت شتێکی ترت پێبڵێم لەوانەیە باوەڕ نەکەیت، گرنگیش نیە بەلامەوە باوەڕدەکەیت یا نا ، بەلأم لەبیرت بێت ئاگاداری ئەم بابەتە بیت .

گووتم : لەماوەیەدا گەلێك شتم بینیوە کە وەهایان لێکردووم باوەڕم بە هەموو شتێك هەبێت، تەنانەت ئەگەر تۆ بڵێیت پیاوم باوەڕدەکەم.

دوریان گووتی : تەنها دەتوانم ئەوەت پێبڵێم، لەژێر چاوەوە ئاگاداری پەیوەندی تایبەتی خومەینی و فاتی خانم بە، هۆکارەکەی دوای پێت دەڵێم ، بەهەرحاڵ، سبەی پێت دەڵێم چی بکەیت، هەتا هەم متمانەی خومەینی و سەید ئەحمەد لەدەست نەدەیت. هەم ڕۆجەرز جۆنزیش بەسەلامەتی لەم شەڕە بچێتە دەرەوە .

دواتر پاکەتە زەردەکەی لەسەر داشبۆردی مارسیدرس بنزەکە هەلگرت و گووتی : بهێڵە بزانم نرخی سەری ڕۆجەرزی بێچارە چەندە ؟

دوریان پاکەتەکەی کردووە و دەستبەجێ گووتی : هەرلێرە رایگرە ، لەکەنار جادەی کۆنی شەمێران لەبەرامبەر وەزارەتی تەندروستی ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت. دیاریەکەی سەید ئەحمەد سێ بەستە هەزار تومانی بوو، واتە پارەی ناو پاکەتەکە نزیکەی سێ سەد هەزار تومانێك دەبوو، وێنەیەکیشی تێدابوو ، وێنەی من بوو، لەکاتی ئەشکەنجەدانی ئافرەتێکی نیوە ڕووت، لە ژووری لێکۆڵینەوە لە طرابلس گیرابوو، چاپچیش لە وێنەکەدا دەرکەوتبوو. دیسان

دوریان وێنەکەی لێوەرگرتم و بە ئینگلیزی شتێکی گووت تێنەگەیشتم ، بەڵام کاتێك بە فارسی گووتی : سەگبابینە تێگەیشتم ئەوەی بە ئینگلیزی گووتی، شتێکی هاوشێوەی ئەم جنێوەیە .

ئەو شەوە لەمانایی سوتان و ئاگرگرتن تێگەیشتم ، لەبارەی تۆڵەسەندنەوەوە، دەمنەڕاند و قسەم دەکرد. ڕێك و ڕاست بە دوریانم گووت، خۆیان فێری کوشتنیان کردم، ئێستاش نۆبەتی خۆیانە. لێیان دەدەم و دەیانکوژم و دواتر هەڵدێم ، دوریان هەوڵی دەدا ئارامم بکاتەوە، دەیگووت: ئێستا ئەوان ناپیاویان کردووە دەرحەقت ، بەڵام تۆ وازبێنە هەتا ماوەت هەبێت لەکاتی خۆیدا بچیتە سەر وەختیان .

تەواوی ئەو شەوە لە درێژەی گفتوگۆکاندا لەگەڵ قطب زادە و دوریان کەهەتا بەرەبەیانی خایاند، بۆ ساتێکیش لەو بابەتە غافڵ نەبووم ، بەڵام ڕاستت دەوێت خۆشم دەمزانی کارێکم لەدەست نایەت .

دەردە دڵەکانی قطب زادە جۆرێکی تر بوو، زۆر بە ڕوونی بە دوریانی گووت: من ئامادەم بۆ سەرۆك کۆماری ، بەڵام ئێستا کۆت و بەندیان کردوم بە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە، ئەم پیرە پیاوەش بەردەوام ئەمر و نەهی دەکات ، هەمووان دەیانەوێت ئەم شارە زەردەواڵە بناڵۆزکێنن، کۆمەنیستەکان دەورو بەری خومەینیان گرتووە. دەبێت کارێك بکەین، بەپێ ئەو بەیاننامانەی لە نوسینگەکەی خومەینیەوە بەدەستم دەگات، بۆ بلاوکردنەوە. تێگەیشم لە تەلەفزیۆنیش بەتەنهام، هەمووان گروپیان بۆ خۆیان پێکهێناوە، من جگە لە تۆ و جەعفەر و براکەم کەسم نییە .

دوریان گووتی : هەتا من و جەعفەر لێرە بین خەیاڵت ئاسودەبێت. لە بیرت بێ تۆ سەری بابەتەکەی، هەموویان بەڕاست و چەپ پێویستیان پێت دەبێت.

ئەو کارە بەد ڕەوشتیانەی لەپاریس دەتکرد نەدەبوو بتکردایە، لێرە دەبێت ئەنجامی بدەیت نایکەیت ، بەهێز خۆت نیشان بدە و خۆت بە سەروتر لەهەموان بزانە، ئەڵبەتە هەتا ئەو ڕۆژەی بارودۆخ وەها نالەبار بێت ، دیسانەوە پێت دەڵێمەوە ئەم بارودۆخە هەمیشەیی نییە .

قسەکانی دواتر هەرلەم چوارچێوەیەدا بوو، زۆر سەرەنج ڕاکێش نەبوو بۆم ، بەیانی کاتێك بەرەو جێگای مانەوەی خومەینی دەڕۆشتین، دوریان گووتی : پلانی کوشتنەکەی ڕۆجەرز قبوڵبکە ، بەڵام بەو مەرجەی خۆیان پلانی کوشتنەکە دابڕێژن. هەروەها لەبارەی وێنەکەیشەوە گلەییان لێبکە.

کاتێك گەیشتم، هێشتا خومەینی لە جێگای نوستنەکەی نەهاتبووە دەرەوە. لە دڵسۆزی خۆیان گووتی: دەبێت جێگەیەکت بۆ دابینبکەم هەتا لێرە بمێنەوە و ئەم هەموو ڕێگایە نەبڕیت و بڕۆیت و بێیتەوە. هەرکە سەید ئەحمەد چاوی بەمن کەوت، بە بەهانەیەکەوە سەری قسەی کردەوە ، کاتێك بەتەنها ماینەوە پرسی : لەکۆتایدا بڕیارتدا ؟

گووتم : پێویستی بە بڕیاردان نەبوو، دەمویست کەمێك بیری لێبکەمەوە، هەتا بزانم چۆن چۆنی دەکرێت جێبەجێی بکەم ، بە ئاگادار بوون لە ئەشارەزای من لە تەهران، وابیردەکەمەوە کەسێك یان هەر کەسێك ئێوە بەباشی دەزانن، دەبێت یارمەتیم بدات، هەتا نەخشە و پلانی کوشتنەکەی دابڕێژین و دواتر ئەنجامی بدەین .

سەید ئەحمەد گووتی : ئەمشەو لەبارەیەوە دەدوێین ، بەڵام لەبیرت بێت نابێت خانمی دوریان مەکگری ئاگاداری بابەتەکەبن.

گووتم : ڕاستی گلەیەکم هەیە لێت، لەبارەی وێنەکەوە دەزانیت هەموو ئەو کارانەم لەپێناو ئەم ڕێگایەدا ، ڕێگای شۆڕش ئەنجامداوە. منیش کەسێك نیم جێگا و پلە و پایەکەم بکەوێتە مەترسیەوە ئەم جۆرە کارانەش بەبیری کەسێك دەهێننەوە زۆر جێگای متمانە نەبێت .

لەوکاتەدا سەید ئەحمەد دایی بە پشتمدا، پێکەنی و گووتی : ئیمام هێندە متمانەی پێتە من کە کوڕیم هێندە متمانەی پێم نییە .

بەهەرحاڵ، بڕیار وابوو شەو لەبارەی بەرنامە ڕێژی و پلانی کوشتنەکەی ڕۆجەرزەوە بدوێین .

ئەو ڕۆژانە بەڕاستی ناهێمن و پڕ لە کێشەو گرفت بوون، خومەینیش لەیەکێك لە دیدارە ڕۆژنامەوانیەکانی مەهدی بازرگان سەرۆك وەزیرانی حکومەتی کاتی، زۆر توڕە بووبوو. خەریك بوو بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ دەرکرد، لەناکاو دکتۆر ئیبراهیم یەزدی، بە برینداری و خویناڵینەوە هاوڕێ لەگەڵ دکتۆر حاج سەید جەوادی و ئەسەدوڵا موبەشیری، هاتنە ژوورەوە. یەکەمجاربوو خومەینی بەو توڕەیەوە ببینم پرسی چی ڕویداوە ؟

ئەسەدوڵا موبەشیری ڕوونی کردەوە، دووکەس لە ژەنراڵەکان ( نادر جەهانبانی و مەنوچهر خوسروداد ) بە دەست و قاچ بەستراوی، لەکاتی لێکۆڵینەوە کورسیەکە دەشکێنن و هێرش دەکەنەسەر دکتۆر یەزدی و بەسەختی بریندار دەکەن. موبەشیری هەندێ ترش و خوێ کرد بەسەر

ڕوونکردنەوەکەدا، بە بیستنی ئەم قسانە خومەینی لە پێستی خۆی هاتەدەرەوە و بەدەنگی بەرز هاواری کرد، ئەو صادقە شێتە لەکوێ یی یە ؟ لەهەر کوێ یەکە بیدۆزنەوە و بیهێنن بۆ ئێرە ، هەمووومان دەمانزانی صادقە شێت، مەبەست لێی صادق خالخالیە. بەهۆی هاوڕێیەتی لەگەڵ سەید مستەفا کوڕی خومەینی، وەك خزمەتکارێکی ماڵی خومەینی لێهاتبوو.

دوو سێ خولەك دواتر، شێخ صادق هاتە ژوورەوە. خومەینی ڕووی لێکرد و گووتی: هەر ئێستا دادگای شەرعی شۆڕش دادە مەزرێنیت، بە هەڵسەنگاندن لەگەڵ یاساکانی شەرعی ئیسلام بڕیاردەردەکەیت، ئەمڕۆ هەتا پێش خۆرئاوابوون دەبێت یەکەمین حوکم دەربکەیت. هەتا خوێن نەڕژێت ئەم شۆڕشە سەرناکەوێت .

خالخالی داوای کرد، چەند خولەکێك بەتنها لەگەڵ خومەینی بمێنێتەوە، هەتا ڕێنمایی زیاتر وەربگرێت ، بێ درەنگ هەمووومان چوینە دەرەوە. کۆبونەوەکەی خومەینی و خالخالی هەتا کاژێری یەك ی دوای نیوەڕۆی خایاند، ئەویش لە ژوورێکی داخراو، تەنانەت سەید ئەحمەدیش بۆی نەبوو بچێتە ژوورەوە.

کاژێر یەك خومەینی بانگی کردین، هەرکە چووینە ژوورەوە گووتی : دادگای شۆڕشی ئیسلامی، لە ئەمڕۆوە لە ژێر چاودێری شێخ صادق دەستبەکار دەبێت. لەبەرئەوەی ئێوە هێز و بازووی منن، گروپێکی لێهاتووی ڕەمی کردن لە کوڕەکانی ژێردەستی خۆت پێکبهێنە. هەتا حکومەکانی ئیسلام دژی هەڵگەڕاوەکان و دوژمنانی خودا و پێغەمبەر

جێبەجێ بکەن. هەر ئێستا فەرمان بە نوسینگەکەم دەکەم، حکومەکانی شێخ صادق و ئێوە بنوسنەوە ، خودا پشتیوانی هەردوو لاتان بێت، ئەم شێخ صادقە وەك کوڕی خۆم وایە، پەیمانی لەگەڵ ببەستن .

بەم جۆرە تیغی شێخ صادق خالخالی، کەوتە کار. بەداخەوە من و پارتیزانەکانم بۆ ماوەیەکی درێژی دەلاڵی ئەم زوڵم و تاوانانە بووین. ئەو ڕۆژە ڕووداوێکی تایبەت ڕووی نەدا، ئەگەریش ڕوویدا بێت من ئاگاداری نەبووم ، چونکە تەواوی ڕۆژەکە، سەرگەرمی کاری برادەران و پێکهێنانی دەستەی ڕەمی بووم ، تەنها ئەوە دەزانم، کاژێر ٤ ی داوی نیوەڕۆ جارێکی تر خالخالی چوو بۆ دیدار لەگەڵ خومەینی هەتا پێ ی بڵێت ئەمڕۆ کاری دادگا تەواو نابێت، سبەی کە چوارشەممە دەکات کاروبارەکان تەواو دەبن. خومەینیش ڕازی بوو .

ڕۆژی چوارشەممە کۆبوونەوەی دادگا، لە دواناوەندی ژمارە دووی عەلەوی دەستیپێکرد. یەکەمین تۆمەتبارەکان ژەنراڵ نصیری و ژەنراڵ خوسروداد و خوالێخۆشبوو ژەنراڵ ڕەحیمی هاوشاریم لەگەڵ ژەنراڵ ناجی بوون، ڕووبەڕووی شێخ صادق کرانەوە. ئاگر خۆشکەری شەڕەکە کۆلۆنێل تەوەکولی بوو، بۆئەوەی پیس و چەپەڵی ئەم پاوەتان بۆ باسبکەم، خراپ نییە بۆ یەکەمینجار ڕازێکتان بۆ ئاشکرابکەم ، خاڵخاڵی حوکمی هەتاهەتایی بۆ ژەنراڵ ناجی بڕیبویەوە ، بەڵام ئەم تەوەکولیە، هێندەی خوێند بە گوێ ی خومەینیدا، هەتا بەتەواو تووڕەی کرد و خالخالی دایە بەر توانج و تەشەر و قسەی سوك، ئەویش ناچاربوو حوکمەکەی بگۆڕێت بە لە سێدارەدان .

بەم جۆرە ئەو شەوە لەسەربانی قوتابخانەی ژمارە دووی عەلەوی، هەر چوار کەسەکە، کە بەڕاستی گاڵتەیان بە مەرگ دەهات لەبەرامبەر دەستەی ڕەمی، کە لە کوڕەکانی لیبیا پێکهاتبوو وەستان و بەفەرمانی من خەڵتانی خوێنکران و کەوتنە سەر زەوی .

بە پێچەوانەی ئەوەی نوسراوە، خومەینی داوی گوللەبارانکردنیان هات بۆ دیتنی لاشەکانیان ، بەڵام سەید ئەحمەد و دارودەستەکەی، هەرلەیەکەم ساتدا لەسەربانەکەبوون، دوای دڵنیابوون لە مردنی ئەوان، خومەینی هەر لەوێدا نوێژی سوپاسگوزاری خوێند. لەوکاتەدا خومەینی و ئەوانی تر سەرگەرمی نوێژ خوێندن بوون، من و پارتیزانەکانم ناچار بووین، لەلایەنی ئاسایشیەوە پارێزگاریان لێبکەین .

لەناکاو سەرمنجم دا، جگە لە پەیامنێرانی ڕۆژنامەی اطلاعات و کەیهان، تەنها پەیامنێری بیانی لەوێ ئامادەبوو، ڕۆجەرز جۆنز بوو. لەوکاتەدا خەریك بوو، لەگەڵ سەید ئەحمەد دەچوونە خوارەوە. هیچ کارێکم لەدەست نەدەهات، هیچ جۆرە ئامێرێکم پێنەبوو، هەتا دوریان ئاگادار بکەمەوە .

دوای نوێژ خوێندن، هەموویان چوونە ژوورەوە. ئەو شەوە هەتا کاژێر ٤ ی بەیانی خومەینی بێدار بوو. منیش ناچار بووم نەخەوم، کاژێر ٤ ، خومەینی ڕۆشت بۆ پشوودان، من و سەید ئەحمەد بەتەنها ماینەوە، گووتم : ئەگەرچی کاتەکە درەنگە ، بەڵام بڕیاربوو ئەم شەو پێکەوە قسەبکەین .

سەید ئەحمەد گووتی : چاوەڕێم هەتا ئیمام خەوی لێدەکەوێت، بۆ ئەوی تۆ ئازاد تر بیت. هەر لێرەبە هەتا دەگەڕێمەوە .

لەوانەیە هەمووی پێنج خولەکی نەخایاندبێت، سەید ئەحمەد گەڕایەوە و گووتی : بڕۆین، لە ژوورەکە هاتینە دەرەوە و دوبارە، گەڕاینەوە بۆ ڤوتابخانەی ژمارە دووی عەلەوی، ئەبو شەریف و محەمەد غراضی، کە ئێستا وەزیری نەوتە، چاوەڕێمان بوون. شپرزە و ترساو دەهاتەنە بەرچاو ، سەید ئەحمەد پرسی لەکوێ یە ؟

محەمەد غراضی گووتی : کارەکە کۆتایی پێهات .

سەید ئەحمەد گووتی : یعنی چی ؟ چۆن چۆنی کارەکە بەکۆتاهات ؟.

غراضی گووتی : ئەو ناپیاوە زۆر هەوڵی دەدا دەنگ بەرز بکاتەوە، سەرەڕای ئەوەی ڤوتابخانەکە ڤەرەبالغ بوو، لەم گێرە و کێشەدا، دکتۆر مطهری و بەهەشتی هاتن، نزیکەی ١٠ خولەك لەبەردەم دەرگای تەوالێتەکان وەستان و خەریکی گفتوگۆبوون، لەو ماوەیەدا بەهەر بەدبەختیەك بێت نەمانهێشت دەنگی لێ دەربێت ، بەڵام لەکۆتایدا هەناسەی لێبڕا . سەید ئەحمەد بەهێمنی و لەسەر خۆ گووتی : واتە خنکا ؟

ئەبو شەریف گووتی : نەماندەویست ، بەڵام ڕوویدا .

سەید ئەحمەد بەشپرزەیی و دەسەپاچەیەوە، بە ئەبو شەریف و غراضی گووتی: بەجەهەنەم خنکا بەڕێز شەفیعزادە لەبەهەدەردانی چەند گوللەیەك ناسودە بوون، باشە ئێستا بڵێن تەرمەکەی لەکوێ یە؟

غراضی و ئەبو شەریف، بە پرسیارەکەی سەید ئەحمەد زۆر تێك چوون و ترسیان لێنیشت ، دەستیان بەڕوونکردنەوە کرد ، تەرمەکە هەر لە توالێتەکەیە و زۆر هەوڵماندا کەس نزیکی ئەو ناوچەیە نەبێتەوە .

سەید ئەحمەد پرسی ئایا سەیری جانتا و وێنە و کەلوپەلەکانیتان کرد؟ چونکە وەلامەکەیان نەرێ بوو بەپەلە گووتی : کەواتە بابڕۆین بە دوایدا ، لە پێشەوە غراضی و من و سەید ئەحمەد، لەدواشەوە ئەبو شەریف بەرەو تەوالێتەکان بەڕێکەوتین، کاژێر ٤ چوار و سی خولەك کەمێك لایدابوو، غراضی چووە کۆتا تەوالێت و دەرگاکەی کردووە ، بەلام هیچ تەرمێکی لێ نەبوو. هەمووومان سەرمان سوڕما .

ئەو قسانەی دوریان لەبارەی گرنگی پاراستنی گیانی ڕۆجەرزوە کردی، هەروەها غافلگیریەکەی سەربانی قوتابخانەو ڕۆشتنە خوارەوەی ڕۆجەرز لەگەڵ سەید ئەحمەد و ڕووداوی خنکانەکەی و دواتر دیار نەمانی تەرمەکەی، ئیتر پێویستی بەڕونکردنەوە نەدەکرد، لە چ دۆخێکی دژوار و پڕ دڵەڕواکێ دام ئەوانیش زۆر لەمن باشتر نەبوون. سەید ئەحمەد بەتەواوەتی هێمنی و ئارامی لەدەستدابوو، ئەبو شەریف و غراضی خەریك بوو دڵیان ڕادەوەستا .

هەرچوار تەوالێتەکەی تر گەڕان ، بەلام هیچ هەواڵێك لە مردوو یان زیندووی ڕۆجەرز نەبوو ، سەید ئەحمەد، بەردەوام دەیپرسی: ئێوە دڵنیان خنکاوە؟ خۆتان لاشەی ساردەوەبوی ئەوتان بینی؟ ئەوانیش وەلامیان دەدایەوە ، نەك هەر تەنها لاشەی ساردەوەبوی و خنکانی تەنانەت نزیکەیی یەك کاژێر لەسەر سەری بووین .

من گووتم : لەوانەیە لەو ماوەیەدا برادەران هاتبن و لەبەردەم دەرگای تەوالێتەکە، تەرمەکەیان بینی بێت و بردبێتیانە ژوورەکەی کۆلۆنێل تەوەکولی، باشترە سەرێك لەوێ بدەین .

لەوێش هیچ هەواڵێك نەبوو، پاسدارە پاسەوانەکان هیچ هەڵسوکەوت و جموجوڵێکی نامۆیان نەدیبوو، ئیتر کارێکمان لەدەست نەدەهات، سەید ئەحمەد، مۆڵەتی ڕۆشتنی بە ئەبو شەریف و غراضی دا، ڕووکردە من و گووتی : چارەیەکمان نییە، دەبێت ئیمام خەبەر بکەینەوە و بابەتەکەی بۆ باس بکەین.

من ئەم ڕووداوەم بەهەلزانی بۆ بچوکردنەوە و زیان گەیاندن بەوان، گووتم : من وابیر دەکەمەوە ئەمانە هەردوکیان درۆدەکەن، لێرە باڵندەش ناتوانێت بە بێ ئیزنی پاسدارەکان بفڕێت، چۆن دەکرێت تەرمێك سەرنگوم ببێ ، ئەویش لەدەستی ئەم دووانە.

سەید ئەحمەد گووتی : لەمانە بەتایبەتی ئەبو شەریف هەرکارێك بڵێیت لێیان دەوەشێتەوە، خۆ پێشینەی دەزانن .

گووتم : کاتێك بەئێوە دەڵێم، نمایش جیاوازە لەگەڵ کردار. دەبێت پلان و بەرنامە دابڕێژین، هەموو ئەگەرەکان بخەینە پێش چاو، دواتر ئەنجامی بدرێت. ئێوە وابیرتان دەکردوە، کە من نامەوێت کارەکە ئەنجام بدەم، دەچن ئەم دووچەپەڵە ڕادەسپێرن و دواتر دەبێتە مایەی دەردی سەر بۆتان. سەرەڕای ئەوەی سەید ئەحمەد هاوڕابوو لەگەڵم گووتی : ئێستا لەشەڕی جۆنز ئاسودەبووین ، بەڵام دەترسم مەسەلەی ونبوونی تەرمەکەی، کارێك بدات بەدەستمانەوە .

نزیکەیی پانزە خولەکی مابوو بۆ شەشی بەیانی، من و سەید ئەحمەد، خۆمان گەیاندە بەردەم ژوورەکەی خومەینی. سەید ئەحمەد وەك من وا هەستی کرد، خومەینی هێشتا لە خەودایە. بە ئارامی دەسکی دەرگاکەی گرت ، بەلاّم ئەو شەوە تەقەوی نیا لەبەردەم دەرگای ژوورەکەی خومەینی ئێشکگر بوو، لەناکاو گەیشت و گووتی : ئیمام فەرموویانە کەس نەیەتە ژوورەوە میوانیان هەیە.

سەید ئەحمەد گووتی : تەنانەت منیش .

تەقەوی نیا گووتی : فەرمویانە هیچ کەس .

بەتەقەوی نیام گووت بۆچی ئیمام نەنوستوون، میوانەکەیان کێیە ؟.

تەقەوی نیا گووتی : یەك کاژێر دەبێت ئیمام بیداربونەتەوە. لەگەڵ بەڕێز کیانوەری[15] لە کۆبونەوەدان.

بەپەلە گووتم : هەمان کیانوەری تودەیی[16]؟

---

[15] نورالدین کیانوەری، ناسراو بە ڕەفیق کیا ، چالاکی سیاسی و خاوەن بڕوانامەی دکتۆرا لە ئەندازیاری بیناسازی و شارستانی لەدایك بووی ساڵی ١٩١٥ ی بەلدەی سەربە شارۆچکەی نور لە پارێزگای مازندەران یەکێك بووە لە ئەندامە چالاك و کاریگەرەکانی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی تودە، لە پلۆنۆمی شانزەیەمی کۆمیتەیی ناوەندی لە ساڵی ١٩٧٨ بە سکرتێری گشتی حیزب هەڵبژێرا. هەتا کاتی دەستگیرکران و یاساغ کردنی پارتەکەی بەتۆمەتی کودەتا لە ساڵی ١٩٨٣ لەو پۆستەدا مایەوە ، سەرئەنجام لە ساڵی ١٩٩٩ لەتەمەنی ٨٤ ساڵی لەتەهران کۆچی دوایکرد . وەرگێڕ

[16] تودە ، یەکەمین پارتی جەپگەرایی ئێرانی لەساڵی ١٩٢٠ لە لایەن ٥٠ کەس لەڕۆشنبیران و چالاکانی سیاسی چەپگەرا و میللی گەرا لە ژێر چاودێری ( سلێمان میر ئەسکەندەری ، بزورگ عەلەوی ، ئیرەج

بەجێگای تەقەوی نیا سەید ئەحمەد وەڵامی دایەوە و گووتی : ئەوان بە جۆرێك خزمانن.

داوتر لە تەقەوی نیام پرسی، بەتەنهان ؟ وەڵامی دامەوە گووتی: خانمی کیانوەریش چونەتە خزمەتی هاوسەری ئیمام ، هەگەر سەید ئەحمەد ناوی خاتوونی کیانوەری بیست، بەرەو ژوورەکەی دایکی بەڕیکەوت .

تەقەوی نیا زۆر بەهێواشی گووتی: خاتوو دوریان چوار جار هەواڵی پرسیت و بەدواتدا دەگەڕا ، گوتیان هەگەر پەیدابوویت پەیوەندیان پێوەبکەیت

گووتم : ئێستا لەکوێ یە ؟

گووتی: لەگەڵ خاتونی کیانوەری لە خزمەتی هاوسەرەکەی ئیمامن .

بێخەوی و بەدوای یەك داهاتنی ڕووداوەکان و هەواڵی ناجۆر و غافلگیر، بەگشتی خەریك بوو لە پێ ی دەخستم، لەبەرئەوە بیرم کردەوە تەنها خەو دەتوانێت هەندێ لە وزە لەدەست چووەکانم بۆ بگێڕێتەوە.

بەتەقەوی نیام گووت، پێنج، شەش شەوە نەخەوتووم، دەچم لە جێگای حەوانەوەکەی تۆ کەمێك دەخەوم ، ئەگەر ئیمام یان دوریان منیان ویست خەبەرم بکەرەوە، ئەگەرنا هەرکەسێکی تر هەواڵی پرسیم بڵێ نازانم لە کوێ یە .

---

ئەسکەندەری ، ئەنوەر خامەیی ، ئیحسان طبری ، خەلیل مەلەکی ، فەرید کشاورز ، عبدالحسین نوشین ، ڕەضا ڕادمنش ) دامەزرێنرا بەبەرەو پرۆگرامیان ( مارکسیزم ، سۆسیالیزم ، دیموکراسی ) بوو . وەرگێڕ.

کاتێك خەبەرم بوویەوە کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ بوو، زۆر بەتوندی سەرم دەئێشا، لەوانەیە ئەگەر تەقەوی نیا خەبەری نەکردمایەتەوە، تەواوی ڕۆژەکە بەئاگا نەهاتمایەتەوە. قوتابخانەی عەلەوی پڕ لە هەراو دەنگە دەنگ بوو، خۆشم سەرم سوڕمابوو، چۆن لەناو ئەو هەموو دەنگ و هەراو هۆسەدا خەوم لێکەوتووە .

تەقەوەی نیا گووتی : خومەینی و کیانوەری هەتا کاژێر نۆ و چەند خولەکێك، سەرگەرمی گفتوگۆبوون، دواتر خومەینی خۆی بەتەنها هاتووەتە دەرەوە. لەبارەی دوریانەوە پرسارم کرد .

گووتی : هەتا کاژێر ٩ ی بەیانی هەواڵم لێی هەبوو، دواتر هاتم بۆ پشوودان و ئیتر هەواڵم لێیی نیە .

بە خێرایی ئاوێکم کرد بە دەموو چاومدا و دوو حەپی ئازار شکێنم خوارد و گەڕامەوە سەرکارەکەم ئەوێش قەرەبالغ بوو ، ژوورەکەی خومەینی پڕبوو لە ئەندامانی دەوڵەتەکەی بازرگان و هەندێ لە ئاخوندەکانی تەهران و مەلای شارەکانی تر، چایچی و نعمانی پاسەوان و پارێزەر بوون، کاتێك لەوانم پرسی ئایا سەید ئەحمەدتان بینیوە یا نا ؟ گوتیان : لەگەڵ قطب زادە و دکتۆر یەزدی ڕۆشتوون بۆ بینایی سەرۆك وەزیران، دوریانیش ڕای سپاردبوون هەرکە لە خەو هەستام زەنگێك بۆ تەلەفۆنەکەی ماڵەوەیی لێبدەم .

چوومە ژوورەکەی خومەینی و لە دورەوە خۆم نیشاندا، هەرکە دڵنیابووم منی بینی هاتمە دەرەوە و بۆ تەلەفۆنکردن ڕۆشتمە نوسینگەکەی خۆم ئەوکات. تەلەفۆن سانسۆری لەسەر نەبوو ، لەبەر ئەوە زۆر بەئاسودەیی لە

نوسینگەکەی خۆمەوە تەلەفۆنم بۆ دوریان کرد ، بەڵام تەلەفۆنەکە مشغوڵ بوو

پەیوەندی تری لەگەڵدابوو، ماوەیەکی پێچوو هەتا لەکۆتایدا پەیوەندیەکەم وەرگیرا و توانیم گوێم لەدەنگی دوریان بێت .

گووتم : دەمەوێت بە زووترین کات بت بینم، هەتا لەبارودۆخەکە ئاگادارتان بکەمەوە.

گووتی : بۆچی بە تەلەفۆن نایڵێیت ، من ناچارم لەماڵەوە بمێنمەوە ، بەڵام رێکم خستووە کە ئەمشەو لەلام بیت دڵم تەنگ بووە بۆت .

گووتم : بابەتێکی گرنگ هاتووەتە پێش، ئەترسم درەنگ بکات، هەرچەندە ئێستاش وای بۆ دەچم درەنگ بووە ،

دوریان گووتی : پەیوەندی بە رۆجەرزوە هەیە ؟

گووتم : بەڵێ !

گووتی : زۆر خۆت سەخڵەت مەکە، زۆریش پەلە نییە. کاژێر ٧ ی ئێوارە دەبێت لێرەبیت هەتا لەبارەیەوە بدوێین .

دڵنیابووم دوریان بەبێ هۆ و بێ بەرنامە قسەناکات ، لەبەرئەوە یان بەتەواوەتی ئاگاداری رووداوەکەیە، بۆیە وا خەیاڵی ئاسودەیە، یان خۆی کارەکانی رێکخستووە و نایەوێت من گرفتاری مەسەلەکەی جۆنز ببم .

دوای ئەو گفتوگۆیە پلە بە پلە بارودۆخم بەرەو باشتر دەڕۆشت ، سەید ئەحمەد لە ئەنجومەنی وەزیران گەڕایەوە و ڕۆشتم بۆ دیدەنی، گووتی : ئیمام خۆشحاڵ بووە بە چارەنوسی ڕۆجەرز، لەبارەی ونبوونی تەرمەکەش، مەهدەوی کێنی و براکەی ڕاسپاردووە، هەتا بەدواداچوونی بۆ بکەن لەبیرت بێت لێرەبە ئیمام کاری تایبەتی پێتە .

هیچ گومانم نەبوو کە دیسان خومەینی پشتی پێبەستووم، لەبارەی بەرنامەڕێژیەکەی ئەو بۆ لەناوبردنی ڕۆجەرز بەدەستی من و پلانە گاڵتەئامێزەکەی سەید ئەحمەد و تێکدانی بەرنامەکان توڕە بووە.

کاژێر ٥ ی ئێوارە من و سەید ئەحمەد و شێخ مەلا شەهابی ئیشراقی و صادق قطب زادە بانگکراین، بۆ ژوورەکەی خومەینی. ئەمە تەنها یەك واتایی هەبوو ئەویش بەلایەنی کەمەوە لەوەها بابەتێکی گرنگدا، تەنها ئەم چوارکەسەمان جێگای متمانەی ئەوین .

خومەینی ڕاستەوخۆ دەستی بەقسەکردن کرد و گووتی : ڕوداوەکەی دوێنێ شەوی قوتابخانەی عەلەوی، ئێمەی بەرامبەر هەموو شتێك و کەسێك خستوەتە گومانەوە، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و کۆشش و ماندوبوونانەی ئەم بەڕێزانە و پاسدارەکان دەیکێشن ، بەڵام چونکە ئێرە ناوەندی سەرەنج ڕاکێشانە، بۆیە بیرمان کردەوە گونجاو نییە ئێمە و بنەماڵەکەم شەوانە لێرە بمێنینەوە. دەبێت لە فرۆفێڵی دوژمنەکانمان غافڵ نەبین .

ئەمڕۆ، لەگەڵ بەڕێز کیانوەری بە تێر و تەسەلی قسەمان لەسەر کردووە، لەلایەن ڕوسەکانەوە هاتبوو زانیاری پێبوو کە پلانی لەناوبردنمان لە ئارادایە و لەم جۆرە قسانە ، ویستم لەگەڵ ئێوە ڕاوێژبکەم و بیبڕێنمەوە ،

ئەگەر بەباشی بزانن، بە جۆرێك رێكی بخەن جێگای مانەوەی شەوانەمان لە شوێنێكی نهێنی بێت. جگە لە ئێوە كەسی تر ئاگاداری نەبێت، رۆژانە لێرەبین و شەوانیش لەوێ، هەتا انشاءالله هەرچی زووتر رێكی بخەین و بچین بۆ قوم .

شێخ مەلا شەهاب و دواتر قطب زادە و سەید ئەحمەد رازی بوون بە پێشنیارەكەی خومەینی. هەندێ داواكاریان خستەڕوو، لەكۆتاییشدا خومەینی ڕوویكردە من و گووتی : ئەم بەڕێز جەعفەرە و هاورێكانی، رێكخراوترین و بە تەقوا ترینن ، بەڵام واگومان دەبەم زۆر دەست كراوە نەبن. لەگەڵ ئەم كێشەو گرفتانەی كە سەری هەڵداوە، خراپ نییە ئێمەش شتێكمان بۆ خۆمان هەبێت و لەژێر چاودێری خۆماندا بێت. هەتا ئاگاداری پلانگێڕەكان بین، ئەوكاتەی لە نەجەف بووم، عێراقیە مەلعونەكان، گاردێكی تایبەتیان هەبوو، ئەڵبەت نەك بەو تێروتەسەلیە ، لەبەرئەوە واهەست دەكەم ئێمەش پێویستمان بەوەها شتێك دەبێت بۆ خۆمان، بۆیە دەبێت بەرێز جەعفەر وەها هێزێك دابمەزرێنێت، لە خۆی و ئەو كەسانەی لە فەرەنسا بوون، ئەڵبتە خەرجی و پێداویستیەكانی بەرێز شێخ شەهاب لەبەشی ئیمام دابینی دەكەن، نە لە دەوڵەت و نە لە هیچ كەسێكی تر. ئێستاش دەنگە دەنگی لەسەر مەكەن .

شێخ شەهاب پێشنیاری كرد، ئەو هێزە ناوبنێین دەستەی شەهادەت ، بەڵام خومەینی دەستبەجێ گووتی : زۆر بیر لەناو مەكەنەوە، ئێستا كاتی ناو نییە ، بەڵام بە پشتیوانی خودای تبارك و تعالا، كاتێك گەیشتە نزیكەی سێ، چوار هەزاركەسێك بۆ وێنە؛ ناوی بنێن سوپای ضربتی شۆڕش یان شتێكی نزیك لەم ناوە .

بەم جۆرە بەخواستی تایبەتی خومەینی، کرام بە کەسی یەکەمی کارەکە. نوسینی ئەم یادەوەریانە لەڕاستیدا پێشەکیەکە بۆ دەرخستنی کارنامەی ئەوان، ئەو کارنامەیەی کە دواتر بۆتان باس دەکەم .

جیگا نوێ یەکەی خومەینی بۆ مانەوە، هەمان خانووەکەی زەعفەرانیە بوو، لە کۆلانی ئێران. پلانی گواستنەوە هەمان شەو جێبەجێکرا، چایچی و نعمانی گواسترانەوە بۆ زەعفەرانیە، تەقەوی نیاشم ڕاسپارد، هەتا پارتیزانەکانی تر بۆ کۆبونەوەیەکی گرنگ، بۆ سبەی بەیانی ئاگادار بکاتەوە. خومەینی هەتا ٢٦ ی شوباط، مۆڵەتی پێدام بۆئەوەی کارە سەرەتاییەکانی سوپای ضربت دەست پێبکەم ، خومەینی بۆ یەکەمین جار ژمارە تەلەفۆنە تایبەتیکەی، خۆی پێدام هەتا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لەو کاژێرە تایبەتیەی بۆی دیاریکردبووم، بتوانم پەیوەندی پێوەبکەم ، هەروەها فەرمانی بە شێخ شەهاب کرد، هەر ئێستا پێنج ملیۆن تومانم بۆ خەرجی کارە سەرەتاییەکان پێبدات .

دەستی خومەینیم ماچکرد و بە خۆشحاڵیەوە لە خانووەکەی کۆلانی ئێران هاتمە دەرەوە. نزیکەی کاژێر ٨ ی شەو گەیشتمە ماڵی دوریان، وەك هەمیشە شۆخ و شەنگ و دڵڕفێن بوو. هەواڵێك لە جل و بەرگی ئیسلامی نەبوو، زیاد لە جاران ماکیاژی کردبوو. هەرکە چوومە ژوورەوە باوەشی پێداکردم و گووتی : لەهەموو تەمەنم هیچ کات دڵم بۆ هیچ کەس ئەوەندە تەنگ نەبووە .

کاتێك هەواڵی دامەزراندی سوپای ضربتی لە زاری منەوە بیست، لە خۆشحاڵیدا قیژاندی ، چونکە گوتبووم چەند ڕۆژێك مۆڵەتم هەیە، هاواری

کرد لەمە باشتر نابێت، کاتێك ئەمشەو میوانەکان ڕۆشتن مانگی هەنگوینیمان دەست پێدەکەین .

پرسیم : مەگەر میوانت هەیە ؟

گووتی : میوانی پایەبەرز هەموویان بە تاسەوەن فەرماندە جفری ببینن .

گووتم : کەواتە پێش ئەوەی میوانەکان بگەن دانیشە هەتا لەبارەی جۆنزەوە قسەت لەگەڵ بکەم ، پێش ئەوەی قسەکەم تەواو بکەم، گووتی : هەواڵی هەڵهاتنی مردویەك لە پەناگوێ ی ئیمام زۆر بۆم سەرنج ڕاکێش نییە .

گووتم : کەواتە تۆش ئاگاداریت ؟

گووتی : هەرچونێك بێت خەریکە درەنگ دەکات، هەستە خێراکە حەمامێك بکە دواتر چاکەت و پانتۆڵێکی نوێم بۆ کڕیویت لەبەری بکە و وەرە خوارەوە . ئەوەندەی نەماوە میوانەکان بگەن .

ئەمە یەکەمین جار بوو، لەهەموو تەمەنمدا کەسێك شتێکم بۆ بکڕێت، ئەویش چاکەت و پانتۆڵ ، لەدوای ئەو قسەیەی لەبارەی دیاریەوە، مافی خۆم بوو خۆشحاڵبم. هەتا ئەو جێگایەیی لەبیرم بێت تەنها خۆم جل و بەرگم بۆ خۆم کڕیبوو، ئەویش بە زەوق و سەلیقەی قەدریجانی خۆم ، ئەڵبەتە ئەو پۆشاکانەی سەلامەتیان لە پاریس بۆی کڕیم، لە ڕاستیدا بە پارەی خۆم و بۆ پاراستنی بۆ وێنە ئابڕوی خۆیان بوو ، بەڵام ئەمەیان ژنێك ، ژنێك پڕ لە ڕاز و خۆشەویستی بۆی کڕی بووم، چەند جوان و گونجاو بوو بۆم، هەڵپەڕیم و وەك منداڵێکی خۆشحاڵ دوریانم ماچکرد. ڕۆشتم بۆ حەمام ڕیشم تاشی، بۆ یەکەم جار بڕێکی زۆر عەترم لەخۆمدا،

به دڵخۆشی و خۆشحاڵیەوە لە قادرمەکان هاتمەخوارەوە. دوریان خەریك بوو لەگەڵ کەسێك بە ئینگلیزی قسەی دەکرد ، وا گومان برد یان بەتەلەفۆن قسەدەکات، یان میوانەکان گەیشتوون ، بەلام دوای چەند چرکەیە لە گەیشتنم بۆ هۆڵەکە خەریك بوو دڵم ڕاوەستێت ، ڕۆجەرز جۆنزی جوان و کەشخە پەرداخێك ویسکی بەدەستەوە بوو، هەرکە منی بینی، لەجێگای خۆی هەستاو ڕوو لە دوریان پشت لە من بە فارسیەکی ڕەوان گووتی : ئەمەش جیفری ئەزیز ، سلاو جیفری .

هێشتا لەسەر سوڕمانی و حەپەساویدابووم ، ڕۆجەرز پەداخە ویسکیەکەی لەسەر مێزەکە دانا و بەتوندی پاوەشی پێداکردم و دەستی بە پێکەنین کرد ، بێ شك ڕووداوێکی تەماشایی و سەرسوڕهێن بوو بۆم .

جۆنز ڕوونی کردەوە، کە بەگیان قەرزای من و دوریانە ، دەیگووت ئەگەر ئێمە ئاگادار نەبوونایە لەوانەیە بەدەستی خودی من کوژرابا ، هەورەها گووتی : کاتێك مرۆڤ لە پلانێك ئاگادار بێت، ڕێگای ڕووبەڕوو بونەوەشی دەدۆزێتەوە. ئەو کاتەی لەگەڵ سەید ئەحمەد هاتمە خوارەوە، ئیتر بەشەکەی تری سیناریۆیەکەم لەبەرچاو بوو ، دەبوو من بخنکامایە، هەتا بتوانم هەڵبێم ، بەلام هەر بەڕاستی ئەوان گێل و نەزانن .

پرسیم : بەلام بۆمن بابەتی هەڵهاتنەکەت لە خنکانە ساختەکەت سەرنج ڕاکێش ترە ! چۆن لەناو ئەو بازنە ئاسایش و ئەمنیەدا هەڵهاتی ؟

جۆنز پێکەنی و گووتی: هەڵنەهاتم، لەبەر چاوی هەمووان لەوێ هاتمەدەرەوە، ئەڵبەتە بەیارمەتی دوریان و فاتی و عەبایەکی نوێژ خوێندن.

دەنگی پێکەنینی هەرسێکمان بەرزبوویەوە و لەناکاو زەنگی دەرگا لێدرا .

کاتێك دوریان ڕۆشت بۆ پێشوازی کردنی میوانەکان، جۆنز کە ئەویش بەهێندەی دوریان فارسی دەزانی، لەماوەی دومانگی ڕابردوودا، تەنانەت یەك وشە فارسیم لێنەبیست بوو، گووتی : شەوێك پێش گەڕانەوەم بۆ ئەمریکا، سێ قۆلی دادەنیشین و داستانەکەتان بۆ دەگێڕمەوە، هەتا کەمێك پێبکەنین .

میوانیەکە هەتا کاژێر ١٢ ی شەوی خایاند. ولیام سلڤانی باڵوێز و ژەنڕاڵێکی ئەمریکی و کۆلۆنێل بەیکەر و چەند کچێکی شۆخ و شەنگ ئەو شەوە میوان بوون، نانی ئێوارە سەندویچی بچوك بوو دوریان ئامادەی کردبوو ، دوای نانخواردن، جگە لە من و جۆنز و کچەکان، ئەوانی تر چوونە ژورێکی تر هەتا پێکەوە قسەبکەن .

ئێمەش ساتەکانمان، بەسەیرکردنی فیلمی ئەمریکی کە بە ڤیدیۆ کاسێت لێمان دەدا بەڕێکرد، دوای ڕۆشتنی میوانەکان، دیسان من و دوریان بەتەنها ماینەوە ، لەبەرئەوەی ژووری نوستنەکەمان بووبەیەك لەتەنیشت یەکدا خەومان لێکەوت ، کاتێك لەخەو هەستام کاژێر ٩ ی بەیانی بوو، دوریان هێشتا لە خەو دابوو ، دوای چەند ساڵێك، ئەوە یەکەمجار بوو بەهۆی ماندوبونێکی بەتین وەها خەوێکی درێژم هەبێت .

بەتەلەفۆن پەیوەندیم بە تەقەوی نیاوەکرد، ناکامی هەوڵەکانی بۆ کۆکردنەوەی پارتیزانەکان بۆ کۆبونەوە پێڕاگەیاندم، هەموویانی ئاگادار کردبویەوە، بە پێ ی بڕیاری پێشوو، کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ کۆبوونەوەمان دەبێت .

لەدەنگە دەنگی من دوریان خەبەری بوویەوە، دواتر پێکەوە نانی بەیانیمان خوارد. چەند ڕۆژێك دەبوو بە کامی دڵی خۆمان پێکەوە قسەمان نەکردبوو ، پێچەوانەی ڕۆژەکانی تر دوریان غەمبار و دڵتەنگ دەهاتەپێش چاو، هیچ هەواڵێك لە خوشحاڵی و دڵخۆشیە هەمیشەیەکانی نەبوو ، هیچ گومانێکم نەبوو، هۆکاری ئەم دڵتەنگی و غەمباریەی پەیوەندی بە کۆبونوەکەی دوێنێ شەوی لەگەڵ ولیام سلیڤانی باڵوێزی ئەمریکاوە هەیە. یەك لە دوای یەك پێداگیریم دەکرد و ئەمخستە ژێر گوشارەوە هەتا هۆکاری دڵتەنگیەکەیم پێ بڵێت ، بەلاّم هیچ سودی نەبوو، وەلاّمی نەدامەوە و تەنها گووتی : دەبێت زۆر وریا و چاو کراوەبیت ، چونکە خەریکە زۆر شت دەگۆڕێت، بەم جۆرە لەوانەیە بە جێگایەك بگەین کە ناچار بین ئێران بەجێبهێڵین.

دوریان هەموو جۆرە ڕوونکردنەوە و ڕاڤەیەکی تری بەڕۆژەکانی ئایندەوە بەستەوە، تەنها ئامۆژگاریەك بۆ من هەیبوو، ئەوە بوو (هەرچی زووتر هەوڵبدە سوپای ضربت پێکبهێنە و مەچۆرە ژێر کاریگەری منداڵ بازاڕیەکانی ئێرە ، بەدڵنیایەوە سەرێك لە هاوڕێ کۆنەکانت بدە، کە ئێستا لە قوم نیشتەجێن ، چونکە بەکەڵکمان دێن)

ئەو کاتەی ئەوم دەگەیاند بۆ جێگا نوێ یەکەی خومەینی و بنەماڵەکەی، گووتی : کاژێر ٨ ی شەو کۆبونەوەیەکی گرنگمان هەیە دەبێت تۆش لەوێ بیت .

گووتم: ئیتر بێزاربووم لەم کۆبونەوانە، ئەمەیان پەیوەندی بەچی یەوە هەیە، بە بۆچوونی خۆم دوریان بەزۆر ڕێگری لە فرمێسکەکانی کردبوو

خەریك بوو دەیشاردنەوە گووتی: کۆبونەوەکەی پاریس و لیستی لە سێدارەدانەکانی بەریتانی و ئەمریکیەکانت لە بیرە ؟ کۆبونەوەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە.

ئەمەی گووت و دوای ئەوە بەتوندی باڵی گرتم و گووتی : جەعفەر من ئەم جۆرە شۆڕشانە باش دەناسم، خەریکە هەموو شتێك تێکدەچێت، پەیمان بدە هەتا کۆتایی لەگەڵ من و بەتەنها لەگەڵ من بیت .

چونکە، گەیشتبووینە ماڵە نوێ یەکەی خومەینی، تەنها توانیم بڵێم دڵنیابە، دواتر ناچار بووین هەتا کاتی کۆبونەوەکەی شەو لەیەکتر جیابینەوە .

سەرێکم لە قوتابخانەی عەلەوی دا. وەك هەمیشە قەرەباڵغ و ئاڵۆزکاو بوو، سەید ئەحمەد گووتی : ئیمام کاری پێتە، دەبێت چەند خولەکێك چاوەڕێ بیت هەتا دەوروبەری چۆڵ دەبێت .

پرسیم هەواڵێك لە جۆنز هەیە ؟

گووتی : هێشتا نا ، بەلاّم مەهدەویەکان سەرگەرمی لێکۆڵینەوەن، صادقی خۆمان ،(صادق طباطبایی) گووتویەتی : ئەگەر پێویست بکات سود لە حزب الله ی لبنان وەردەگرین بۆ بەدواداچوونی بابەتەکە .

گووتم : مەگەر ئەویش ئاگاداری بابەتەکەیە ؟

گووتی : دەڵێن چەمران ئەوی ئاگادار کردۆتەوە، ئێستا پرسیای من و ئیمام ئەوەیە، چەمران چۆن چۆنی زانیاری لەبارەی ڕوداوەکەوە دەست کەوتووە ،

گومانم وایه کاری ئەبو شەریف بێت ، چونکە بەردەستی چەمرانە و یەکێکە لە کوڕەکانی سەربازگەی ئەمل، بۆچونێکی ترمان کوڕەکانی طالقانین کە زۆر بەخراپی بونەتە شۆڕشگێر، لەکاتێکدا لەناخەوە کۆمەنیستن .

چەند خولەکێك دواتر، دیدار لەگەڵ خومەینی دەستی پێکرد، هەواڵم پێدا ئەمڕۆ یەکەمین کۆبونەوە لەباری دروستکردنی سوپا دەبەستین و ڕاستەوخۆ ئامادەکاریەکان دەست پێدەکەین .

خومەینی بە هەواڵەکە خۆشحاڵ بوو و گووتی : لەبارەی ئێوە وە هەندێ شت گوتراوە، لەوانەیە شورای شۆڕش بانگێشتان بکات بۆ لێپرسینەوە، سەرپێچی نەکەیت و بڕۆ خۆڕاگر و بەهێز لە بەرامبەریان ڕاوەستەو بڵێ، من لەناو بەرنامەی سەرەکی شۆڕشدانیم، تەنها بەرپرسیارێتی پاراستنی ئیمامم لە ئەستۆدایە.

گووتم: ئەگەر مۆڵەت بفەرموون سەفەرێك بۆ قوم و ئەسفەهان بکەم، هەندێ لە قوتابیە گەنجەکان[١٧] و ئەو کەسانەی لە قەدریجان دەیانناسم و خاوەن دڵ و دەرونێکی پاکن هەڵبژێرم و لە سوپا دایانمەزرێنم .

خومەینی خەندەیەکی کرد و گووتی : کارت بەسەر قوتابیەکانەوە نەبێت، ناتوانرێت پشتیان پێببەسترێت، لەبری ئەوە باشترە لە قوم و ئەسفەهان سەرگەرمی کاری تربیت .

---

[١٧] مەبەست لێ ی قوتابی دینیە کە لە حەوزەی عیلمی قوم بۆ مەلایەتی دەخوێنن. وەرگێڕ

دەستیم ماچکرد و ویستم خواحافیز بوونی لێبکەم و گووتی : بۆ ئەم سەفەرانە باشترە هێلکۆپتەر بەکاربهێنیت ، هەرنێستا فەرمانەکەی دەردەکەم .

لەگەڵ تەقەوی نیا، گەیشتینە کەرەج، بۆ ئەوەی کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ بچین بۆ کۆبونەوەکە، لە باغەکەی حاجی نادری جەهانبانی، ئەم باغە هەتا ئەو ڕۆژەی جێگایەکی جێگریان پێداین، وەك سەربازگەی سەرەکی سوپای ضربت سودمان لێوەرگرت، دواتر باغەکەمان ڕادەستی خالخالی کردەوە.

بەدرێژایی ڕێگاکە، قسە هیوا بەخشەکانی خومەینی و متمانەی زیاد و لەڕادەبەدەری بۆ من و قسەکانی ئەم بەیانیەی دوریانم هەڵدەسەنگان، هەرچی هێنام و بردم نەمتوانی پەیوەندیەکی بەجێ لە نێوانیاندا بدۆزمەوە .

لەبەرئەوەی ئاگاداری پێگە و ڕۆڵی دوریان بووم، لە هەموو ڕووداوەکانی شۆڕشدا، هێندە قسەکانی دوریان کاریگەریان لەمندا جێ دەهێشت، قسەکانی خومەینی هێندە کاریگەری نەبوو ، بەلاَم هەرچونێك بێت ئەوە خومەینی بوو، ئەگەر بیگوتبا ماست ڕەشە ناچار دەبوو بمانگوتایە ڕەشە .

بۆ کەسێکی وەك من، کە هێشتا ئەزموونی ئەم ڕۆژانەم نەبوو، هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوانە کارێکی ئاسان و سادە نەبوو ، بۆ ئەوەی خۆم لەو هەموو سەرگەردانیانەی هزرم ڕزگارکەم، لە تەقەوی نیام پرسی: بەڕاست هەواڵێکت لە بنەماڵەکەت هەیە ، ئایا توانیت پەیوەندیان پێوەبکەیت .

تەقەوى نيا، ساتێك بە بێدەنگی سەیری کردم و ئاهێکی درێژی هەڵکێشا و گووتی: مەگەر ئیتر دەتوانم بنەماڵەیەکم هەبێت ، تائێستا نا .

گووتم : دەبینیت دونیای ئێمە چ جۆرە دونیایەکە، یا نەدەبوو هاتباین، یان کاتێك هاتین چ بتەوێ و نەتەوێ جگە لە مانەوە چارەیەکی تر نییە، وا بزانم ئێستا باش تێدەگەیت، بۆچی لەو هەموو یاریانەی طرابلس و ئەو لێکۆڵینەوانەی من لە تۆ و نعمانیم دەکرد، هیچ کارێکی ترم لەدەست نەدەهات، پێش من چایچی و ئەحمەدی، داوتر تۆ، لەوانەیە دوای تۆ کەسانی تر ، بەهەرحاڵ کاتێك سوپا کەوتە سەرپێ، لەوانەیە هێدی هێدی بتوانین لە بنەماڵەکانمان نزیك بینەوە .

هەر سی پارتیزانەکەی لیبیا، لە باغەکەی نادری جەهانبانی ئامادەبوون، هەموویان شاد و خۆشحاڵ بوون، زۆرێك لەوان لە ڕووداوەکانی چەند هەفتەی ڕابردوو، دوورخرابونەوە. ئەمەش هێواش هێواش توشی نائومێدی و دەردی سەری کردبوون ، ئەم کۆبونەوەیە، بە واتایی کۆتایهاتنی ئەو دەورەیە بوو.

چوار کازێری تەواو گفتوگۆمان کرد، نمونەی گاردی تایبەتی قەزافیمان هێنایە پێش چاو، هاوشێوەی ئەومان بنیاد نا ، ئەمە کارەکەی زیاتر خێرا کردین، هەموومان شارەزایی شێوازی کارکردنی ڕێکخراوەکان بووین، بۆیە پێویستی بە ڕاهێنان و پەروەردەکردن نەدەکرد. لەم کۆبونەوەیەدا، بە پێشنیاری هەموویان، من وەك فەرماندەی گشتی و ئەحمەدی و چایچی وەك جێگرانی سوپا هەڵبژێراین .

لەگەڵ ئەوەشدا، هەریەکێکیان لە سەرۆکایەتی یەکەیەکی بنەڕەتی سوپا دانران، دەستەی کارگێڕی ناوەندی فەرماندەیمان دامەزراند .

دەستبەجێ ٢٦ کەسی ترمان بۆ فەرماندەیی چالاکی دەم ودەست دانا و هەڵبژاردنی ئەندامانی سوپا و ڕاهێنان و پەروەردەکردنیانی ئەوانیان لە ئەستۆدا بوو ، هەروەها بڕیاردرا بەلایەنی کەمەوە دەبێت هەر یەکەیەکی فریاکەوتنی ٢٥ کەسی، فەرماندەیەکیان بۆ دابنرێت .

گفتوگۆکانی دواتر زیاتر لەبارەی چۆنیەتی بەدەستهێنان و دابینکردنی جۆری کەرەستەو ئامێرەکانی جەنگ و ڕووبەڕوو بونەوەی پارتیزانی بوو ، لەبارەی هەموو ئەمانە قسەکراو بڕیاردرا .

لەکۆتایدا هەر کەسێك و سەد هەزار تومانی پێدرا ، هەروەها بڕیار درا، هەمان باغی حاجی نادری جەهانبانی و کەمپی مەنزەریە وەك سەربازگەی سەرەکی بۆ ئەنجامدانی ئۆپراسیۆن و حەوت شوقەی دەست بەسەردا گیراو، لە بینای سامان و دوانزە شوقەی بینای ISP ، دوو بینا کۆمەڵگای ئێران بۆ نیشتەجێ، بە ناونیشانی خانووی تیمەکانی ئاسایش، بەو مەرجەی لە ئایندەدا تاپۆبکرێت لەسەر پاتیزانەکان سودیان لێوەر بگرین . چایچی گووتەنی : سوپای بێ چەکدار ئامادە بوو بۆ خزمەتکردن .

دەبوو بە شێوەیەکی خێرا، نزیکەی سێ تا چوار هەزار کەس دابمەزرێنین و ڕاهێنانیان پێبکەین، هەتا ڕێبەری شۆڕشی ئیسلامی لەهەموو لایەکەوە خەیاڵی ئاسودەبێت .

هەر لەهەمان جێگەدا ـ بۆ یەکەمین جار پەیوەندیم بەو ژمارەوەکرد کە خومەینی پێ ی دابووم ، هەواڵی ئامادەکاری سوپاکەم پێ ڕاگەیاند، بڕیار بوو چاپچی دەستبەجێ ئەو بەرنامەیەی بۆ پاراستنی جێگای حەوانەوە نوێ یەکەی خومەینی و پارێزگاری لە خودی ئیمام، لە قوتابخانەی عەلەوی دابڕێژابوو، بۆ پێداچونەوەی کۆتایی، ببات بۆ لای خومەینی. هەرکە خومەینی گوێ ی لەم قسانەبوو، دەنگی وادەهاتە بەر گوێ کە خوشحاڵە، پێش ئەوەی کۆتایی بە پەیوەندیە تەلەفۆنیەکە بهێنم گووتی : پێش ڕۆشتنت بۆ قوم و ئەسفەهان، دەبێت کۆبونەوەیەك بکەین، هەتا لەبارەی پارێزگاری و دابینکردنی ئاسایشی تەواو بۆ ماڵەکەی لە قوم کە هەرچی زووترە دەگوازینەوە بۆ ئەوێ مەبەستێك بە من بڵێ .

بەو داواکاریانەی لەگەڵیدا باسمکرد، بەو هەستە پڕ جۆش و خرۆشەی کۆبونەوەکەی کەرەج هیوایەکی ترم بۆ دروست بوو .

ڕۆشتم بۆ ماڵەکەی دوریان، هەتا پێش کاژێر ٨ ی ئێوارە کە لەو کاژێرەدا لەماڵەکەی کۆبونەوەهەبوو لە ڕووداوەکان ئاگاداری بکەمەوە ، وابزانم من و دوریان پێکەوە گەیشتبووین، هەر مرج و مۆن بوو.

خۆشحاڵ بوو، لە بەرەو پێش چوونی کارەکانم، زیاتر لە دە جار داوای کرد وشە بە وشەی ئەو قسانەی خومەینی و سەید ئەحمەد، بۆیان کردبووم بۆی دووبارە بکەمەوە ، هەستم کرد ئەو ڕووداوەی هاتووەتە پێش، دوریانی زۆر دلگران کردوە. نەمن دەمتوانی پەی پێ ببەم، نە ئەویش ئامادەبوو بەهیچ جۆرێك لەو بارەیەوە قسەبکات ، لە ناکامدا سەر و سیمای میوانەکان

پەیدابوو بڕیار بوو ئەو شەوە دوای ئەوەی بەتەنها ماینەوە، درێژە بە گفتوگۆکانمان بدەین .

کۆبونەوەکەی ئەو شەوە، هاوشێوەی کۆبونەوەکانی هۆتێل مریدینی پاریس نەبوو. بەتایبەتی لەداوی ڕووداوەکانی نوفل لوشاتۆی پاریس، ئامادەبوونی کۆلۆنێل تامسۆن بۆ یەکەمین جار لە کۆبونەوەکانی ئێران دەیتوانی مانایەکی تایبەتی هەبێت .

دوو گروپی دیاریکراو، لە دوو میللەتی جیاواز لە بەرامبەر یەکدا دانیشتین، ( ولیام سالیڤان ، کۆلۆنێل ئیدواد تامسۆن ، ژەنراڵ گێست ، کۆلۆنێل بەیکەر ، دوریان مەکگرەی ) لایەنێکی کۆبونەوەکە بوون ( من ، سەید ئەحمەد خومەینی ، دکتۆر مصطفی چەمران ، دکتۆر یەزدی ، صادقی قطب زادە ، ئازەری قومی ، دکتۆر ئایات ، ئایەتولا بەهەشتی ) لایەنەکەی تربووین .

بە پێچەوانەی کۆبوونەوەکانی تر، ئەو شەوە دوریان جل و بەرگی ئیسلامی نە پۆشی بوو، بە ماکیاژێکی شەوانە ئامادە بوو. لە کاتێکدا سێ کەس لە ئەندامانی کۆبوونەوەکە، مێزەر بەسەر و جبە و عەبا پۆش بوون .

یەزدی و چەمران و قطب زادە، بە نۆبەت قسەکانیان وەردەگێڕا، سەرەتایی کۆبوونەوەکە، بەو گرفتاریە چاوەڕواننەکراوەنەی هاتبوونە پێش دەستی پێکرد ، بە کەم و زیادکردنی لیستی ناوی ئەو کەسانەی دەبوو لە سێدارە بدرێن کۆبوونەوەکە بە کۆتا هات .

دکتۆر ئایات و ئایەتولا بەهەشتی ڕاسپێردران، بە دەستگیرکردنی وەزیر و پارێزەر و بەشێوەیەکی گشتی کەسانی نا نیزامی

ئەمریکیەکان، بە بیانوی پاراستنی سوپای هەڵوەشاوەکەی شا، پێداگیریان لەسەر ئەوە دەکرد، کە دەبێت هەرچی زووترە فەرماندەکانی سوپا لە سێدارە بدرێن .

کۆڵۆنێل تامسۆن زۆر بەڕاشکاوانە گووتی : هەموو ئەو گرفتانەی ئێستا شۆڕش ڕووبەڕووی بومتەوە، لەبەرئەوەیە، لەهەمان چەند ڕۆژی سەرەتادا، کار بە لیستی ناوی داواکراوەکانی پاریس نەکراوە، لە ئێستادا زۆرێك لەوان هەڵهاتوون، هەرچۆنێك بێت لەم لایەنەوەیە مەترسی سەرەکی بۆ سەر ڕژێمی نوێ

کاژێر ١١ ی شەو کۆبونەوەکە بەرەو کۆتایی دەچوو، ژەنراڵ گێست لیستێکی نوێ ی دابە ئایەتولا بەهەشتی، ناوی زیاتر لە ٦٤٣ کەس لە فەرماندەکانی سوپای شاهنشاهی تێدابوو ، ئەم لیستە، ناوی ئەوکەسانەی تێدابوو کە دەبوو دەستبەجێ دەستگیر بکرێن و دوای دادگایکردنیان لەسێدارە بدرێن ، ئەم لیستە لەهەمان کۆبوونەوەدا دابەشکران، بەشێکی درا بەمن، هەتا بە هاوکاری پارتیزانەکانم لەماوەی سێ ڕۆژدا دەستگیریان بکەم .

هێشتا ئەو کاغەزەم لاماوە، ئەو ناوانە دەتوانرێت بە ئینگلیزی و فارسی بخوێنرێتەوە .

((لیواء پەرویز ئەمین ئەفشار ، لیواء معتمیدی فەرماندەی تیپی زرێپۆشی قەزوین ، عمید مەلەك ، عمید هەمەدانیان ، فریق فەخر مودەریس ، فریق نەوزەری بەقا ، عمید ئایات محقق ، عمید ئەمجەدی ، عمید فەتحی مقدم ، لیواء خواجە نوری ، فریق هاشمی برنجیان ، عقید شەهریار لە هێزی دەریایی ، فریقی یەکەم طوفانیان ، لیواء مەنوچهری ، عمید محمد

شەهنام ، عمید شەماعی فەرماندەی نیزامی جەهروم ، عمید ئازادی ، عقید سەلامی ، عمید عین القطات ، لیواء زەندی کەریمی ، عەقید مسعود زمانی ، لیواء خەڵوەتی ، لیواء کاظم خزاعی ، عقید کەمانگەر ، عقید ئیبراهیم هوشەنگی ، عقید غەرەویی ، عقید یاسایی ، لیواء سەوداگەر ، عقید کەریمیان ئازەر ، فریق ناصر موقەدەم ، فریق ئیرەج موقەدەم ، عقید جەهانبینی ، فریقی یەکەم ڕەضا عظیمی ، فریق محسن هاشم نەژاد ، کمال الدین حبیب اللهی فەرماندەی هێزی دەریایی ، فریق محسن زادە کرمانی ، فریق هاشم نجفی نژاد ، فریق هاشم حوجەت ، فریق موسا ڕەحیمی لاریجانی ، فریق ناصر فیروزمەند ، فریق ئەبوالحسن سعادت مند ، فریق وەشمگیر ، فریق جعفر صانعی ، فریق محەمەد کاظمی ، فریق سیاوش بهزادی ، فریق نصرت الله فردوست ، فریق حسێن جەهانبانی ، فریق جلال پژمان ، فریق حبیب نعمتی ، فریق ئەمیر فەرهەنگ خلعتبری ، فریق جمال الدین تسلیم تووەکولی ، فریق عەلیمحەمەد خواجە نوری ، فریق ڕەضا مەهدی ئەردستانی ، فریق پەرویز صفایی نیلی ، فریق محمد ڕەضا وحدانی ، فریق ڕەضا پەروانە ، فریق محەمەد ڕەحیمی ئابکناری ، فریق جەواد معتضد ، فریق ئەبوالفتح ئەردەلأن لە هێزی دەریایی ، فریق عبدالعلی نجیمی نائینی ، فریق هوشەنگ حاتەم ، فریق خەلیل بخش ئازەر ، لیواء حەمید جەهانبانی ، لیواء عەلی ئەکبەر دهپناه ، لیواء محەمەد حسێن شهیر مطلق ، لیواء عەلی ڕەضا ثابت ئازەر ، لیواء محەمەد گۆران ، لیواء مرتضی فکور ، لیواء صادق حریری ، لیواء هورمز مقصودی ، لیواء حسێنعلی علمیە ، لیواء عەلی بەیات ، لیواءحەمید داوران ، لیواء منوچهر فەوزی ، لیواء محەمەد حسێن میر موجی ، لیواء کاظم نجفی نژاد ، لیواء حبیب الله ثمری

کرمانی ، لیواء مەحمود ماهرویان ، لیواء حسێن عظیمی ، ، لیواء خلیل شجاعی ، لیواء حیدەر وەفا ، عمید فضل الله ئەفشار ، عمید محەمەد ساوجی ، عمید عبدالله عصر جدید ، عمید هوشەنگ فیلسوفی گەیلانی ، عمید پەرویز ئەمینیان ، عمید منصور ئەمیر ئەردەلان ، عمید حسێن فەرجی فەر، عمید سولخانیان، عمید ڕەضا کاظمی ، عمید ئەردەشیر شەکیب، عمید محەمەد حسێن ڕیاضی ، عمید هادی قائمی ، عمید عطا الله نامدار عراقی ، عمید مصطفی کەریمی ئەفشار ، عمید ئیرەج مسترشد ، عمید عزت الله ئازمودە ، عمید محمد جلالی )) ئەمانە ئەو ناوانە بوون کە درا بەمن بۆ ئەوەی لەگەڵ پارتیزانەکانم دەستگیریان بکەین و ڕادەستی مەهدەوی کێنیان بکەین، هەتا بەگووتەی، کۆلۆنێل تامسۆن شۆڕشی ئیسلامی لەمەترسی دور بکەوێتەوە، لەهەموو زیان پێگەشتنێك پارێزراوبێت.

بۆ دەستگیرکردنی ئەوانی تر چەمران ئامادەیی خۆی دەربڕی، هەتا بەهاوکاری پارتیزانە ئێرانی و لبنانی و فلسطینییەکان و گروپی ئەمەل ئەم کارە ئەنجام بدات .

ئەو ماوە دورو درێژەی بەسەر ئاشنایەتی من و دوریاندا تێپەڕی بوو، ئەمە یەکەمین و دواهەمین کۆبوونەوە بوو دوریان بە بێدەنگی و ئارامی دابنیشێت و تەنانەت یەك ووشەش نەڵێت .

هەرکە میوانەکان ڕۆشتن دوریان وەك هەمیشە خۆی ڕووتکردەوە، هەتا بچێت بۆ حەمام. بە ئاوازێکی پڕ لە غەم و خەفەتەوە گووتی : خەریکە دەگەینە کۆتایی، ئەم سلیڤانە گەمژیە ئێرانی لێبووە بە لاوس و فلیپین،

لەوكاتەدا جنێوی بە ئەرز و ئاسمان دەدا و دواتر خۆی كرد بە حەمامدا ، كاتێك هاتەدەرەوە ڕووت و قوت بوو، تەنها خاولیەكی لەسەری پێچابوو، بە بتڵێك ویسكی و دوو پەرداخی پڕ لە سەهۆڵ، هاتە ژووری نوستنەكەو دەستبەجێ هێرشمان بۆ یەك برد .

گووتی : سەیركە جەعفەر، ئەگەرچی خودی خۆم تاوانبارم لە بەدیهێنانی ئەم دۆخە ، بەلاَم ئێستا تۆ وەك پیاوێكی بكوژ و خوێنڕێژ و بێ بەزەیی لەناو شۆڕشی ئیسلامیدا ناسێنراویت، لەهەموو لایەك قسە لەسەر ئەوەیە، وەك ناو خواردنەوە سەر لەلاشە جیادەكەیتەوە، من ئەسڵەن حەزم لێی نییە، لەهەر جێگایەكدا قسە لەبارەی دزی و پیاوكوشتن بكرێت، تۆ یەكەمین ناو بیت لە زهنیاندا ئێستا گرفتاریەكانی خۆم كەم نین، ئەو پڕۆپاگەندە خراپەی تۆشی بێتە سەر .

لەوكاتەدا قسەكانم بە سوێند و قورئان خواردن، بەتام و چێژ كرد و گووتم : تۆ زیاد لەهەر كەسێكی تر من باش دەناسیت، دەزانیت نیوەی ئەوەی كە ئێستا لە قوتابخانەی عەلەوی لەسەر زمانە، درۆ و هەڵبەستراوە ، هەر ئەمڕۆ لە قوتابخانە، یەكێك لە پارتیزانە موجاهیدەكان پرسیاری لێكرم گووتی ؛ ئێوە تا ئێستا لە ڕفاندنی چەند فڕۆكەدا بەشداریتان كردووە ؟. هەرچی گووتم لەهیچ، بەرامبەرەكەم باوەڕی نەكرد ، بەلاَم نازانم، ئەگەر بەرنامەی پێشوو تێك نەچوو بێت، بڕیار وابوو لەم هەراوهۆسەدا، بۆ چاوترسێنی دەوروبەرەكەم بێت، ئەمە پێشنیاری خۆت بوو .

دوریان بەبێ ئەوەی ئاماژە بە بابەتێك بكات گووتی : ئێستا ئەم سلیڤانە گەمژەیە خەریكە هەموو بەرنامە و پلانەكان دەشێوێنێت .

گووتم : سەیركە دوریان لەدوێنێ شەوە وە ئاگادارم بارودۆخت گۆڕاوە، هیچ كارێكم لەدەست نایەت و سەر لەم جۆرە كارانەش دەرناكەم ، بەڵام هەرچونێك بێت حەزدەكەم، كە تۆ دڵگران و بێزار نەبێت، بزانە هەركارێك لەدەستم بێت و تۆ بتەوێت ئەنجامی دەدەم. لەوكاتەدا دوریان بە خەندەیەكی ناچاریەوە، هاتەپێشەوە بۆئەوەی ڕوخسارم ماچ بكات، گووتی : تۆ ئەم دكتۆر بەهەشتی یان خۆتان گوتەنی، ئایەتولا بەهەشتی لەكوێ و چۆن دەیناسیت ؟

گووتم : بەهەشتی ئەسفەهانیە و هاوسەرێكی ئەسفەهانیشی هەیە، لە بنەماڵەی ئیمامیەكانە ، بەڵام ئاشنایی من لەگەڵ ئەو لە میوانداری باغەكەی حاجی ترابی دەریچەیی پێشتر بابەتەكەم بۆ باسكردویت دەستی پێكرد ، ئەڵبەتە نەك بەم شێوەیەی كە ئێستا هەیە ، چونكە ئەوكاتە ئەو دكتۆر بەهەشتی بوو، منیش كوڕە قەصابێك، نەدەكرا پەیوندیەكەمان لەوە زیاتر تێپەڕێت .

لەوكاتەدا، دوریان لەسەر سیسەمەكە، ڕاكشا و سەری خستە سەر سینەم و گووتی : ئەمە تۆ ، بەڵام من ئایەتولاكەی ئێوە ئەوكاتە ناسیم تەنانەت تۆ هێشتا نەهاتبوویتە دونیاوە، ئەو سەردەمە من بۆ كاركردن لە دامەزراوەیی

چوار ئەصڵی ترومان[18] (Point Four Program) هاتبوومە ئێران، تەنها شانزە ساڵ دەبووم کارم سکرتێرەیی بوو .

ڤارن سەرۆکی دامەزراوەیی چوار ئەصڵی ترومان بوو، لەگەڵ ئەوەی شانزە ساڵان بۆ دامەزراندن نەدەگونجاو لەڕووی یاساوە ڕێگە پێدراو نەبوو ، بەڵام ڤارن ئەو کارەی ئەنجامداو منی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ ئێران، زۆرێك لە کەسە ناسراوەکانی ڕژێمی شا ئەوکاتە کارمەندی چوار ئەصڵی ترومان بوون.

ئەم بەهەشتیەش ئەو سەردەمە هێشتا نەبوو بوو بە ئاخوند، چاکەت و پانتۆڵی لەبەردەکرد و زۆر جوانێش پێی دەکەوت، بەناوی کارمەندی ناوەندی پلەنزم لەژێر چاودێری غەفوور ئالبا کاری دەکرد.

ئەگەر بڵێم، بە ئاگاداربوون لەو زانیاری یە کەمەی من، هەروەها ئەو جیاوازی تەمەنەی لەگەڵ دوریان هەمبوو، ئەوەی بۆی باسدەکرم باوەڕبکەن وەك چیرۆك و ئەفسانە وابوو لەلام . من نەمدەزانی چوار ئەصڵی ترومان چییە و نەمدەتوانی زۆرێك لەو ناوانەی دەیگووتن بەباشی

دەریانبرم، لەوکاتە تەنها بابەتێك بۆم گرنگ بوو، ئەوە بوو ژنێکی خاوەن نفوزی وەك دوریان کە هەموویان ڕێزیان بۆ دادەنا و تەنانەت لێشی دەترسان ، ئێستا مەحرەمانەترین ڕازەکانی بۆ من دەگێڕێتەوە .

---

[18] (Point Four Program) ئاماژەیەکە بە گوتەیەکی هاری ترومانی سەرۆکی پێشوو ئەمریکا لە گوتارێکیدا لە ساڵی ١٩٤٩ ترومان گووتی ؛ وولاتە دەوڵەمەندەکان بەرپرسیارێتییەکە ئەخلاقیان لەسەرە بۆ یارمەتیدانی وولاتە هەژارەکان دواتر ئەم گووتەیەیی ترومان شێوەیی ڕێکخراوەیی وەرگرت. وەرگێڕ

ئەم ناوانە و ئەم یادەوەریانە لەدوای چەند جارێك دووبارەبوونەوە لە بۆنە جیاوازەکاندا، لەبیروهۆشی مندا مانەوە، وە ئێستا خاوەنی ئەزموونم و بەناچاریش هەندێ وانەم خوێندووە، تازە تێدەگەم نەخوێندەواری و بێ زانیاری چ دەردێکە و خوێندەواری و زانیاریش چ مصیبەتێك !.

هاوکات دوریان درێژەی بە قسەکانی دەدا، لەنێوان خواردنەوە یەك لەدوای یەکەکانی نهێنیەکانی دەدرکاند

دواتر دوریان درێژە پێدا و ووتی : ئەو ڕۆژانە واتە ئەو ساڵانەی، دکتۆر مصدق سەرۆك وەزیران بوو، من لە ئێران بووم، ئەم بەڕێز ئایەتوڵا بەهەشتی یە، خۆتان گووتەنی بەیەك دڵ نا بە سەد دڵ عاشقی من بوو بوو ، هەرکات منیش هەوڵی لێك نزیك بوونەوەی ئەوم بدایە، غەفوور ئەلبا دەهات و هێندە باسی بێ نرخی و گێلی و خەڵەفاوی و کەم ئاوەزی ئەوی بۆ دەکردم، کە بەڕاستی دڵم لە هەموو پیاوێك دەبێزرا . لەو سەردەمەوە، هەتا ئێستا ئێمە هێندە لە حاڵ و ڕۆژی بەهەشتی بێ هەواڵ نەبووین، ئێستا ئەم پێشەکیەی بۆم باسکردیت دواتر بە دۆسیەی پەیوەندی من و ئەو کۆتایی پێ دێت . باش گوێیەکانت بکەرەوە، سەیرکە چ خەون و خەیاڵێکیان بۆ ئەم کابرا و وولاتەکەی تۆ بینیوە، من و تۆ چۆن دەتوانین ڕێگری لە بەدیهاتنی ئەم خەون و خەیاڵانە بکەین .

جارێکی ترغافلگیر بووم، تازە تێدەگەیشتم ئەو پێشەکی باسکردنە بۆ زمینە خۆشکردن بوو بۆ بابەتێکی تر، جیا لە چیرۆك گووتن .

دوریان وەك من لەجێگا هەستا و لەسەر سیسەمەکە لەتەنیشتم دانیشت و گووتی : دوێنێ شەو سلیڤان ، هەمان ئەو پیاوە سەرسپیە کە باڵوێزی

ئەمریکایە، لە کۆبونەوەکەدا تلگرافێکی خستەڕوو بەفەرمانی پلە بالآکانی DC ، دەبێت من جێگاکەم لە حەرەمسەرایی خومەینیەوە بگوازمەوە بۆ حەرەمسەرایی بەهەشتی ، چونکە بەزووی بەڕیوەبەری کاروباری وولآتەکەی ئێوە بەهەشتی دەبێت نەك خومەینی ، ئەڵبەتە لەماوەی چەند ڕۆژی ڕابردوودا، ئەم بابەتە بووە هۆی ناکۆکی و جیاوازی ڕا و بۆچوون، لەنێوان من و جەنابی باڵێۆز ، بەڕواڵەت ئەو سەرکەوت، هەرجۆرێك بێت ئەو گەمژانەی DC ڕەزامەندیان لەسەر نەخشە و پێشنیارەکانی دەربڕیوە، ئەوان بەداوی ئەسقۆفێکی ماکاریۆسی[19] نوێوەن بۆ وولآتەکەی تۆ .

گووتم : باشە چ جیاوازیەکی هەیە بۆ تۆ ئەم بێت یان ئەو ؟

لەوکاتەدا دوریان دیسان ڕاکشا و گووتی : بە بۆچوونی DC خومەینی تەنها گەمژەیەکی مەزهەبی دەمارگیرە، پێچەوانەکەی، بەهەشتی بلیمەت و زیرەکە ، ئەم بیر و فکرە لە مێشکە سەقەتەکەی سالیڤانەوە دەرچووە ، ئەگەر ئەم قسەیەش ڕاست بێت کەوا نییە، بۆ ئەم کارە زۆر زووە ، تازە لەوەها گۆڕانکاریەکدا، دووبارە بەریتانیەکان پێماندا هەڵدەشاخێن، ئەمەش بەمانایی فاتیحە خوێندنی شۆڕش دێت .

گووتم : بۆچی DC لەبارودۆخەکە ئاگادار ناکەیتەوە ؟

---

[19] میخائیل خریستۆدلۆ مۆسکۆس ناسراو بە ئەسقۆف ماکاریۆس لەدایك بووی ٣ ی ئاب ی ساڵی ١٩١٣ ز مەتران و پێشەوای کڵێسای ارتدۆکسی قبرص ، یەکەمین سەرۆك کۆماری قبرص بۆ دووخول لە ساڵی ١٩٦٠ - ١٩٧٤ خول دووەم لە ١٩٧٤ بۆ مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٧ ، دواتر لەئەنجامی کودەتایەك لەلایەن (نیکۆس سامپسۆن ) لەسەر کار لادرا. لەهەمان ساڵدا ماکاریۆس بەهۆی جەڵتەی دڵەوە کۆچی دوایکرد. وەرگێڕ

دوریان گووتی : لەبەر خاتری ڕازێك ، چونكە ساڵانێكە ڕووداوێكم بە سودی بەهەشتی لە DC شاردۆتەوە، ئێستا ئەگەر بمەوێت بەیانی بكەم باوەڕم پێناكەن .

گووتم باوەڕبكە سەرم لێی دەرناچێت، بۆ دەبێت تۆ نهێنیەك بە قازانجی بەهەشتی لە DC بشاریتەوە، تازە ئەوە چ شتێكە هەتا ئەوان باوەڕنەكەن ؟

دوریان گووتی : لەوەی بە سودی بەهەشتی كارم كردووە، ڕازێكی تایبەتی و كەسی یە ، بەڵام ئەوەی DC نایزانێت ئەمەیە ، ئەم بەڕێز دكتۆر بەهەشتیە، ئەوكاتەی مەلا و پێشنوێژی مزگەوتی هامبۆرگ بوو، لە ڕێگای ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە، لەگەڵ كۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی لە پەیوەندیدابوو ، ئێستا وەها كەسێك چۆن دەتوانێت جێگایی خومەینی بگرێتەوە، ئەمەش ناچێت بەگوێ ی ئەواندا

تێگەیشتی كێشەكە لەكوێدایە و بۆچی لە دوێنێ شەوە وە هەتا ئێستا من وەك شێتم لێهاتووە .

گووتم : ئێستا بیركەرەوە، بۆ ئەوەی چارەسەرێك بۆ كێشەكە بدۆزینەوە دەتوانین چی بكەین .

دوریان گووتی: نیازم وایە لەخۆمەوە دەست بدەمە كارێك و DC لەبەرامبەر ئەنجامدەری كارەكە ئاگادار بكەمەوە و ..... قسەكەم پێبڕی و گووتم : واتە كوشتنی بەهەشتی ؟

دوریان پێكەنی و گووتی : ئەرێ ، بەڵام نەك بەدەستی تۆ، خەیاڵت ئاسودەبێت، بەدەستی بەیكەر ، كۆڵۆنێل بەیكەر .

گووتم: واته ئایەتولایەکی ئێرانی بەدەستی کۆلۆنێلێکی ئەمریکی بکوژرێت؟

گووتی : ئافەرین واته لەناوچوونی بەهەشتی و پەیوەندیەکەی لەگەڵ ئەمریکا بۆ هەتا هەتایە و مانەوەی خومەینی بۆ هەمیشە !

گووتم : ئائارامی تۆ تەنها بۆ وەها بڕیارێکی سادەیە ؟

وادەهاتە پێش چاو، دوریان بە دەربڕینی دەردەدڵەکانی کەمێك ئارام بووەتەوە، یان لەوانەشە ئەو هەموو ویسکی یە ئارامی کردبێتەوە .

گووتی : بڕیار نەبوو زۆر پرسیار بکەیت ! ئێستا بخەوە ئەم ڕۆژانە زیاتر لە هەموو شتێك پێویستمان بە پشووە هەم تۆ و هەم من. هەتا ڕۆشتم بۆ تەوالێت و هاتمەوە، دوریان خەوی لێکەوت منیش لەدوای ماوەیەك بیرکردنەوە، لەوەی بیستبووم ناچار خەوم لێکەوت ، بەڵام نازانم چ کاتێك و کەی بوو کە بەدەنگی هەنیسکی گریانی دوریان لەخەو ڕاچڵەکام، لەوەی دوریان بتوانێت بگری، ئەویش بەدەنگی بەرز، گەورەترین پرسیار بوو لەدوای لەخەو هەستانم، ئەو ژنەی بە بەهێز و بیر تیژ و خاوەن نفوز دەهاتە بەرچاوم، ئێستا وەك منداڵێك کەرەستەی یاریکردنەکانی لێ ون بووبێت دەگری، باوەشم پێداکرد و لەوکاتەدا دەستم دەهێنا بە پرچەکانیدا و دڵ نەوایم کرد، وەك کەسێك چاوەڕێبێت، سەریم خستە سەر سینەم، دەنگی هەنیسکی گریانەکانی تا دەهات بەرزتر دەبویەوە، لە ئاکامدا ئەوەندە دڵنەوایم کرد، هەتا تۆزێك ئارام بوویەوە ، داوای لێکردم پەرداخێك شەرابی بۆ بهێنم، ئەوکاتەی بە پەرداخێك ویسکی پڕ لە سەهۆڵەوە لە چێشتخانەکە گەڕامەوە، دوریان خەریك بوو فرمێسکەکانی دەسڕی، بە چاوی ئاوساو

سورەوە نیگایەکی مهرەبانانەی کرد و گووتی : جەعفەر تۆ زۆر باشی، داوای لێبوردن دەکەم خەبەرم کردیتەوە .

ماچم کرد و گووتم: بەلاّم گریانی ژنێکی بەهێزی وەك تۆ، لەهەموو شتێکی ئەم دونیایەی سەرسوڕهێنەرترە بۆم، دوریان و گریان، واتە ئەوشتەی لە خەویشدا وێنایم نەدەکرد .

دوریان تازە خەریك بوو دەگەڕایەوە باری ئاسایی خۆی، کەچی دیسان دەستی کردەوە بە گریان، لەنێوان گریان فرمێسك و هاوارکردن گووتی : جەعفەر ........ جەعفەر ...... تۆ نازانیت ... بەهەشتی باوکی کچە حەڤدە ساڵانەکەی منە .. ! ... کاترین ...... کاترینی من .

بێ هیچ گومانێك، لەوکاتەدا چەکوژێکی هەزار کیلۆیان بکێشایە بەسەرمدا، خۆڕاگرتنەکەی ئاسترِ لەوەبوو، دوریان بڵێت کچێکی حەڤدە ساڵانی لە ئایەتولاّ بەهەشتی هەیە ، تەنانەت ئیترِ بابەتی زیندومانی یان نەمانی بەهەشتی گرنگ نەبوو بۆم، بابەتەکە ئەوە بوو چۆن چۆنی جێگری پێغەمبەر، ئایەتولاّیەك، ئەویش ئایەتولاّ بەهەشتی، لەگەڵ ژنێکی ئەمریکی سیخوڕی کاریەتی لە پەیوەندیدابووە، چۆن چۆنی خاوەنی منداڵێکە و ئێستا حەڤدە ساڵیەتی ؟ !.

دیسان دوریانم لەباوەش گرت و لاواندمەوە، ئەویش بێ ئەوەی من پرسیارێکم کردبێت، زاری کردەوە و گووتی : ئێستا ..... ئێستا هەست بە کێشەکەی من دەکەیت؟ تێدەگەیت بۆچی ڕاپۆرتی پەیوەندیەکەی بەهەشتی لەگەڵ ڕۆژهەلاّتیەکانم نەداوە بە DC ؟ ئێستا بیرکەرەوە لەناوچونی بەهەشتی بەدەستی بەیکەر، واتە کوژرانی باوکی کچەکەم ، لەناو

ئەبردنیشی، واتە هەڵەیەکی گەورە و مێژوویی بۆ وولاتەکەم، ئەو نیشتمانەی لە پانزە ساڵیەوە خۆمم فیدایکردووە .

گووتم : سەیرکە من ئەسڵەن ناتوانم زۆر لەڕووداوەکانی ئەم مەسەلەیە تێبگەم ، چۆن ئاخر چۆن چۆنی ژنێکی وەك دوریان دەتوانێت پەیوەندی عاشقانەی لەگەڵ ئایەتولایەکدا هەبێت ئەویش حەفدە، هەژدە ساڵ لەمەوبەر .

دوریان گووتی : ئەم ڕووداوە لە فرانکفۆرت ڕوویدا ، ئەوکاتە من گرفتاریەکی ژنانەم هەبوو دکتۆرەکان ئامۆژگاریان دەکردم بەدڵنیایەوە دەبێت منداڵێکم ببێت، هەموو شتێك بەڕێکەوت بوو ئەوکات من لە سەربازگەی ئەمریکیەکان لە ڤیسبادن، پانزە شانزە کیلۆمەتر نزیك فرانکفۆرت کارم

دەکرد ، بەهەشتی لە هامبۆرگەوە هاتبوو بۆ فرانکفۆرت، دوای چەندین ساڵ لە فرۆشگایەکی بەناوبانگی ئەڵمانیا، بە ڕێکەوت یەکترمان بینی، ئەو چەند ڕۆژێك لە فرانکفۆت مایەوە، دیسان هەمان عەشق و عاشقی ساڵی ١٩٥١ سەری هەڵدایەوە. لە ئاکامدا عەشقەکەمان بە خەوتن لەگەڵ یەك دەستی پێکرد. دوو مانگ دواتر دوگیان بووم، تەلەفۆنم بۆ بەهەشتی کرد و هەواڵەکەم پێدا ، ئەویش زۆر خۆشحاڵ بوو. گووتی، مناڵەکە بپارێزم، دوای ئەوە بەردەوام دەهات بۆ فرانکفۆرت ، دواتر من لەبەر بارگرانی دوگیانیەکەم، ڕۆشتم بۆ ئەمریکا، ئەویش هات و مۆڵەتی دا سود لە نازناوی بەهەشتی وەربگرم بۆ کاترین، لەدوای ئەوە ئەگەرچی هەموو بەرپرسیاریەتیەکانی کاترین لە ئەستۆی من بوو ، بەلام جارجارێك

بەهەشتی هەندێ پارەی بۆ دەنارد ، ئەمە هەمووو بەسەرهاتەکەبوو، ئێستا ئەگەر دەست لە حەسودی ڕۆژهەلاّتیانەت هەلّدەگریت، چارەسەرێك بۆ کێشەکە بدۆزەرەوە نەك لەوەی بزانیت چۆن چۆنی من و ئەو پێکەوە نوستوین .

ئەم قسەی کۆتایی، بە ئاوازێکی تورەیی یەوە دەربڕی، من جارێکی تر نغرۆ بووم لە سەرسوڕماوی کە چۆن ئەو تەنانەت دەتوانێت بیری مرۆڤەکان لە پشتەوە بخوێنێتەوە .

گووتم : لەگەلّ ئەو ڕووداوەدا، من وابیر دەکەمەوە باشترە قسە لەگەلّ خودی بەهەشتی بکەیت و بەجۆرێك پێی بلّێت واز لە سیاسەت بهێنێت، ئەگەرنا تۆش ڕازەکەی ئاشکرا دەکەیت .

لەو کاتەدا دوریان دوای هەنیسکی گریانەکانی، دیسان وەك جاران دای لە قاقای پێکەنین و گووتی : ئەگەر ئەویش وەك تۆ باش و سادە دەبوو، لەوانەیە ئەمە ڕێگەچارە بوایە ، بەلاّم ئەو ئایەتولاّیەی کە من دەیناسم، ئێستا لەدوای تەمەنێك بە ئارەزووەکەی گەیشتووە، مەحالّە دەست لە سیاسەت هەلّگرێت، ئەگەر وەها شتێك بلّێم فەرمانی کوشتنی خۆم کە هیچ لەوانەیە فەرمانی کوشتنی کچەکەشم بە تۆ یان ئەبو شەریف بدات .

گووتم : ئەگەر دیسان بە قسەکانم پێناکەنیت، ڕێگەچارەیەکی تر ماوە ئەویش ئەومیە هەستیت و بڕۆیت بۆ ئەمریکا، سەرەتا هەولّ بدەیت DC ڕازی بکەیت، پێشئەوەی هەر بڕیارێکی تر بدەیت

لەوکاتەدا چاوەکانی دوریان گەشانەوە و لە جێگای خۆی هەستا و ماچی کردم و گووتی : براڤۆ ..... جعفر ! ... ئەگەر خەیاڵم لەبابەت ئێرەوە ئاسودەبێت، یان لەوەی لە ئامادەنەبوونی من، سالیڤان لێرە نەبێت، تەنانەت ئەگەر لە ئەمریکاش بێت دەتوانم زۆر کار ئەنجام بدەم، ئەم بیرەی تۆ بە ئەنجامدانی بەسودتر و زۆر باشتر دەبێت ، بەمەرجێك بەڵێن بدەیت تۆش لەگەڵم بێیت .

گووتم : بینینی ئەمریکا بۆ من وەك ئارەزوویەك وایە، بەڵام بیری لێبکەرەوە، لەگەڵ کارەکانی ڕێکخستنی سوپای ضربت و ئەو هەموو مرۆڤە نالەبارانەی لەڕیزدا وەستاون و بۆ هەلێك دەگەڕێن دەکرێت ئێرە بەجێبهێڵرێت ؟.

دووریان گووتی : تۆ وابیر دەکەیتەوە دەمانەوێت بۆ سەفەرێکی یەك مانگە بڕۆین ، زۆرە زۆرەکەی دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ، دواتر لێرە دەبین، ئەمەش دەکرێت بەجۆرێك بەرنامە ڕێژی بۆ بکرێت، جگە لە دوو سێ کەس، کەسی تر ئاگادار نەبێت .

گووتم : مادام وایە دەبێت من سەفەرەکەم بۆ قوم پێشبخەم، بەتایبەتی خومەینی گووتویەتی دەمەوێت بگوازمەوە بۆ قوم، داوای لەمن کرد بیر لە لایەنی ئاسایشی جێگای مانەوەکەی بکەم .

دوریان گووتی : ئەمەش یەکێکە لەهەڵەکانی ئەم پیرە پیاوە، کە بەهاندانی بەهەشتی و باڵوێز سلیڤان خەریکە ئەنجامی دەدات، واتە دروست ئەوکارەی کە نابێت ئەنجامی بدات، خەریکە ئەنجامی دەدات، قسەش ناچێت بە گوێیدا.

گووتم: مەگەر تۆ لەم بارەیەوە قسەت لەگەڵدا کردووە ؟

گووتی : نەك یەکجار، دوو سێ جار ، لەدوای ئەو چاوپێکەوتنەی کیانوەری، کە هیچ ڕوون نەبوو بۆچی چوار کازێری خایاند، بەو پیرە پیاوەم گووت هیچ بە قازانج نیە، ئێوە ئێستا بڕۆن بۆ قوم ، دەیگووت، ئەگەر ئێوەش لە جێگای من بوونایە، بەو جۆرە لەوێ دەرکرابان، بە دڵنیایەوە دڵتان وای دەخواست بەم شێوەیە بگەڕێنەوە .

کازێر پێنج و سی خولەکی بەیانی، هەردووکمان بە ماندوێتی و شەکەتی بەو هیوایەی لە سبەینێ وە ئەو لە ئەندێشەی ئامادەکاری سەفەر بۆ ئەمریکا و منیش لەخەیاڵی ڕۆشتن بۆ قوم، وە هەردوکمان لە بیری دواخستنی گوێزانەوە سیاسیەکەی خومەینی لە تەهرانەوە بۆ قوم خەومان لێکەوت .

هێشتا لەماڵ دەرنەچوو بووین، صادقی قطب زادە تەلەفۆنی کرد، نزیکەی سی خولەك لەگەڵ دوریان گفتوگۆی کرد. دواتر بەمنی گووت : لەلایەن شورای شۆرش داواکراویت، ئەمشەو دەبێت لەوێ بیت ئاگادار بە خۆت بەکەم نەزانیت، قورس و بەهێز لەبەرامبەریان ڕاوەستە. مەلاکان و من و بنی صدر لە پشتی تۆین، دار و دەستەی چاکەت و پانتۆڵ لەپێ و دەسرۆکە لە ملەکانی مەهدی بازرگان لە دژی تۆن .

پێم گووت: لەم بارەوە خەیاڵت ئاسودە بێت ، بەلام ئایا ئیمام ئاگایان لەم بانگهێشتە هەیە؟

قطب زادە گووتی: هێشتا نا، شورای شۆڕش دەڵێت، پێویست ناکات بۆ هەموو کارێك پەیوەندی بە ئیمامەوە بکەین ، بەلام من پێش نیوەڕۆ چاوم بە خومەینی دەکەوێت، لە بابەتەکە ئاگاداری دەکەمەوە .

گووتم: خەریکم دەچم بۆ سوپا، دڵم دەخوازێت ڕۆژێك ئێوەش بێن و قسەیان بۆ بکەن .

قطب زادە خۆشحاڵ بوو بە پێشنیارەکەم، گووتی : ئیمام خەیاڵی وایە خۆی ووتار بدات بۆ سوپاکەی تۆ. بەمنی گوتووە بۆ تۆمارکرن و پەخشکردنی قسەکانی ئامادەکاری بکەم، بەلام لەبارەی ڕێکەوتەکەیەوە هیچی نەگووتوە، کەواتە ووتاردانەکەی من لێگەڕێ بۆ دوای ووتارەکەی خومەینی .

بەکورتی بابەتەکەم بۆ دوریان گێڕایەوە و بەسەر سوڕمانیەوە گووتی : لەسەر ئەم بابەتی ووتاردانەی قطب زادە پێشتر بیرت لێکردۆتەوە .

گووتم : نا بۆچی ؟

گووتی من سەرمنجم داوە، هەندێ کات تۆ بەبێ ئەوەی پێشتر بیرت کردبێتەوە، قسانێك دەکەیت کاتێك کە من بەباشی بیریان لێدەکەمەوە، سەیردەکەم باشتر لەوە بوونی نیە، ئەمەش نیشانی دەدات ئەگەر خوێندنت تەواو بکردایە هیچت لە بلیمەتێك کەمتر نەبوو .

گووتم : تۆ وابیر دەکەیتەوە، ئەگەر من خوێندنم تەواو بکردایە ئەصڵەن پەلێشی ئەم ڕێگایانە دەکرام .

دیسان دوریان پێکەنی و پرسی، لەبارەی شورای شۆڕشەوە مەگەر خومەینی قسەی لەگەڵ نەرکردبووی ؟

گووتم: بۆچی، بەلاّم، گووتی باکەس نەزانێت. بۆ وابیردەکەیتەوە دەبوایە بایەتەکەم بە قطب زادە گوتبایە .

دووریان گووتی: کەم کەم بیر و هۆشی نازەنیت خەریکە دەکەوێتەکار، لەبیرت بێت زۆر بەهێز و باوەڕ بەخۆبوونەوە لەبەرامبەر شورای شۆڕش ڕادەوەستیت، ئەمە بکە بە بەرنامە بۆ خۆت بێ دەنگ دابنیشە، هەرکە قسەکانیان تەواو کرد، تۆش لەجێگای خۆت هەستە و بڵێ وەلاّمی ئەم قسانە دەدەم بە حەزرەتی ئیمام، وە دواتریش وەرە دەرەوە. هەروەها ، ئەگەر ئەو ئەسەدولاّ موبەشیریە لەوێ بوو قسەی کرد، ئەگەر هەلت بۆ ڕەخسا هەر لەوێدا، ئەگەریش نەڕەخسا لەدەرەوە تەلەفۆنێك بۆ ئەندازیار مەهدی بازرگان بکە، بڵێ حەزدەکەم بە ئامادەبوونی بەڕێزتان، لەگەڵ موبەشیری سەیری فیلمێکی شۆڕش بکەن.

گووتم : لەو جۆرە فیلمانە ؟

دیسان دوریان دای لە قاقایی پێکەنین و گووتی : فیلمەکەی سەید جلالی تەهرانی لەچاو ئەمدا خەلاّتی ڕەوشت بەرزی و داوێنپاکی وەردەگرێت .

لەماڵ دەرچووین و دوریانم گەیاندە قوتابخانەی عەلەوی ، ئیمام کۆبونەوەی هەبوو، خۆم نیشانی دا و بەخێرایی بەرەو باغی جەهانبانی کەوتمەڕێ .

یەك بەیەکی برادەران ئاستی خوێندەواری و بڕوانامەکانیان لەمن بەرزتر بوو، زۆر بە گەرم و گوڕی سەرگەرمی کار و بەرنامەڕێژی بوون، بەهاتنی

من   پەیوەندیەکانی سوپا لەگەڵ یەکەکانی شۆڕش ڕێکخران، توانیمان زۆرێك لە پێداویستیە گرنگەکانی وەك؛ پێداویستی فێرکاری سەربازگە و چەکی ڕاهێنان و تەواوی ئەو پێداویستیانەی کە گرنگ بوون بۆ دەسپێکی کارەکانمان وە دەستبخەین ، لێرەدا بابەتێکی سەرەنج ڕاکێش هەبوو، کە هەموومان سەرمان لێ ی سوڕمابوو، ئەویش ئەوە بوو پەیوەندیمان بەهەر جێگایەکەوە دەکرد، بۆ دابینکردنی کەرەستەکانمان وەڵامی نەخێرمان وەرنەدەگرت ، ئەمەش دەریدەخست، نهێنی بوونی ئەم کارە تەنها قسەیە، خومەینی پێش هەمووان فەرمانی هاوکاری کردنی ئێمەی بە هەموو ناوەندەکانی تری شۆڕش داوە .

کاژێر ٢ ی دوای نیوەڕۆ، سەید ئەحمەد ، دواتر قطب زادە تەلەفۆنیانکرد، دوای ئامادەبوونم لە شورای شۆڕش، دەبێت بچم بۆ دیدەنی ئیمام ، کاژێرێك دواتر لە ناوەندی سوپاوە تەلەفۆنێکیان بۆ کردین ، گوتیان بەڕێز شەفیع زادە چ کات دەچن بۆ قم و ئەسفەهان هەتا هێلکۆپتەریان بۆ ئامادەبکرێت ؟

چایچی گووتەنی، هێندە سوپا بۆ ئەوانی تر بوونی هەبوو، بۆ خودی خۆمان هێشتا لەپلەی سەرەتایی تێنەپەڕی بوو .

بە برادەرانم گووت : وای بەباش دەزانم، لەکاتی دیدارەکەم لەگەڵ خومەینی، پێ ی بڵێم بۆ ڕێنوێنی مەزهەبی و ئاینی پارتیزانەکان، پێویستیمان بە ئایەتوڵایەکی ڕۆشنبیر و گەنج هەیە بۆ سوپا ، وابیردەکەمەوە بەم جۆرە دڵنیایەتی و ئاسایشیەکی زۆر دەدەین بە ئیمام .

برادەران هەموویان ڕازی بوون ، من لە دڵی خۆمدا گووتم : ئەڵبەتە دوای وەرگرتنی ڕا و بۆچوونی دوریان ئەم کارە دەکەم ، بەڵام نەك هەمان ڕۆژ .

کاژێر ٦ ی ئێواره، ڕۆشتم بەدەم بانگێشت کردنەکەی شورای شۆڕش، لەگەڵ ئەو سیناریۆیەی پێشتر بۆیان داڕشتبوو، بەشداریم لە لێپرسینەوەکەی شورا کرد.

بازرگان لەبارەی ئەو توندوتیژیانەی لەلایەن پارتیزانەکانی منەوە ئەنجام دەدرێت دوا، ئامازەی بە ڕووداوی خانووەکەی جەهانبانی کرد و گووتی: توندوتیژی پارتیزانەکانم، هەموو کۆمەڵگای خستۆتە ترس و دڵەڕاوکێ، ئەم بابەتەش بە زیان لەسەر شۆڕش دەشکێتەوە. بە قازانجی هیچ لایەك نییە، توندوتیژی هەتا ئەم ڕادەیە بە ئاشکرا ئەنجام بدرێت .

نزیکەی بیست خولەك قسەیکرد، دواتر داوای لێکردم ڕوونکردنەوە لەسەر قسەکانی بدەم، لەوکاتەدا منیش لە جێگای خۆم هەستام و گووتم : فەرمایشتەکەی ئێوەم گوێ لێبوو ، وەڵامەکەی دەدەمەوە بە حەزرەتی ئیمام ، چونکە یەکەکانی ژێر چاودێری من، تەنها لەبەرامبەر ئیمام بەرپرسیارن ، هیوادارم ئەم بەرێزانە قسەکانم بە بێ ئەدەبی و بێ ڕێزی لێك نەدەنەوە .

بێ ئەوەی چاوەڕێ ی وەڵامێك یان بۆچونێکی نوێ بم، لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە و بەپەلە ڕۆشتم بۆ دیدار لەگەڵ خومەینی .

سەید ئەحمەد لە پەنای خومەینی دانیشتبوو، هەرکە چاوی بەمن کەوت، هاتەلام و گووتی : ئیمامم تێگەیاند کە زۆر نایاب بویت و چاك لە گۆڕیان هاتی ، بەڵام بچۆ بۆ جێگای حەوانەوەی خاتوو دوریان مەکگرەی، کاری گرنگی پێتانە، لەبابەت ئیمامەوە خەیاڵت ئاسودەبێت، هەتا نیو کاژێری تر لەدەست ئەندامانی سوپا ڕزگاری نابێت. هەواڵی وەڵامدانەوەکەی من لەبەرامبەر بازرگان و شورای شۆڕش، پێش خۆم گەیشتبووە ئەوێش .

دوریان ئاگاداری کردمەوە کە خومەینی زۆر ڕازیە لێت و ئاگات لەخوت بێت، لەبەرامبەری زۆر لەخۆبایی نەبیت، تەنها بڵێ فەرماندەکەیت بەسەرچاو .

بە دوریانم گووت : دەمەوێت پێشنیار بکەم بۆ ئیمام، حوجەت ئیسلامێکی گەنج بۆ ڕێنوێنی پارتیزانەکان دابەمەزرێنێت، ڕای تۆ چی یە ؟

لەوکاتەدا دوریان لە ژێر عەبا نوێژەکەیەوە، پێکەنی و گووتی : لەکۆتایدا تۆش لەزمانی ئیمام تێگەیشتی، تەنانەت یەك چرکەش چاوەڕێ مەکە، باشتر لەمە نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا مۆڵەتی لێوەرگرە هەتا بەزووی بچیت بۆ قوم ، چونکە هاوڕێ کۆنەکانت سەرگەرمی کارێکن، وادێتە پێش چاو ترسناك و زۆریش ترسناك بێت .

پرسم : دەتوانیت پێم بڵێت چی ڕوویداوە ؟

دوریان گووتی : ئەگەر بمزانیایە ئەمدەگووت زووتر برۆ.

گووتم : چیت کرد بۆ ڕۆشتنەکەی ئەمریکا ؟

گووتی : خەریکم ! هەرکات کارەکەت تەواو بوو، بمێنەوە هەتا پێکەوە بڕۆین ، کاژێرێك دواتر خومەینی ناردی بە دوامدا، لەبارەی ڕووداوەکەی شورای شۆڕش پرسیاری لێکردم، هەمووی ئەوەی ڕوویدابوو بۆم باسکرد .

خومەینی ڕەزامەندی خۆی دەربڕی و گووتی : فەرمانم دەرکردووە، هەرکاتێك ویستت بۆ جێگایەك بڕۆیت، هێلکۆپتەر لە خزمەتتدا بێت، بە دامەزراوەیی ( مستضعفین )م گووتوە ئەو کەرستانەی ئەمڕۆ پێویستیت

پێ ی هەبووە، بیهێننە خزمەتت ، لە بیرت بێت چەند ڕۆژێکی تر دوعایی تەلەفۆنت بۆ دەکات و چەند پرسیارێکی لەبارەی لیبیاوە هەیە، وەلآمی ڕاستەوخۆی نادەیتەوە .

دەستیم ماچکردوو مۆڵەتم لێخواست بۆ سەفەرەکەم، پێشنیاری دەستنیشانکردنی ئایەتولآیەکم بۆ کرد، هەتا ڕێنوێنی مەزهەبی ئەندامانی سوپا بکات. بۆ یەکەمینجار دەستی گرتم و گووتی : خۆشم لەوەها بیرێکدابووم ، خوت بیری لێبکەرەوە، بزانە کێ گونجاوە کە زۆر وشك نەبێت، منیش بیری لێدەکەمەوە، کاتێك گەڕایتەوە لەبارەیەوە دەدوێین .

بەمجۆرە بە پێچەوانەی شەوی ڕابردوو، من و دوریان لەدوای ڕۆژێکی پڕ لە سەرکەوتن، شەوشادمان لەیەك کردو زۆر زوو خەوتین، هەتا سبەی ئەو بچێت بۆ ماڵی خومەینی و منیش بۆ قوم ، کاتێك سواری هێلکۆپتەری سوپا بووم، هەتا بەرەو قوم بچم، بە کارەکانی ڕۆژگار پێ دەکەنیم و دیسان کەوتمە بیری ئەو کوڕە قەصابە قەدریجانیە کە لەدوای تێپەڕبوونی دووساڵ، لە قەصابیەوە بە چ جێگایەك گەیشتووە، بە هێلکۆپتەر لەملا بۆ ئەولا دەچێت .

لە قوم لەلایەن هەندێ ڕۆحانی و هەندێ لە سەرۆکی ناوەندەکانی تری شۆڕش، پێشوازی کرام. ڕاستەوخۆ چووم بۆ دیداری سەید مەهدی هاشمی ، سەید مەهدی بە جۆرێك پێشوازی لێکردم خۆشم باوەڕم نەدەکرد، سەرم لەم جۆرە پێشوازیە سوڕمابوو ، بەلآم من دڵم وای دەخواست هەرچی زووتر بەتەنیا بمێنینەوە و باس لە دەردە دڵە تایبەتیەکانی خۆمان بکەین.

ئەم هەلەش هەتا دوو کاژێری تر نەهاتە پێش، لە ئاکامدا بەتەنها ماینەوە و گووتی : بەوەی کە دەمانەویت بگەین گەیشتین، ئێستا مەملەکەت لە ژێر دەستی خۆماندایە، هەموو ئەو بەڵێنانەی بە بەڕێز جەعفەری خۆمان دابوو، چ ئەوکاتەی ئازاد بووین، چ ئەوکاتەی لە زیندان بووین، موو بە موو دانە بەدانە بەجێم هێنا، ئێستا تەنها یەك پرسیام هەیە ، ئایا تا ئێستاش بەڕێز جەعفەر، یار و هاوکار و دۆستی منە یان نا ؟

هەستام و ماچمکردوو بەو شێوازەی دوو ساڵ لەمەوبەر لە خۆمدا شکم دەبرد، زیاتر هاوشێوەی ڕەفتاری ئەو داوی نیوەڕۆ گەرمەی قەدریجان، بەهەمان شەرم و ئەدەبی کوڕە قەصابێك، کە سەید مەهدی هاشمی پاڵەوانەکەی بوو.

گووتم : من دار و نەدارم، هەموو تواناو پلەوپایەکەم، لەسایەی سەری ئێوەدایە، لەماوەی ئەم دووساڵەدا ڕۆژێك نەبووە سوپاسی ئەم سۆز و موحیبەتانەم نەکردبێت، کاتێك هەواڵی دەستگیرکردنی ئێوەم بیست، دەمویست لە دیمەشق هەڵبێم، بۆ ڕزگاریتان گیانم فیدابکەم ، بەڵام گووتیان ئێوە ڕازی نین، سەید مەهدی هاشمی نەیهێشت قسەکانم تەواو بکەم

لەوکاتەدا بە خۆشحاڵیەکی زۆرەوە، هاتە پێشەوە بۆ ئەوەی نێو چاوانم ماچ بکات، گووتی : هەموو ئەمانە دەزانم، بۆیە ئەو پرسیارەشم کرد، لەبەر ئەوە بوو هەتا پەیمانەکەمان نوێ کردبێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانین ئاسودەتر لەبارەی بەرنامەکانی ئایندەوە بدوێین .

گووتم : تەنانەت بۆ ساتێکیش، ئێوە گومانتان لە نۆکەری و بچوکی من نەبێت .

لەدوای پێشەکیەکی دوور و درێژ، لەناکامدا سەید مەهدی گەیشتە سەر بابەتە سەرەکیەکەو گووتی : هەر جۆرێك بێت، دووساڵ لەمەوبەر گەیشتن بە وەها دۆخێك خەون و خەیاڵ بوو بۆمان ، ئێستاش دەمەویت بڵێم، ئەم بارودۆخە زۆری بەسەردا تێناپەڕێت، ڕابەری سیاسی ئێران من دەبم و ڕابەری مەزهەبیش حەزرەتی ئایەتولاّ منتظری دەبێت، لەبەر ئەوە لەم بارودۆخەی هاتومتە پێش سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە، کەسانی وەك ئێمە بوون لە کۆنەوە تۆوی ئەم شۆڕشەیان چاندووە، دەبێت وەك ئەڵقەی زنجیر پێکەوە ببەسترێینەوە و بەرنامەو پلانەکانمان بەجۆرێك هەماهەنگ بکەین، هەتا لەکاتی گونجاودا بەو ئامانجانەی خۆمان مەبەستمانە بگەین ، ئێستا بارودۆخەکە زۆر تێکەڵە و شێواوە بەسەریەکدا، دارودەستەی جەبهەی میللی، مجاهیدین ، فیدایەکان و کۆمەنیستەکان و تودەیەکان لایەکی چەرچەفەکە ڕادەکێشن و خودی باڵە جیاوازەکانی ڕۆحانیەتیش لایەکەتری

من لە ئەبەردیەکانی ئێوە، چ لێرە و چ لە لیبیا و سوریا ئاگادارم و پشتت پێدەبەستم ، پشت بەستنەکەش لەهەموو ڕوویەکەوەیە ، هەندێك لە مەلاکان سەد ڕەوت و باڵن وەك طالقانی ، وەك شێخ عەلی ئەکبەر هاشمی ڕەفسەنجانی ، وەك مفتح، ئەمانە هەریەکەیان گروپێکن ، ئەم گروپانەش هاوسۆز نین لەگەڵ ئێمەدا ، خودی خومەینی ڕازیە لەسەر دورخستنەوە و سڕکردنی طالقانی ، بەلاّم لەسەر ئەوانی تر نا ، بۆیە پلانی من لەناوبردنی ئەوانی ترە، بەتایبەتی شێخ عەلی ئەکبەری کۆسە .

دەمزانی مەبەستی سەید مەهدی هاشمی چیە ، لەوکاتەدا ئەو قسەی دەکرد و منیش لەدڵی خۆمدا دەمگووت : من کەڕۆشتم بۆ سوریا و لیبیا هەتا

دەورەی پارتیزانی ببینم بۆ ڕەمی کردنی ئەفسەرە سوریەکان یان دزیکردن لە مۆزەخانەی ئێرانی دێربن نەبوو ، ئەم هەموو پارە و هێزمیی ئەم پیاوە پێی بەخشیوم، بەگاڵتە و لە خۆڕانەبووە. ئێستا مافی خۆیەتی سود لەو سەرمایە گوزرایە دووساڵەیەی کە کردوویەتی وەربگرێت، مافی سەید مەهدی هاشمی لەگەڵ هیچ کەسی تردا بەراورد ناکرێت.

هەر لەبەر ئەم بیرکردنەوەیە بوو، دەستبەجێ گووتم : من نۆکەری، ئێوەم بەتەنها ئامادەیەکی ئێوە وەك فەتوا وایە و یەك خولەك دوای ناخەم .

سەید مەهدی هاشمی لەم ئامادەبوونەی من، سەرپا لە خۆشحاڵیدا نغرۆ بوو. گووتی : کەواتە سەردانێکی حەزرەتی ئایەتوڵا منتظری بکە ، دواتریش بمێنەوە هەتا لەگەڵ شێخ محەمەد منتظری کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی ئەنجام بدەین .

ئەو ڕۆژە فەرمان لە لایەن خومەینیەوە هات، هەرچی زوورت سەفەرکەم بە کۆتا بهێنم و بگەڕێمەوە بۆ تەهران، بۆ ئەوەی فەرمانی دەستگیرکردنی دکتۆر میناچی جێ بەجێبکەم، بەڵام پێش گەڕانەوەم سەردانی ئایەتوڵا منتظری گەورەم کرد، دواتریش لەگەڵ سەید مەهدی هاشمی و شێخ محەمەد منتظری پەیمانی نوێمان بەست، هەتا بەناونیشانی قەدریجانیەکان، نەهێڵین سەری داوەکەمان لێ ون بێت و ڕێسەکەمان لێنەبێتەوە بە خووری ، لەبارەی ئەوەی هەر کێشەیەك هاتە سەر ڕێگامان بەفەرمانی سەید مەهدی هاشمی، بێ دوودڵی لەسەر ڕێگامان لایبدەین .

من ڕاسپێردرام، پارێزگاری له  هاوڕێیەتیم لەگەڵ دوریان مەکگرەی  و صادقی قطب زاده بکەم  ، هەروەها لەهەموو هەواڵەکانی پشت پەردەی شۆڕش، ئەوان ئاگادار بکەمەوە. هەرکاتێك کۆبونەوەکانی نێوان سەید مەهدی و هاشمی ڕەفسەنجانی نەگەیشتنە ئەنجام، بەیەك ئاماژە لە قومەوە هاشمی ڕەفسەنجانی سەرنگوم بکەم .

زۆر هەوڵمدا سەید مەهدی و شێخ محەمەد تێبگەیەنم، کە ناتوانرێت گاڵتە لەگەڵ دوریان مەکگرەی بکرێت ، چونکە ئەو وەها جێگای خۆی لە دڵی خومەینیدا کردۆتەوە، کە بەبێ پرس و ڕاوێژی ئەو ئامادەنییە دەست بۆ هیچ کارێك ببات ، بەڵام ئەوان هەمان بوهتان و دەنگۆیان دوبارە دەکردوە کە لەلایەن قطب زادە و سەلامەتیانەوە هەڵبەسترابوو، گوایە دوریان مارەبڕاوی سەید مستەفا خومەینی یە و دوای مردنی سەید مستەفا، خومەینی و بنەماڵەکەی هۆگری ئەو بوون، لەکاتێکدا من شاهیدم و ئاگادارم، ئەم بوهتان و دەنگۆیانە کە قطب زادە و سەلامەتیان هەڵیان بەستبوو، بە پێشنیاری خودی دوریان مەکگرە بوو، هەتا ئامادەبوون و مانەوەی لە تەنیشت خومەینی، لە نوفل لوشاتۆ دواتر لە ئێران جێگای سەرەنج بێت ، بەهەر حاڵ جێگای خۆیەتی ئەمەش لێرەدا باس بکەم، بە ماوەیەکی کەم لەدوای سەفەرەکەم بۆ قوم، دکتۆر مطهری و چەند مانگێك دواتر دکتۆر محەمەدی مفتح تیرۆر کران.

لەم ڕووداوانەشدا من هیچ ڕۆڵێکم نەبوو ، بەڵام ئەوەی کە بڵاوە و دەیڵێن گوایە گروپی فورقان کارەکەیان ئەنجامداوە، تا چەندە ڕاستە یان

هەڵبەستراوە من نازانم ! لەوە دڵنیام ئەگەر مطهری نەکوژرابا جێگری خومەینی دکتۆر مطهری دەبوو نەك شێخ حسێن منتظری .

بەفەرمانی سەید مەهدی هاشمی، بڕیار درا چالاکیەکی نابەکام ئەڵبەتە تەنها بەمەبەستی چاوترسێنی لە دژی هاشمی ڕەفسەنجانی ئەنجام بدەین. بۆ ماوەیەك ڕەفسەنجانیمان ڕەوانەی نەخۆشخانەکرد، ئەم پلانە هەر لەسەرەتادا بڕیابوو ناسەرکەوتوانە ئەنجام بدرێت ، هەموو ڕێگریەکانی ئەم پلانە لە کات و شوێنی خۆیدا بۆتا باسدەکەم .

هەر ئەم چالاکیە ناسەرکەوتووە، وای کرد هەر لەگەڵ دەرچوونی لە نەخۆشخانە، ڕەفسەنجانی بچێت بۆ قوم و دەستی شێخ حسێنعلی منتظری ماچ بکات .

لەکۆتا ساتەکاندا، دەمویست سواری هەیلکۆپتەرببم و بگەڕێمەوە بۆ تەهران، سەید مەهدی هاشمی جانتایەکی سامسۆنیتی پێدام، بە پێکەنینەوە گووتی : هەندێك شیرینی قومە و بۆ ئێوە دروستکراوە هیوادارم هەمیشە شیرینی بچەژیت .

هێلکۆپترەکە لە دوشان تەپە نیشتەوە، بەبێ دواکەوتن ڕۆشتم بۆ قوتابخانەی عەلەوی، بۆ دیدار لەگەڵ خومەینی، دوریان چاوەڕێ ی دەکردم، جانتا سامسۆنیتەکەم پێدا. چوم بۆ بینینی ئیمام هەندێ لە مەلاکانی شورا کۆبونەومیان هەبوو لەگەڵیدا، تەنها نامەلایی ناویان دکتۆر ئایات بوو ، خومەینی زۆر تورەو نائارام بوو، بەئاماژەی دەستی مۆڵەتی دا لە گۆشەیەکی ژوورەکە دانیشم ، قسە لەسەر ناکۆکیەکانی نێوان ئەندامانی دەوڵەتەکەی بازرگان بوو، نەزان کاری وەزیرەکانی و سەرپێچی کردنی

هەندێك لەوان لەگەڵ ڕۆحانیەت، هەر زوو تێگەیشتم لەڕاستیدا دكتۆر معین فەڕ سیخوڕی ئاخوندكانە لە كابینەكەی ئەندازیار بازرگاندا، ئەمە ئەوە، كە هەواڵەكانی ئەولا بۆ ئەمان دەهێنێت و ئەوان تووڕە دەكات.

كاتێك من گەیشتم دكتۆر ئایات خەریك بوو مەبەستێكی دەگەیاند، لەو ماوەیەدا زانیاری زۆرم دەست كەوت ، كاتێك قسەكانی دكتۆر ئایات تەواو بوو، خومەینی سەیری منی كرد و گووتی : ئەگەر ئەم دكتۆر میناچی یە، بكەوێتە زیندانەوە كاری ئەم بەڕێزانە چارەسەر دەبێت ، چونكە هەموویان وەڵامەكەیان ئەرێ بوو بەئامادەبوونی ئەوان ڕووی لەمن كرد و گووتی : چاوەڕووان بووم هەتا ئێوە بگەڕێنەوە، لەگەڵ بەڕێز دكتۆر ئایات قسەبكەن و ئامادەكاری بۆ خستنە زیندانی هەركەسێك كە ئەو دەیڵێت بكەن، هەركەسێك بە واتایی دكتۆر میناچی، ئەم كارەش لێگەڕێن بۆ سبەی بەیانی.

كاتێك هەموویان، جگە لە من و سەید ئەحمەد و شێخ مەلا شەهاب ئیشراقی ڕۆشتن، خومەینی ڕووی لەمن كرد و گووتی : هەرچیەكیان پێگوتیت، بڵێ بە سەید ئەحمەد، هەتا من خۆم دووبارە بە تۆ نەڵێمەوە كەس زیندانی ناكەیت .

ئێستا ئیتر نۆرەی ئیمام بوو، یەك لەدوای یەك بنێرێت بە شوێنمدا، هەر جارە و بەشێوەیەكی تازە غافلگیرم بكات .

خومەینی گووتی : بۆیە گووتم لە قوم بگەڕێیتەوە، هەتا سبەی لەگەڵ كوڕەكانی سوپا بێن بۆ ئێرە و كاژێر ١ ی دوای نیوەڕۆ قسەتان بۆ بكەم .

هێشتا ئۆتۆمبێلەکەم دانەگیرساندبوو، دووریان گووتی : مێشکی ئەم پیرە پیاوە وەك کۆمپیوتەر کاردەکات ، بەلآم ئەو کۆمپیوتەرەی تەنها بۆ پلان گێڕی، پرۆگرام سازی بۆ کرابێت ، تۆ بە هێلکۆپتەر دەنێرێت بۆ قوم، هێشتا نەگەیشتویت داوا دەکات بگەڕێیتەوە ، چونکە لەناکاو دەزانێت دەست پەروەردەی سەید مەهدی هاشمیت، بەهانەکەیشی دەستگیر کردنی ئەم دۆستەی خۆمان میناچی یە، کە بۆ وێنە وەزیری کابینە نویێ یەکەیە، ئەوکات دەردەکەوێت سبەینێ دەیەوێت سوپا ضربەتەکەی بەگژی ئەم و ئەودا بدات ، ئایات بەمجۆرە لە خۆی ڕازیدەکات و تۆش بەم جۆرە .

گووتم : مەبەستی لەم کارانە چی یە ؟

پێکەنی و گووتی : جێ پێ ی خۆی قایم دەکات ، هێشتاش باوەڕناکات ، ئێستا تۆ بڵێ لە قوم چی ڕوویداوە ؟ پلانگێڕیەکانی ئێوە بەکوێ گەیشت ! لەئاکامدا بڕیاردرا ڕەفسەنجانی و مطهری و مفتح بکوژن یان نا ؟ ، بڕیارە کەی یەکەمین هەواڵەکانی پەیوەندی دار بە من و قطب زادە و ئەوانی تر، بە سەید مەهدی هاشمی بدەیت ؟

ئەگەر دوریانم نەناسیبا و لەهێز و نفوزی ئەو ئاگادار نەبوومایە، باوەڕم بەوە دەکرد ئەم ئافرەتە لەشێوەی بونەوەرێکی نادیار، لەتەواوی ڕۆژی سەفەرەکەم بۆ قوم لەگەڵمدا بووە. گووتم : تۆ ئەمانە لەکوێ دەزانیت ؟

گووتی : هیچ نازانم، تەنها دەمەوێت لەناکاو شتێك بە مێشکی جەعفەری ئەزیزمدا نەیەت ، چونکە خۆی بە قەرزداری سەید مەهدی دەزانێت، ڕاستیەکانم لێبشارێتەوە .

ئەمجارە سەرەی من بوو پێبکەنم، پێش ئەوەی موو بە مووی بابەتەکانی سەفەرەکەمی بۆ بگێڕمەوە گووتم : تۆ تەنها کەسێکی ناتوانرێت، درۆت لەگەڵدا بکرێت !

دوریان گووتی : ئەم سەید مەهدیە بلیمەتە، بەرنامەڕێژیەکانی وورد بینی لەسەرکردووە، تەنها کەسێکە بیر لە ئەمڕۆ ناکاتەوە و ئایندەی لەپێش چاوە، هەر چونێك بێت هیوادارم داوای هەرچیەکی لێکردبیت، تەنانەت سیخوری کردن لەسەر منیش بووبێ ڕەزامەندیت دەبڕیبێت ، بەلآم لەڕاستیدا هیچ کارێك ئەنجام نەدمیت ، مەگەر تەنها ئەوەی کە بەسودی هەموو لایەك بێت .

کاتێك گەیشتینە ماڵەوە، زەنگی تەلەفۆن لێیدا، دووریان هەڵیگرت دوای چەند چرکەیەك بە ئینگلیزی شتێکی گووت و تەلەفۆنەکەی داخست. ڕووی لەمن کرد و گووتی : بەیکەر خەریکە بۆ ئێرە دێت وادیارە چەند دزێکی گرتووە .

بە پەشۆکاویەوە پرسیم : دز ؟

دوریان خەریك بوو بەرەو چێشتخانەکە دەڕۆشت، بە ئاوازێکی گاڵتە ئامێزەوە گووتی : عەرەبە دزەکان .

دواتر تکای لێکردم، بڕۆم دەرگا لە بەیکەر بکەمەوە، هەرچەندە بەیکەر کلیلی ماڵەکەی دوریانی پێ بوو ، بەلآم هەرکات من و دووریان لەماڵ بوینایە، سودی لە کلیل وەرنەدەگرت و زەنگی لێدەدا .

دوریان و بەیکەر نزیکەی سی خولەك پێکەوە بە ئینگلیزی قسەیان کرد، دواتر بەکورتی بۆی باسکردم ، پێش نیوەڕۆی ئەمڕۆ، کۆلۆنێل بەیکەر سەرنج دەدات دوو کەس بەسەر دیوارەکەدا نیازی هاتنە ژوورەوەیان هەیە، چاوەڕێ دەکات هەتا دێنە ژوورەوە ، چونکە پێشتر ئاگاداربووە کە ئەوان لەناو جیپێکدا دابەزیون، دەچێت بۆ لای جیپەکە، بە ترساندن ودەمانچە هەڵکێشان تاکە سەرنشینی ئۆتۆمبێلەکە دەستگیر دەکات و دەیبات بۆ ماڵەکەی خۆی، دەست و قاچی دەبەستێتەوە سودابە بەرێکەوت لەماڵی بەیکەر بووە، ڕایدەسپێرێت چاودێری دەست بەسەرەکە بکات، خۆیشی دەچێت بۆ ماڵی دووریان، ئەو دوو کەسەی خەریکی شکاندنی دەرگای چوونەژوورەوە دەبن، دەستگیریان دەکات و دەیانبات بۆ لای دەستبەسەرەکەی تر ، ئێستا ئەو سێ کەسە لەماڵی بەیکەرن. سودابە و سێ ئەمریکی تر چاودێریان دەکەن .

پرسیم : ئەوان ئەیان گووتوە ئامانجیان لەم کارە چی بووە ؟

دوریان گووتی : کێشەکە لەوەدایە، دووانیان عەرەبن ، سێیەمیان ئێرانیە تەنانەت ئامادەنییە یەك ووشە بڵێت .

گووتم : باشترین کار ئەوەیە ئەوان ڕادەستی برادەرانی سوپا بکەین، دوریان گفتوگۆیەکی کەمی لەگەڵ بەیکەر کرد و گووتی : بەیکەر دەڵێت هەتا خۆمان نەزانین ئەمانە چ کەسانێکن و ئامانجیان لەم کارە چی بووە، باش نییە ڕادەستی هیچ شوێنێکیان بکەین ، چونکە هەرچونێك بێت سەرۆکەکانیان دەکەونە کار و بێ ئەوەی هیچ شتێکمان دەست بکەوێت، لە چنگمان دەردەچن .

دوای ماوەیەك گفتوگۆ دووریان گووتی : کلیلی چارەسەری ئەم کێشەیە، لەدەستی قطب زادەیە هەم لەخۆمانە و هەم ئەندامی شورای شۆڕشە ، ئەمەی گووت و بەرەو تەلەفۆنەکە ڕۆشت .

یەك کاژێر دواتر قطب زادە گەیشت، دوای ئەوەی بەشێك لە ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، داوای لە من کرد پێنج کەس لە پارتیزانەکانم بانگ بکەم، هەتا دیدارمان لەگەڵ دەستگیرکراوەکاندا شێوازێکی فەرمی وەربگرێت ، کاژێر ٢ ی نیوەشەو نعمانی هاوڕێ لەگەڵ چوار کەسی تر گەیشتن، دواتر هەموومان پێکەوە ڕۆشتین بۆ خانووە دیوار بە دیوارەکەی ماڵی دوریان .

دوریان و قطب زادە هەر لە ڕوانینی سەرەتادا، هەرسێ دەستبەسەرەکەیان ناسییەوە ( بەڕێز هانی الحسن نوێنەری یاسر عەرەفات لە تەهران ، ئەبو ڕاشید فەرماندەی ستونی ضربەتی فلسطینیەکان لە تەهران لەگەڵ کوڕەکەی ئایەتولا طالقانی )

قطب زادە دەست بەجێ فەرمانی دا دەست و قاچی دەستبەسەرەکان بکەینەوە، لەوکاتەدا ئاماژەی بەهەڵە تێگەیشتنێك کرد، خۆی و نعمانی لەگەڵ دەستگیرکراوەکاندا لەژوورەکەدا مانەوە، داوای لەوانی ترمان کرد لە ژوورەکە بچینە دەرەوە، چونکە لە ئێستا بە دواوە شورای شۆڕش بەدواداچوون بۆ بابەتەکە دەکات .

ئەو چوار پاتیزانەی تر لەگەڵ نعمانی لەکەرەجەوە هاتبوون، لەماڵەکەی بەیکەر مانەوە و ئەوانی ترمان هاتین بۆ ماڵەکەی دوریان ، دوریان

خومەینی لە ڕووداوەکە ئاگادار کردەوە ، دواتر وەك ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت میوانداریمان لە دەستگیرکراوەکان کرد .

کاژێر پێنج و دە خولەکی بەیانی دزەکان بە جیپەکەی خۆیان ئەوێیان بەجێهێشت . نعمانی و چوار کەسەکەی تری سوپا، دوای دیدارێکی کورت لەگەڵ من، بەرەو کەرج گەڕانەوە. بۆئەوەی هەرچی زووتر کارەسەرەتاییەکانی ڕۆشتنی خومەینی بۆ قوم فەراهەم بکەن .

قطب زادە هات بۆ ماڵەکەی دوریان، نزیکەی بیست خولەك لەگەڵ ئەو و بەیکەر قسەی کرد ، یەکێك لە ئەمریکیەکان لەگەڵ سودابە ڕۆشتن بۆ خانووەکەی بەیکەر، لەکاتی گەڕانەوەدا شریتێکی ڤیدیۆییان دابە دوریان، وادیار بوو بە شێوەیەکی نهێنی لەسەر دزەکان تۆمارکرابێت، بەم جۆرە ئەو شەوە پڕ ڕووداوە، بێ ئەوەی هۆکاری ئازادکردنی دەستگیرکراوەکانم بۆ ڕوون بێتەوە بە کۆتا هات .

من و دوریان تەواوی شەو نەخەوتین، حەمامان کرد و لەسەر سفرەی نانی بەیانی دانیشتین . هەتا داوی نانخواردن هەریەکەمان بەلای کاری خۆیدا بڕوات ، دوریان باوەڕی وابوو، ئەگەرچی ناکرێت قطب زادە لەسەر ئازادکردنی ئەوان سەرزەنشت بکرێت ، بەڵام ئازاد کردنی ئەوان بەبێ ڕاوێژ لەگەڵ بەیکەر و دوریان کارێکی دروست نەبووە. قطب زادە بە دوریانی گووتبوو، هەموو شتێکی بۆ ڕوون بووەتەوە و هۆکاری ڕۆشتنیان بە شێوەیەکی نهێنی بۆ ماڵی ئەو دەزانێت. هەرکات لەگەڵ دوریان بەتەنها بوون بۆی باسدەکات .

گووتم : ئێستا کەی لەگەڵ قطب زادە دیدارت داناوە ؟

گووتی : ئەوکاتەی تۆ و پارتیزانەکانت لای خومەینی دەبن .

لەوکاتەدا دوریان دووبارە چای بۆ تێکردم و گووتی : هەستە کەمێك لەو شیرینەی قوم بهێنە، هەتا بە چای یەوە بیخۆین .

جانتا سامسۆنیتەکەی دوێنی سەید مەهدی هاشمی پێیدابووم کردمەوە و بەسەر سوڕمانیەکی زۆرەوە لە جێگای شیرینی لێوان لێو بوو لە دۆلاری سەوز .

دوریان ئاگای لە پێکەنینە نا ئاسایەکەی من بوو، سەیرێکی من و جانتاکەی کرد و لەوکاتەدا بزەیەکی کرد، گووتی : خودا دەزانێ سەید مەهدی لەکام دەوڵەمەندی هەڵهاتووی وەرگرتووە، دواتر لەناکاو بەپەلە سەرگەرمی وردبینی دۆلارەکان بوو، ماوەیەك ئەم دیوئەودیوی کردن و گووتی : ئەم دیاریەی هاوڕێی ئەزیزت سەید مەهدی هاشمی، نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار دەبێت ، هەندێکیان دۆلای ئەسڵن و ئەوانی تر ساختەن، ئێستاش کاتی جیاکردنەوەمان نیە، لێ ی گەڕێ بۆ شەو هەتا دواتر بزانین چ فێڵێکی تر لەکارەکەدا هەیە .

چای بێ شیرینیمان خوارد و لەماڵ چوینە دەرەوە ، ڕۆژێکی پڕ لە هەوڵ و کۆشش بوو، تەواوی ڕۆژەکە بە سەرگەرمی کۆکردنەوەی برادەران و هێنانیان بۆ قوتابخانەی عەلەوی و چاوەڕێکردنیان بەسەر برد . دوای وتارە درێژەکەی خومەینی، گەڕاینەوە بۆ کەرەج، هەتا گفتوگۆ لەبارەی قسەکانی یەوە بکەین .

کاژێر ١٠ ی شەو بەماندوێتی و شەکەتی گەڕامە ماڵەوە ، هێشتا دوریان نەهاتبوویەوە، ئەمەش هەلێك بوو هەتا بتوانم جارێکی تر سەیری جانتا سام سۆنیتەکەی سەید مەهدی هاشمی بکەم، بۆ ئەوەی دۆلارە ئەسڵی و ساختەکان بەراورد بکەم ، هەموو دۆلارەکان پەنجا ی و سەدی بوون و بەبۆچوونی من هەموویان هاوشێوەی یەك بوون، هیچ جیاوازیەکیان نەبوو ، بەلاَم دڵنیا بووم دوریان لەخۆڕا قسە ناکات. بیرم کردەوە سەید مەهدی چ مەبەستێکی هەبووە لە پێدانی ئەو هەموو پارەی ئەسڵی و ساختەیە ؟

پارەکانم هەموو لەسەر سیسەمەکە پەرش و بڵاو کردەوە، دوریان هاتە ژوورەوە و چەکێکی بانکی هەڵدایە سەریان و گووتی : ئەمە ئەسڵیە، بە دۆستەکانت بڵێ هێربن !

لەو کاتەدا ڕوخساریم ماچکردوو گووتم : لەکوێوە هاتووە ؟

دوریان دووبارە چەکەکەی هەلگرتەوە و ماچی کردوو دای لەقاقای پێکەنین، گووتی : سێ ملیۆن دۆلارە، حەزرەتی ئایەتۆلاَ العظما دکتۆر سەید محەمەدی بەهەشتی، بۆ کچە نازارەکەیان کاترین بەهەشتی لوتفیان فەرمووە .

پرسم : کەواتە بەرنامەی ڕۆشتن بۆ DC جۆربوو ؟

گووتی : بەڵێ ، بێ ئەوەی پێشنیارێکم کردبێت، حەزرەتی ئیمام فەرموویان، بەڕێز شەفیعزادە بۆ پاراستنتان بۆ ئەم سەفەرە هاوڕێیەتیتان دەکات .

گووتم : چ کاتێك دەڕۆین ؟

گووتی : هەرکاتێك پاسپۆرتەکەت ئامادە بوو .

گووتم : پاسپۆرتی من ئامادەیە .

پێکەنی و گووتی : پاسپۆرتێك کە مۆری هاتن و چوونی سوریا و لیبیای پێوە نەبێت ، بەهەرحاڵ تۆ کارت بەسەر ئەم کارانەوە نەبێت، هەوڵبدە بەشێوەیەك بەرنامە ڕێژی بکەیت، هەتا بۆ ئەم پێنج ڕۆژەی ئامادەنەبوونت لێرە، جگە لەو چوار کەسەی یاریدەدەرت، کەسی تر ئاگادار نەبێت. بۆ وێنە دەتەوێت بڕۆیت بۆ ئەسفەهان یان ..... نازانم ... بەهانەیەکی لەو جۆرە .

گووتم : بابەتەکە هانی الحسن و قطب زادە بەکوێ گەیشت ؟

گووتی : دور و درێژە ، بەڵام قطب زادە باش چووە بەگژیاندا، هانی الحسن ڕێك و ڕاست لە بەرامبەر کوڕەکەی طالقانی گووتویەتی، نوسینگەی فەتح هیچ بەرنامەڕێژیەکی پێش وەختی لەم بارەیەوە نەبووە ، هاوکاری لەگەڵ کوڕەکەی طالقانی، بەفەرمانی ئایەتوڵا طالقانی خۆی بووە .

گووتم : تۆ باوەڕ بەم قسانە دەکەیت ؟

دوریان پێکەنی و گووتی : نا ، بەڵام کاتێك بابەتی پەیوەندیەکی سیاسی لەگۆڕدا بێت، دەبێت باوەڕبکەیت .

کاژێرێك دواتر ماندوو شەکەت چوینە سەر سیسەمەکە، دوریان تەواوی کاتەکەی بۆ جیاکردنەوەی دۆلارە ئەصڵ و ساختەکان بەرێکرد. لە ئاکامدا گووتی : دروست پێنج سەد هەزار دۆلای ئەصڵییە و پێنج سەد هەزاری تر ساختەیە .

گووتم : ئێستا دەبێت چی بکەین ؟

دوریان گووتی : ئەصڵەکان لەگەڵ خۆمان دەبەینە دەرەوەی وولآت و ئەژمارێکی تایبەتت بۆ دەکەمەوە دەیخەینەسەری، ساختەکانیش لێرە بەجێدەهێڵن، هەتا دواتر تێبگەین هۆکاری ئەم ڕەفتارەیان چی بووە، لەوانەشە ئەسڵەن سەید مەهدی هاشمی ئاگادار نەبووبێت ، ئەگەر دەستێك لەپشت خستنە بازاڕی دۆلاری سەختە لەئارادابێت، ئەوکات بابەتەکە جۆرێکی تر دەبێت .

دوریان خەریك بوو باسی لە گرفتەکانی دۆلاری ساختە دەرکر بۆ ناوبازاڕ، هەستم دەکرد ئیتر ناتوانم پێڵوی چاوەکانم بکەمەوە خەوم لێکەوت .